**deeply** بەقوڵی، بە قوڵایی، بە کۆری، چونە ناو ناخەوە
بعمق، على نحو عميق، بتعمق

**,deep'freeze** *n* [C], *vt* بەستنی خێرا تانزمترین پلە، بەستێنەر، تەزێنەر، (شتێك) بەم شێوە ئەبەستێنێ، ئەتەزێنێ
تجميد سريع الى درجة حرارة منخفضة جدا، يجمد (شيئا) بهذه الطريقة

**,deep'rooted** *adj* رەگی قوڵ، تیغ داکەوتوو
عميق الجذور

**,deep**'seated *adj* چەسپاو، راگرتی
راسخ

**deepen** /di:pən/ *vt, vi* قووڵ دەبێ، قوڵی دەکا
يعمق

**deer** /dɪə(r)/ *vt, vi* مامز، بەزکوڵی، ئاهو، ئاسك (ناگۆرێ لە کۆدا)
غزال، آيل (لاتتغير في الجمع)

**deface** /dɪ'feɪs/ *vt* دەشێوێنرێت، زانیاری ئەشارێتەوە، لای‌ئەبات
يشوه، يطمس المعالم، يمحو

**defamation** /,defə'meɪʃn/ *n* [U] ناوزران، توانج لێدان، خەنجەر لێدان، تانە لێدان، حەیا بردن
قذف، تشهير، طعن

**defamatory** /dɪ'fæmətrɪ/ *adj* ناوزراندن، قسەی بۆ هەڵبەستن
تشهيري، مسيء للسمعة، إفترائي

**defame** /dɪ'feɪm/ *vt* توانجی تێنەگرێ، تانەی لێ دەدا، ناوی ئەزرێنێ، قسەی دوا ئەخا
يقذف، يطعن، يسيء الى السمعة، يفتري على

**default** /dɪ'fɔ:lt/ *vi* دوائەکەوێ، کەم تەرخەمی ئەکات، خۆ ئەدزێتەوە لە (ئامادەبوون لە دادگا یان دانەوەی قەرز)
يقصر، يهمل، يتخلف عن (حضور محاكمة أو دفع دين)

□ *n* [U] کەم و کوری، کەم تەرخەمی، دواکەوتن، ئامادەنەبوون، خۆدزینەوە
تقصير، إهمال، تخلف

*by ~* بەدواکەوتن یان ئامادەنەبوون
بالتخلف أو لعدم الحضور

*to win a case/ a game by ~* کێشەکە/ یاریەکە ئەباتەوە بە دواکەوتنی نەیارەکەی
يربح القضية / المباراة بسبب تخلف الخصم

*in ~ of* لەبەربەنەبوون یان ئامادەنەبوون
لعدم توفر أو حضور، نظرا لغياب (عدم وجود)

**defaulter** *n* [C] کەم تەرخەم لە کارکردندا (بەتایبەتی بۆ سەرباز)
المقصر في أداء واجبه (و بخاصة الجندي)

**defeat** /dɪ'fi:t/ *vt* ١. دەی بەزێنێ، ئەیباتەوە، دەیشکێنێ، بەسەریا زاڵ دەبێ
١. يغلب، يقهر، يفوز أو يتغلب على

٢. دائەمرکێنێ، سەرناکەوێ، *Our hopes were ~ed.* ئاواتەکانمان نەهاتە دی
٢. يحبط، يفشل، أحبطت آمالنا (منينا بالفشل)

□ *n* [C,U] هەرەس، شکست، رەڤین
إحباط، هزيمة

**defeatism** *n* [U] گیانی بەزیوی یان ترسنۆکی، رەڤۆکی
الروح الانهزامية أو التخاذلية

**defect** /'di:fekt/ *n* [C] خەوش، کەم و کوری، تێك چوون، لەکە، ناتەواوی
خلل، علة، عيب، نقص

*~s in a system of education* کەم و کوری لە یاسای پەروەردەو فێربوون
العيوب في نظام تربوي

□ /dɪ'fekt/ *vi* رەو ئەکات، پاش گەز دەبێ، رائەکا لە سەربازی
يهجر، يرتد، يفر من الجيش

**defection** /dɪ'fekʃn/ *n* [C,U] پاشگەز بوونەوە، هەڵهاتن هەڵگەرانەوە (بیروبۆچون)
ارتداد، ردة

**defective** /dɪ'fektɪv/ *adj* خەوش، خوشدار، شلۆق، کێمدار
(شيء) به خلل أو عيب

*mentally ~* کەم هۆشی یان کەم زەیینی
لديه خلل أو نقص عقلي

*~ verbs* فەرمانە ناتەواوەکان
الافعال الناقصة

**defence** /dɪ'fens/ *n* [C,U] ١. بەرگری، پاراستن ٢. شێتێك پارێزگاری لێ بکرێت وەك قەلا (بۆ نموونە) ٣. (یاسا) بەرەڤانی، بەرگری (لە تاوانبار) پارێزەری

بەرگریکردن

١. دفاع، حماية، وقاية، صيانة ٢. شيء يحمي أو يصون كحصن مثلا ٣. (قانون) دفاع (عن متهم)، محامي الدفاع

**defenceless** *adj* بێبەرگری، بێچەك، دەست بەتاڵی

عاجز عن الدفاع عن نفسه، اعزل

**defend** /dɪ'fend/ *vt* ١. بەرگری ئەكات، بەرەڤانی دكت، دەپارێزێت ٢. بەرگری لە (تاوانبار) دەكات

١. يحمي، يدافع عن، يصون، يقي ٢. يدافع عن، يترافع عن (متهم)

**defendant** /dɪ'fendənt/ *n* [C] تاوانبار کراوە، شكات لێ كراو، تۆمەتبارکراو

مدعى عليه، متهم

**defender** /dɪ'fendə(r)/ *n* [C] بەرگر (لە تۆپی پێدا) بەرەڤان، پاشمێر

حام، مدافع (كرة قدم)، لاعب دفاع

**defensible** /dɪ'fensəbl/ *adj* ئەتوانرێ بەرگری لێ بكرێ یان سەرفراز بكرێ، بەرڤانیار

قابل للدفاع عنه أو تبريره

**defensive** /dɪ'fensɪv/ *adj* بەرگری، پارێزەری

دفاعي، وقائي

□ *n on the ~* ئامادەیە بۆ بەرگری

متأهب أو متحفز للدفاع

[1]**defer** /dɪ'fɜ:(r)/ *vt* (-rr-) دوای ئەخات، پاش دئێخت، گیرو دكت، خاتر دەگرێت

يؤجل، يرجئ، يؤخر

*~red letter/telegram* نامەی دوا خراو

رسالة / برقية مؤجلة أو غير مستعجلة

**deferment** *n* [C,U] دواخستن، پاش گوێ خستن، ڤارملاندن، پاش ئێخستن

تأجيل، أرجاء، تأخير

[2]**defer** /dɪ'fɜ:(r)/ *vi* (-rr-) خۆئەدات بە دەستەوە، ئەكەوێتە ژێر ركێفی

يذعن ل، ينزل عند إرادة (تبجيلا)

*~ to one's elders/to sb's opinions* ئەكەوێتە ژێر ویستی ئەوانەی لە خۆی گەورەترن، بیروڕای كەسێكە كە، چڤین، خاتر گرتن

ينزل عند إرادة من هم اكبر منه / آراء شخص ما

**deference** /'defərəns/ *n* [U] مل كەچی، خۆبەدەستەوە دان، خاتر گرتن، ڕیز گرتن لە مامەڵەو هەڵسوكەوت

نزولا عند، تلبية ل، إذعان، مراعاة ل

*in ~ to the opinion of the court* مل كەچی، ئارەزووی دادگا

نزولا عند رأي / رغبة المحكمة

**deferential** /,defə'renʃl/ *adj* ڕێز گرتن لە ئارەزووەكانی خەڵكی، ڕێزگری، خاتر گری

مراع، أو محترم لرغبات الاخرين

**defiance** /dɪ'faɪəns/ *n* [U] بەرەنگاری، ناگوێ ڕایەڵی، یاخی بوون، چەتەیی

تحد، مقاومة، تمرد، عصيان

*to act in ~ of orders* بەرەنگاری فەرمانەكان ئەبێتەوە

يتحدى الأوامر

**defiant** /dɪ'faɪənt/ *adj* بەرەنگار، یاخیبوو

متحد، متمرد

**deficiency** /dɪ'fɪʃnsɪ/ *n* [C,U] (*pl* -cies) كەمی، پەككەوتن، بێ توانایی بڕی كەم و كوڕی و پەككەوتن

نقص، عجز، مقدار النقص أو العجز

**deficient** /dɪ'fɪʃnt/ *adj* كەم، بەشنەكردو

ناقص، عاجز

*~ in courage* پێویستی بە ئازایەتی یە

تنقصه الشجاعة

*mentally ~* بێهۆش، ناتەواو

ناقص العقل، لديه اختلال عقلي

**deficit** /'defɪsɪt/ *n* [C] كەم، كەم دەرامەتی، (بەراورد *surplus*)

نقص أو عجز مالي (قارن *surplus*)

**defile** /dɪ'faɪl/ *vt* پیس دەبێت، گڵو دەبێت، كرێت دكت، پیس دكت، بۆگەن دەبێ

يفسد، يلوث، يدنس، ينجس

**define** /dɪ'faɪn/ *vt* ١. ڕوونی دەكاتەوە، دەری دەخات، پێناسەی دەكا، رادە دكت مانای ڕووندەكاتەوە (وەك وشە)

١. يوضح، يبين، يشرح معنى (كلمة مثلا)

*~ sb's duties /powers/* ٢. سنوری بۆ دادەنێت، ئەركی كەسێ دیاری دەكات

٢. يحدد، يعين، يعرف، يحدد واجبات / سلطات شخص ما

*hills clearly ~d against the sky* لەئاسمانەوە دیمەنی

گردەکان بەروونی دیارن. ۳. دایەنێ، سنوری بۆ دادەنێت

تلال واضحة المعالم قبالة الســماء ۳. يضع، يشكل، يحدد

سنوری شارێك دادەنێ، ~ *a country's boundaries*

نەخشە دەکێشێت

يخطط / يضع حدود بلد ما

**definite** /ˈdefɪnət/ *adj* ئاشکرا، دیاری کراو، روون

واضح، محدد

~ *article* ئامرازی پێناسین، رادەدار

اداة التعريف

**definition** /ˌdefɪˈnɪʃn/ *n* [C,U] ۱. پێناسەکردن، دەست نیشان کردن، روون کـردنەوە ۲. نـاساندن، دیـاری کردن، روونکردنەوە

۱. تعريف، شرح ۲. تحديد، توضيح، وضوح المعالم

**definitive** /dɪˈfɪnətɪv/ *adj* براوە، کۆتایی، ئەبری

جازم، قاطع، نهائي

**deflate** /dɪˈfleɪt/ *vt* ۱. بەتاڵی ئەکاتەوە لە هەوا (تایە، باڵۆن) فشی دەکاتەوە، دفشینێت ۲. دابەزاندنی نرخی پارە (بەراوردی *inflate* بکە).

۱. يفرغ من الهواء (اطار، بالون) ۲. تخفيض قيمة العملة (قارن *inflate*)

**deflation** *n* [U] خاڵی کردنەوە، چوونەوەیەك، فشکرن، شکانی نرخی دراو

تفريغ، انكماش، تقليص حجم العملة المتداولة مكافحة للتضخم

**deflect** /dɪˈflekt/ *vt, vi* لای دەدات، لار دەبێت

يميل، يحرف، يزيغ

**deflection** /dɪˈflekʃn/ *n* [C,U] خۆلەدان، لاددت، لادان

امالة، انحراف

**deform** /dɪˈfɔːm/ *vt* دەشێوێنێ، تێکی دەدات

يمسخ، يشوه

**deformed** *adj* شێواو، تێکچوو (لەش) (هۆش) خراپ، ناپەسەند، بەد، ناشرین

مشوه، مســوخ (الجسم) (مجاز) (العقل) كريه، مقيت، بشع

**deformity** /dɪˈfɔːmətɪ/ *n* [C,U] (*pl* -ties) شێواوی، عەیبداری، کرێتی، ناتەواوی

عاهة، تشوه، عيب جسدي

**defraud** /dɪˈfrɔːd/ *vt* گزی ئەکات، دخاپێنت، گەلۆری ئەکا

يغش، يدلس، يغبن

~ *an author of his royalties by ignoring copyright* دانەرێك بێ بەش دەکات لە قازانجی کتێبەکانی بـە پشت گوێخستنی مافەکانی دانەر

يحرم مؤلفا من عائدات كتبه بتجاهل حقوق التأليف

**defray** /dɪˈfreɪ/ *vt* بەشداری ئەکا بەپێدانی کرێی شتێك یا هەڵگرتنی

يساهم بدفع نفقات شيء أو بتحملها

**defrost** /ˌdiːˈfrɒst/ *vt* بەفری دروستبوی ناو بەفرگر یان سەر جامی ئوتومبیل دەتوێنێتەوە

يذيب الجليد المتكون في ثلاجة أو عـلى الحـاجب الزجـاجي لسيارة و ما اشبه

**deft** /deft/ *adj* شارەزا، کارامە، زیرەك، ووردبین، کارامەیی لە کاری دەستدا، دەسترەنگینی

ماهر، حاذق، في الاعمال اليدوية، (العمل) يدل على مهارة في الصنع

**deftly** *adv* بەشـەهرەزای، بەکارامەیی، بە شارەزایی، بە وریایی

بمهارة، بحذق

**deftness** *n* [U] کارامەیی، شەهرەزایەتی

مهارة، حذق

**defunct** /dɪˈfʌŋkt/ *adj* لە ناوچوو، کۆن، مردوو

ميت، بائد، زائل

**defy** /dɪˈfaɪ/ *vt* (*pt, pp* -fied) ۱. بەرەنگاری دەبێت، بەرپەرچی دەداتەوە ۲. بەرهەڵستی دەکات

۱. يتحدى، يتصدى ل ۲. يقاوم، يأبى الانصياع ل:

~ *the law / one's superiors* گوێ رایەڵی یاسا/ سەرۆکەکانی نابێت

يتحدى أو يأبى الانصياع للقانون / لرؤسائه

۳. بەرەنگاری کەسێك دەبێت (بروای ~ *sb to do sth* وایە توانای بـەسەریا نـاشکێ، یـان جـێبەجێ نـاکـا) ٤. تەگەرەی تێ دەخات، لەناو ئەچێ، کۆسپ ئەخاتە رێی

۳. يتحدى شخصا ان يفعل شيئا (يعتقد انه لا يقدر عـليه أو لن يفعله) ٤. يضع العراقيل أو الصعوبات

**degenerate** /dɪˈdʒenəreɪt/ *vi* نوشوستی دێنێت، ئەروخێ، بەرەو خراپی دەچێت

ينحط، يتدهور، ينحل

☐ /dɪˈdʒenərət/ *adj* بێ رەوشت، رووخاو، دۆراو

منحط، متدهور، منحل

☐ /dɪ'dʒenərət/ *n* [C] کەسێکی ڕووخاو، داکەوتوو، داتەپیو

شخص متدهور أو منحل

**degeneration** /dɪ'dʒenə'reɪʃn/ *n* [U] داکەوتن، نەمان، ڕزین، گەنیو، نزمبوون

انحطاط، تدهور، انحلال

**degrade** /dɪ'greɪd/ *vt* ١. پلەی دادەبەزێنێ (سەرباز) وەکو سزایەك ٢. ڕیسوای دەکات، بێڕێز سەیری دەکات

١. ينزل رتبة (جندي) كعقوبة ٢. يذل، يحقر، ينزل من قدر، يحط من شأن

*~ oneself by cheating/living an idle life* لە نرخی خۆی دادەبەزێنێ بە گزی، بە تەمەڵی

يحط من شان نفسه بالغش / بالكسل

**degree** /dɪ'gri:/ *n* [C] ١. پلە (یەکەی پێوانی گۆشە)

١. درجة (وحدة القياس في الزوايا)

*an angle of 90 ~s* گۆشەی وەستاو (٩٠) پلە ٢. پلە (یەکەی پێوانەی گەرمی)

زاوية قائمة (٩٠) ٢. درجة (وحدة القياس للحرارة)

*Water freezes at zero ~s centigrads.* ئاو لە سفری سەدی ئەی بەستێت ٣. پایە، بڕ، قۆناغ

يتجمد الماء عند درجة الصفر المئوية ٣. منزلة، مقدار، مرحلة

*various ~s of skill* پلەی جیاواز لە کارامەیی و شارەزایی

درجات متفاوتة من المهارة

*a high ~ of excellence* بەرزترین پلەی باڵا، نایاب

درجة عالية من الامتياز

*by ~s* وردە وردە

تدريجيا، خطوة فخطوة بالتدريج

*to a high/to the last ~* تا ڕادەیەکی زۆر، لەوپەڕیدا باڵاترین و دواترین

الى حد عظيم (الى اخر الحدود)

*to what ~* تا چ ڕادەیەك ٤. پلەو پایەی کۆمەڵایەتی

الى اي حد / مدى ٤. منزلة اجتماعية

*people of high ~* خەڵکی پایە بڵند

ناس ذوو مقام رفيع

*the ~ of Masster of Arts* ٥. پلەی زانستی، بڕوانامەی ماجستیر لە وێژە ٦. (ڕێزمان) یەکێ لە پلەکانی بەراورد، پلەی باڵا

٥. درجة علمية، شهادة درجة ماجستير في الاداب ٦. (في النحو) احدى درجات التفضيل الثلاث للصفات

**dehydrate** /ˌdi:'haɪdreɪt/ *vt* وشکی دەکات، ئاوی لێ لائەبات

يجفف، يزيل عنصر الماء من

*~d vegetables* سەوزەی وشك کراوە

خضار (مجففة)

**deice** /ˌdi:'aɪs/ *vt* ڕاینەماڵێ بەفر (بۆ نموونە لەسەر باڵی فڕۆکە)، لایئەبا

يزيل الثلج (عن جناحي الطائرة مثلا)

**deify** /'di:ɪfaɪ/ *vt* (*pt, pp* -fied) دەیپەرستێ تا پلەی خوایەتی، ئەیکاتە خوا، شتێك مەزن دەکا

يأله، يجعل إلهاً (من شيء)، يعظم الى حد التأليه

**deign** /deɪn/ *vi* دەستی لێهەڵدەگرێت، باشدەبێ، قایل دەبێت، ڕاست دەبێت

يتنازل، يتواضع، يتكرم

**deity** /'di:ɪtɪ/ *n* [C,U] (*pl* -ties) ١. خودا، خودێ، خدایەتی

١. الالوهية

*the Greek deities* ٢. خواد، خواوەندی یۆنان

٢. اله أو الاهة، الهة اليونان

*the D~* خوای گەورە و میهرەبان

الله تعالى

**deject** /dɪ'dʒekt/ *vt* دەبێتە هۆی دڵتەنگیو خەمباری

يسبب الحزن و الكآبة

**dejected** *adj* دڵتەنگی، پەستی، دڵگران، پەست، گرفتار، گرژبوون، خەفەتبار، ئاهین

حزين، مغموم، مكتئب، مكدر

**dejection** /dɪ'dʒekʃn/ *n* [U] دڵتەنگ، خەمبار، خامۆك

حزن، كدر، اكتئاب

**delay** /dɪ'leɪ/ *vt, vi* ١. دوای ئەخا، کەم تەرخەمی تیا ئەکات ٢. دوای دەخات، سستی تیادەکات

١. يؤخر، يهمل، يعطل ٢. يؤجل، يتوانى

☐ *n* [C,U] دواکەوتن، گیرۆدەیی، دواخستن

تأخير، تأجيل، توان

*start without ~* دەست پێدەکا بێ دواخستن

يبدأ دونما تأخير

**delectable** /dɪ'lektəbl/ *adj* دڵگیر، خۆش، تامدار
متع، مبهج، سار، لذيذ

**delegate** /'delɪgeɪt/ *vt* ١. نوێنەر دەنێرێت، نمێنەندە دکت ٢. نوێنەری دەکا، لە جێگەی دائەنێ
١. ينتدب، يوفد، يفوض ٢. ينيب، يخول

□ /'delɪgət/ *n* [C] نوێنەر، جێگر، شاندی، نمێنەندە، پەیك
مندوب، مبعوث، ممثل، نائب

**delegation** /,delɪ'geɪʃn/ *n* [C,U] نوێنەر، راسپارد، بریکاری، نێرراو، شاندن
ندب، تفويض، توكيل، وفد، بعثة

**delete** /dɪ'li:t/ *vt* لای دەبات، دەیسڕێتەوە، رادکت
يحذف، يشطب، يلغي

**deletion** /dɪ'li:ʃn/ *n* [C,U] سڕینەوە، لابردن، کوژاندنەوە
حذف، شطب، إلغاء

**deliberate** /dɪ'lɪbəreɪt/ *vt, vi* دەستا و دەست ئەکا، لێی دەکۆڵێتەوە، دخوینیت، هزر دکت
يتداول، يدرس، يتشاور

□ *adj* ١. بەئەنقەست، قەستی، خۆویستی
١. متعمد، مقصود

*a ~ insult* سوکایەتی پێ کردن بەئەنقەس / خۆویستی ٢. لەسەر خۆ
اهانة متعمدة / مقصودة ٢. متأن، مترو، متمهل (في التصرف، الحديث)

**deliberately** *adv* بە ئەنقەست، بەخۆویستی
عن عمد، عمداً، قصداً، بترو

**deliberation** /dɪ,lɪbə'reɪʃn/ *n* [C,U] ووتو وێژ، هەڵ سووڕانـدن بە راوێژکاری، راوێژی، بڕیاردان، چخراندن، هزر کرن
مباحثة، مداولة، مشاورة

**delicacy** /'delɪkəsɪ/ *n* [C,U] (*pl* -cies) خواردنی خۆش، خوارنا خوەش، ژیری، نازکی، تەنکی
طعام، مترف، شهي، رقة، كياسة

**delicate** /'delɪkət/ *adj* ١. نەرم و شل، نازەنین، نیان
١. ناعم، لين، رقيق

*as ~ as silk* نەرم وەکو ئاوریشم، تەنکی ٢. تەنکۆڵ، زوو تێك ئەشکێ
ناعم كالحرير ٢. رقيق، سريع العطب

*~ china/plants* قاپی چینی / ڕووەکی ناسك (پێویستی بەئاگاداری)
أوان صينية / نباتات رقيقة (بحاجة الى العناية و الحرص)

*a ~ looking child* منداڵێکی تێسك سوك، چوست، خوێنگەرم، چالاك ٣. وورده، پێویستی بە کارامەیی و وریایی هەیە
طفل رقيق الصحة ٣. دقيق، بحاجة لمهارة و دقة بالغة

*a ~ surgical operation* نەشتەرگەریەکی ورد ٤. (رەنگ) ناسك، نەرمۆلە، لەسەر خۆ، کاڵ، مات ٥. (هەست ئامێر) ژیر، سەحکەر، ئاسودە
عملية جراحية دقيقة ٤. (الألوان) ناعمة، هادئة ٥. (الحواس، الأدوات) مرهفة

*a ~ sense of smell* هەستەوەرەکانی بۆن، زۆر هەستیار
حاسة شم مرهفة

*the ~ instrumenst used by scientists* ئامێرە ووردکاریەکان کە زاناکان بەکاری دەهێنن ٦. رووخۆش، ناسك، نیان، رێز لە هەستی ئەوانی تر دەگرێت ٧. خواردنی خۆش، بەتام
الأجهزة الدقيقة التي يستخدمها العلماء ٦. لطيف، دمث، يحرص على مشاعر الاخرين ٧. (الطعام) شهي، لذيذ

*fish with a ~ flavour* ماسی تام خۆش، بەتام
سمك شهي المذاق

**delicious** /dɪ'lɪʃəs/ *adj* بەتام، بەلەزەت، بەچێژ، خۆش، شیرین، مەزەدار، گەلەك خوش، تامدار
لذيذ، طيب، شهي

**delight** /dɪ'laɪt/ *vt, vi* ١. شادئەبێ، دڵخۆش دەبێ، دڵ ئەکاتەوە، شادی، خۆش، شایی ٢. کاتێکی خۆش بەسەر دەبات، دڵخۆش دەبێت بە
١. يمتع، يبهج، يسر ٢. يتمتع ب، يسر ب، يجد متعة أو لذة في

□ *n* [C,U] دڵ خۆش، دڵشاد، چێژ
سرور، بهجة، متعة

**delightful** *adj* دڵشادکەر، دلخۆشکەر، تامدار، خۆش
سار، ممتع

**delineate** /dɪ'lɪnɪeɪt/ *vt* وێنە دەکێشێ، باسی ئەکات، هێڵ دکت
يرسم، يصور، يصف

**delinquency** /dɪˈlɪŋkwənsɪ/ *n* [C,U] (*pl* -cies) لادان، لاساری، هاروهاجی، سەرکەشی، تاوان، سەرپێچی، لەیاسا، کەم تەرخەمی لە کاردا

جنحة، إثم، انتهاك للقانون، تقصير في أداء الواجب

**delinquent** /dɪˈlɪŋkwənt/ *n* [C], *adj* لاسار، گونەهی‌لاسار، سەرکێش، ناپاسایی

حدث، جانح، منتهك للقانون

**delirious** /dɪˈlɪrɪəs/ *adj* تووشی ورێنە بووە، قسەبزر کاندن ئەلەتەوشی بەرئاخافتن، واس واسی، زوهەڵچو

مصاب بالهذيان، مهلوس، شديد الانفعال

**delirium** /dɪˈlɪrɪəm/ *n* [U] وورێنە، فشار، بەرئاخافتن

هذيان عقلي، هلوسة

**deliver** /dɪˈlɪvə(r)/ *vt* ١. ئەیگەیەنێ (نامەوکەل و پەل بەلاف دکت دینێرێت) ئەیداتێ ٢. رزگاری ئەکا، دەری ئەکا، ئاماژە ئەکا

١. يسلم، يوصل (الرسالة، البضائع الخ) ٢. ينقذ، يخلص، يحرر ينقذ من الخطر / الأغراء ٣. يلقي (محاضرة أو خطابا مثلا) ٤. يسدد، يوجه

*~ from danger/temptation* لە ترس رزگاری دەکات / هەڵفریوان ٣. وانە یان ووتار دەڵێتەوە گوتار دیێژێت ٤. لێی دەدات، ئاراستەی دەکات، دایینی ئەکا

*~ a blow in the cause of freedom* لێی ئەدرێ لە پێناوی سەربەستیدا

يسدد ضربة في سبيل الحرية

*be ~ed of (a child)* ٥. دایئەنێ، ئەزێت، ئەبێت، (منالێك)

٥. تضع، تلد، (طفلا)

**deliverance** /dɪˈlɪvərəns/ *n* [U] رزگار کردن، رزگار بوون، تەواو بوون، کۆتای پێهێنان

نجاة، إنقاذ، خلاص

**delivery** /dɪˈlɪvərɪ/ *n* [C,U] (*pl* -ries) دانان، لە دایك بوون، گەیاندن، دابەش کردن، پەراگەیاندن

وضع، ولادة، تسليم، توزيع، إلقاء

*take ~ of* دەیگەیەنێ، پێیدەدا، وەری ئەگرێ، بەدەستی دێنێ

يتسلم

**dell** /del/ *n* [C] دۆڵی پچوکی چر

واد صغير تحفه الأشجار

**delta** /ˈdeltə/ *n* [C] پیتی چوارەم لە ئەلفبێی ئەغریقی، دەلتای رووبار

الحرف الرابع في الأبجدية الإغريقية، دلتا نهر

*the Nile D~* دەلتای نیل، بەوێنە پیتی

دلتا النيل

**delude** /dɪˈluːd/ *vt* فێڵی لێ دەکات، گزی ئەکات، وای دێنێتە بەرچاو، دخاپێنێت

يخدع، يغش، يوهم، يضلل

**deluge** /ˈdeljuːdʒ/ *n* [C] باوباران، لافاو، لێشاو، تۆفان، خێزاو، سێل

طوفان، فيضان، سيل

*a ~ of words/questions* لێشاوی ووشە، یان زۆری پرسیار

سيل من الكلمات / الأسئلة

□ *vt* لافاو دێت، وەك لافاو، شاڵو دێنێ، ئاف رابوون، تۆفان

يفيض، يندفع كالفيضان

**delusion** /dɪˈluːʒn/ *n* [C,U] ئەندێشە، خەیاڵ، پێچون، لێکدانەوەی هەڵە

وهم، خداع، هوس

**delusive** /dɪˈluːsɪv/ *adj* خەیاڵی، درۆزن، فێڵکەر، چەقو

وهمي، كاذب، خادع

**delve** /delv/ *vt, vi* هەڵدەکۆڵێ، دەپشکێنێ

(ا.ق) يحفر، ينقب

*~ into* قوڵ دەبێتەوە، لێی دەکۆڵێتەوە (وەك پەراو و هێڵکارە دێرینەکان) بۆ زانین

(مجاز)، يتعمق، يتبحر، (في الكتب أو المخطوطات الأثرية مثلا)

**demagogue** /ˈdeməgɒg/ *n* [C] دیماگۆگ، سەروکی سیاسی، بە ووتارەکانی یاری بەهەستی خەڵکی دەکەن، لزیار، خاپان

زعيم سياسي يلعب بعواطف العامة بخطبة، غوغائي

**demand** /dɪˈmɑːnd/ *vt* ١. داوا دەکات، دخوازت، ٢. پێویستی پێیەتی، لەیاتەسەر، داوا دەکا، دەیەوێت

١. يطلب، يطالب ٢. يحتاج، يقتضي، يتطلب

□ *n* [C] ١. داوا، داخوازی، خواستن، داواکردن

١. مطالبة، طلب

يمسح، يزيل الضباب عن (الحاجب الزجاجي لسيارة مثلا)

**demobilization** /dɪˌməʊbelaɪˈzeɪʃn/ *n* [U] بەرەڵاکردنی سەرباز، لەشکر بەردان
تسريح الجنود

**demobilize** /diːˈməʊbəlaɪz/ *vt* لەشکەری بەرددت، کۆتایی هێنان بە خزمەتی سەربازی
يسرح الجنود

**democracy** /dɪˈmɒkrəsɪ/ *n* [C,U] (*pl* -cies) ١. حوکمەتی دیموکراتی، حکومەتی گەل (هەڵبژاردنی حکومەت لە لایەن جەماوەرەوە) ٢. دیموکراسی، ووڵاتی دیموکراتی ٣. کۆمەڵگەیەك ئەندامەکانی هەمان مافیان هەبێت.
١. حكومة ديموقراطية ٢. بلاد ذات حكومة ديموقراطية ٣. مجتمع يتمتع أفراده بحقوق متساوية

**democrat** /ˈdeməkræt/ *n* [C] دیموکرات، یان لایەن گری دیموکرات
ديموقراطي، مؤيد للديموقراطية

**democratic** /ˌdeməˈkrætɪk/ *adj* دیموکراتی
ديموقراطي

**demolish** /dɪˈmɒlɪ/ *vt* وێرانی دەکات، هەڵدەوەشێنێت، ئەیروخێنێت
يدمر، يقوض، يهدم

**demolition** /ˌdeməˈlɪʃn/ *n* [U] تێکدان، رووخاندن، وێران کردن، خاپور کردن
تدمير، تقويض، تهديم

**demon** /ˈdiːmən/ *n* [C] دێو، درنج، شەیتان، دیوەزمە
شيطان، عفريت

**demonstrable** /ˈdemənstrəbl/ *adj* توانای سەلماندنی هەیە، نیشانبار
ممكن إثباته

**demonstrate** /ˈdemənstreɪt/ *vt, vi* ١. ئەیخاتە روو، ئاشکرایدەکا، جێگری ئەکا، ئەیسەلمێنێ ٢. دەرییدەخات (هەست و سۆز)، کرێکارەکان مان دەگرن
١. يبرهن، يثبت ٢. يظهر (مشاعره و انفعالاته)، العمال يتظاهرون

**demonstration** /ˌdemənˈstreɪʃn/ *n* [C,U] پیشان دان، سەلماندن، خۆدەرخستن

on ~ کاتی پێویستی
عند الطلب

in great ~ ٢. زۆر پێویست، رەواج دار
٢. مطلوب جدا، شديد الرواج

a great ~ for good typists پێویستی زۆری بەچاپکەرە شارەزاکانە
الحاجة شديدة للطباعين الأكفاء

good in great ~ شت و مەکێ داخوازی زۆر لەسەر بێ
بضائع يتزايد عليها الطلب

**demarcate** /ˈdiːmɑːkeɪt/ *vt* سنور دیاری دەکات، نیشان دکت، رادە دکت
يعين الحدود

**demarcation** /ˌdiːmɑːˈkeɪʃn/ *n* [U] نیشانکردن، سنور دانان، رادەکرن
تعيين الحدود، رسم الحدود

**demean** /dɪˈmiːn/ *vt* خۆی سووك دەکات، رسوادکت، کیم دکت نزم دکت
يحقر أو يذل نفسه

**demeanour** /dɪˈmiːnə(r)/ *n* [U] رەفتار، رێباز، رەوشت، هەڵسوکەوت
سلوك، تصرف

**demented** /dɪˈmentɪd/ *adj* کەم هۆش، شێت، شپرزە، هارکری، هار
مخبول، مجنون، فاقد العقل، (ل. د) مستسلم للقلق

**demi** /ˈdemɪ/ *prefix* پێشگرێکە بە مانای نیو، پێشگرەکو نیمچە، نیڤە
بادئة معناها، نصف أو شبه

~ god نیڤ خودا (وەك خودا)
شبه اله

**demilitarize** /ˌdiːmɪlɪtəraɪz/ *vt* چەك دائەماڵێ لە (ناوچەیەك)، بێ لەشکەر دکت
ينزع سلاح (منطقه ما)

**demise** /dɪˈmaɪz/ *n* [C] (لە یاسا) مردن، لە ناوچوون، گیانکێشی، مەرگ
(في القانون) موت، وفاة

**demist** /ˌdɪˈmɪst/ *vt* ئەیسرێ، تۆز لەجامی ئۆتۆمبیلەکە لائەبات (بۆنمونە)

ایضاح، برهان، مظاهرة

**demonstrative** /dɪ'mɒnstrətɪv/ *adj* ١. سوسرەت، جلەوی سۆزی بەردەدات، هەست و سۆزی ناشارێتەوە

١. يطلق لعواطفه العنان، لايخفي مشاعره

~ *pronoun* راناوی دەست نیشانکردن

ضمير الإشارة

**demostrator** /'demənstreɪtə(r)/ *n* [C] نمایشتکار، نیشاندەر، یاریدەدەری مامۆستا لە کولیج

متظاهر، معيد في كلية

**demoralization** /dɪˌmɒrəlaɪ'zeɪʃn/ *n* [U] پیس بوون، لاواز بوونی باری زانیاری، ئاواژەکردن، سستکردن، لاواز کردن

إفساد، أضعاف المعنويات

**demoralize** /dɪ'mɒrəlaɪz/ *vt* ٢. رەوشت پیس ئەکا/ خراپی ئەکا، ورەی (سەرباز) نزم دەکات، شاش دکت، لاواز دکت

٢. يفسد الأخلاق أو يضعفها، يضعف المعنويات (للجنود مثلا)

**demote** /di:'məʊt/ *vt* دایئەبەزێنێ (پلە و پایە)

ينزل درجته أو مرتبته

**demur** /dɪ'mɜ:(r)/ *vi* (-rr-) نارەزایی وبێزاریی دەرئەبرێ، بەرهەڵستی دەکا، دژایەتی دەکا

يعترض، يحتج

~ *at working on Sundays* نایەوێ لە رۆژی یەك شەمماندا کاربکا

يحتج على العمل أيام الأحد

□ *n* [U] نارەزایی دەربرین، قایل نەبون، ملکەچی نەکردن

احتجاج، اعتراض

*obey without* ~ بێدوو دڵی ملکەچی دەکا، کوێرانە دوای ئەکەوی

يطيع دونما اعتراض

**demure** /dɪ'mjʊə(r)/ *adj* سەنگین، رێزدار، رۆمەتدار، داپۆشراو

رزين، محتشم

**den** /den/ *n* [C] ١. لانە، هێلانە، ئەشکەوت، پەناگە، لەهن، لان ٢. جێگە، (بۆ تاوانباران) شوێن بۆ خواردنەوەی مادە سرکەرەکان، شوێن بۆ کارو خوێندن

١. عرين، وكر (كهف مثلا) ٢. وكر (للمجرمين)، غرزه (المتعاطي المخدرات) ٣. خلوة، مكان يختلي فيه المرء (للدراسة أو العمل)

**denial** /dɪ'naɪəl/ *n* [C,U] رەت کردنەوە، نکولی، رێنەدان

رفض، نكران

**denomination** /dɪˌnɒmɪ'neɪʃn/ *n* [C] ١. چین، تیرە، دین، ئول ٢. ئاسناف، بەرە، ئاف دەستە، یەکەی کێشان یان درێژی، پارە، هتد

١. طبقة أو طائفة، ملة ٢. فئة من فئات أو وحدات (الوزن أو الطول أو العملة و نحوها)

**denominator** /dɪ'nɒmɪneɪtə(r)/ *n* [C] ژێرە، بنك، بەشکەر، ژێرەی کەرت، دابەش

المقام، مخرج الكسور

**denote** /dɪ'nəʊt/ *vt* ئاماژە بۆ ئەو ئەکا، نیشانەی ئەوەیە

يشير إلى، يدل على، يرمز إلى

**denounce** /dɪ'naʊns/ *vt* هەڵدەوەشێنێت (پەیمان یان پێکهاتن) تأوانبار دکت، حەز دەکات، سنور دانێت بۆ (پەیمان بروانامە)

يشجب، يشي ب، يشعر برغبة في وضع حد ل (معاهدة، اتفاقية)

**dense** /dens/ *adj* (-r, -st) ١. (شلە، تەم) خەست، چر، تیر ٢. (شت، زەلام) قەڵەبالغ، چر

١. السوائل أو الضباب كثيف ٢. (الأشياء أو الأشخاص) مزدحم، مكتظ

*a ~ crowd* کۆمەڵی چر، قەڵەبالغ، جەنجاڵ ٣. کەللە پوت، بێ مێشك، گەمژە، گێل، خرپۆ

حشد كثيف ٣. (الشخص) غبي، غليظ الدماغ

**densely** *adv* بەقەڵەبالغ، بەخەستی، چری، خەستی

على نحو كثيف أو مزدحم

**density** /'densətɪ/ *n* [C,U] (*pl* -ties) چری (فیزیا)، خەستی، تیری

(الفيزياء) كثافة

**dent** /dent/ *n* [C] کەلیین، داقوپان، قوپان، لێدانی توند

بعجة، انبعاج، ضربة، غائرة

□ *vt, vi* تێکی ئەشکێنێ، ئەیقوپێنێ بەلێدانی توند

يبعج، ينبعج، يصيب بضربة غائرة

**dental** /'dentl/ *adj* ددانی، پەیوەندی بە ددانەوە هەیە و چارەسەر کردنی

سني، ذو علاقة بالأسنان أو علاجها

**dentist** /dentɪst/ *n* [C] پزیشکی ددان، دانساز
طبيب أسنان

**dentistry** *n* [U] دانْ سازی، ددان ساز
طب الأسنان

**denture** /'dentʃə(r)/ *n* [C] تاقمی ددانی دەست کرد
طقم، أسنان صناعية

**denude** /dɪ'nju:d/ *vt* رووتی ئەکاتەوە، روت دکت، جل یان بەرگی لەبەر دائەکەنێ
يعري يجرد، ينزع الملابس أو الغطاء عن

*hillsides ~d of trees* (لاکانی) گردۆلکە بێ درەخت، روتەلْ
(جوانب) تلال عارية من الأشجار

**denunciation** /dɪ,nʌnsɪ'eɪʃn/ *n* [C,U] تاوانبار کردن، ئاگادار کردنی رەسمی بە کۆتایی هێنان بە (بەلێن یان رێکەوتنامە)
شجب، اتهام، أشعار رسمي بانهاء معاهدة او اتفاق

**deny** /dɪ'naɪ/ *vt* ١. نکولی لێدەکا، ئینکاری ئەکا، بەدرۆی ئەخاتەوە ٢. رێی لێدەگرێ، نایەلْێ، رەفزیئەکا ٣. دانی پیا نانێت
١. ينكر، يكذب ٢. يرفض، يمتنع ٣. ينكر، ينفي

*He denied the signature.* نکولی لەئیمزاکەی دەکات، ماندەل دکت
أنكر التوقيع

**deodorant** /di:'əʊdərənt/ *n* [C] بۆنبرە، بێهنا نەخۆش بر
مزيل لروائح كريهة

**deodorize** /di:'əʊdəraɪz/ *vt* بۆنی ناخۆش لادەبات، بیهنا نەخۆش دبرت
يزيل الرائحة الكريهة

**depart** /dɪ'pɑ:t/ *vi* دەروات، لاددت، دچت، جێ دێلْێ کۆچ ئەکات
يغادر، يبارح، يترك، يرحل

*~ from old customs* واز لەنەریتی کۆن دەهێنێت
يتخلى عن العادات القديمة، البالية

**department** /d'ɪpɑ:tmənt/ *n* [C] بەش، لق، بەڕیوەبەرایەتی، لق، پشك، دەڤەر
قسم، شعبة، فرع، ادارة

**departure** /dɪ'pɑ:tʃə(r)/ *n* [C,U] کۆچ، کۆچکردن، بارکردن
مغادرة، رحيل

**depend** /dipend/ *vi* ١. پشتی پێ دەبەستێ، باوەری دەکا
١. يعتمد على

*~ on/upon* پێویستی پێیەتی، خو ل سەر دگرت
يحتاج

*The old woman still ~s on her own earnings.* پیرێژنەکە هێشتا لەسەر قوتی خۆی ئەژی
لاتزال المرأة العجوزة تعتمد على كسبها

*Good health ~s on good food, sleep and exercise.* تەندروستی باش پێوستی بە خواردنی باش و خەو و وەرزشە
الصحة الجيدة تعتمد على الطعام المغذي و النوم و الرياضة

*That ~s/It all ~s.* ٢. ئەمە وەستاوەتە سەر باروودۆخ پشتی پێ ئەبەستێ، بروای پێ ئەکات
هذا يتوقف على الظروف ٢. يعتمد على، يثق ب

*You can always ~ on him to be there when needed.* ئەتوانێ پشتی پێ ببەستێ، هەر کاتێك، ویستت ئامادەیە
يمكنك دوما ان تعتمد عليه بان يكون موجودا عند الحاجة اليه

**dependable** *adj* باوەڕیار، جێی باوەڕ، متمانە پێکراو
موثوق به، جدير بالثقة، يعتمد عليه

**dependant** /dɪ'pendənt/ *n* [C] ئەژی لەسەر، نانخوەر، دەستدا
عالة على، تابع

**dependence** /dɪ'pendəns/ *n* [U] پشت پێ بەستن، باوەڕداری، بن دەستی، راپەرمون، متمانە
اعتماد على، اتكال، تبعية

**dependency** /dɪ'pendənsɪ/ *n* [C] (*pl* -cies) ناوچەیەك سەر بە دەسەلاتی دەولەتێکی تربێ، پاشکۆیەتی، خو ل سەر گرتن
بلد تابع لسلطة دولة أخرى

**dependent** /dɪ'pendənt/ *adj* پشتی پێ بەستراو، دەستدا، جێی متمانە
معتمد على، أهل للثقة

□ *n* [C] = *dependant* پشتی بەستوە بە، بروای تەواوی هەیە

اعتمد على

**depict** /dɪˈpɪkt/ *vt* وێنەی ئەکێشێ، دەنترێنێ دەنەخەشێنێت، باسی دەکات
يصور، يرسم، يصف بالكلمات

**deplete** /dɪˈpliːt/ *vt* بە کاری دێنێ، بەتاڵی دەکات، کاری دەکات
يستنفد، يفرغ، يستهلك

**depletion** /dɪˈpliːʃn/ *n* [U] ڕۆچوون، کیمیە داوەشین، وشکبون، ڤالاکرن، بەرو کزی چوون
استنزاف، نضوب، استهلاك

**deplorable** /dɪˈplɔːrəbl/ *adj* خەمناك، بێزارکەر، نائومێد
محزن، مؤسف

**deplore** /dɪˈplɔː(r)/ *vt* پێی پەست و دڵگران دەبێت، بێزاری دەردەبڕێت
يحزن أو يأسف على

**deploy** /dɪˈplɔɪ/ *vt, vi* بڵاوی دەبنەوە (سەرباز)، دگوهێزت، بڵاو دەکاتەوە (کەرستە)، بڵاف دکت، باش بەکاری دێنێ
ينشر، ينتشر (الجنود)، يوزع (الموارد)، (مجاز) يحسن استخدامها

**depopulate** /ˌdiːˈpɒpjʊleɪt/ *vt* چۆڵ دەکات، بێ خەڵك دکت، وڵات لە دانیشتوانی بێبەش دەکات
يخلي (يحرم) البلاد من سكانها
*a country ~d by war* ژمارەی دانیشتوانی وڵاتێك کەم دەبێتەوە بەهۆی شەڕوشۆڕەوە
يخفض عدد السكا، بلاد حرمتها الحرب من سكانها

**depopulation** /ˌdiːˌpɒpjʊˈleɪʃn/ *n* [U] چۆڵکردنی وڵات لەدانیشتوان، کەمکردنەوەی دانیشتوان
اخلاء بلاد من سكانها، تقليص أو انقاص عدد السكان

[1]**deport** /dɪˈpɔːt/ *vt* کۆچ دەکات بۆ دەرەوەی وڵات، دوردەخرێتەوە، سرگوم دکت
يرحل، يسفر خارج البلاد، يبعد

**deportation** /ˌdiːpɔːˈteɪʃn/ *n* [U] کۆچ پێکردن، بێخەڵك کردن، شاربەدەرکردن، دورخستنەوە
تسفير، أبعاد، ترحيل، نفي

[2]**deport** /dɪˈpɔːt/ *vt ~ oneself* دەگرێتە بەر، هەڵسوکەوت دەکات
يسلك، يتصرف
*~ oneself with dignity* سەنگینانە / ئاقرانە هەڵسوکەوت دەکات
يتصرف بوقار

**deportment** /dɪˈpɔːtmənt/ *n* [U] ڕەوشت، هەڵس و کەوت، ڕەفتار، سنج
سلوك، تصرف

**depose** /dɪˈpəʊz/ *vt, vi* ١. دکەفێنیت، دلیخیت، دای ئەکەنێ، واز لە داد ئەهێنێت ٢. لەبەردەم دادوەردا شایەتی پێ دەدات
١. يعزل، يخلع، يتنحى عن الحكم ٢. يشهد أمام محكمة

**deposit** /dɪˈpɒzɪt/ *vt* ١. خوا حافیزی لێ دەکات، دای دەنێت
١. يودع، يضع
٢. نیشتن، ئەنیشێت *rivers that ~*
٢. يرسب، يترسب
*mud and sand on the fields during a flood* ڕووبارەکان لەکاتی زریاندا قوڕ و لیتە بەجێ دەهێڵن ٣. پێشەکی دەدات
انهار تخلف رواسب من الطين و الرمال فى الحقول أثناء الفيضان ٣. يدفع عربونا

□ *n* [C] ١. پێشەکی، بارمتە، سپاردە، بیمە ٢. کەرەستەی نیشتوو
١. عربون، تأمين، وديعة ٢. مادة مترسبة أو رسوبية
*a ~ of gravel/tin/volcanic ash* نیشتووی چەو و لیتاوی، لمی بورکانی
ترسبات من الحصى، القصدير، الرماد البركاني

**deposition** /ˌdepəˈzɪʃn/ *n* [C,U] ڕاسپاردن، بەتایبەتی پارە لە بانك
المودع (و بخاصة من ما لا فى مصرف)

**depot** /ˈdepəʊ/ *n* [C] ئەمباری سەربازی، کۆگا، گەنجینە، کەوار
مستودع عسكري، مخزن، مستودع

**depraved** /dɪˈpreɪvd/ *adj* خراپ، لە ڕێ دەرچوو، بۆگەن، بێ ڕەوشت، ڕسوا، ڕووخاو، چەپەڵ ڕزی، ڕەوشتی خراپ
فاسق، منحرف، متفسخ،(الذوق و العادات) فاسد، منحط، رذيل

**depravity** /dɪprævətɪ/ *n* [C,U] (*pl* -ties) قونەکی، چەپەڵی، حیزی، خراپی، بێ‌سنجی
فساد، فسوق، انحلال

**depreciate** /dɪ'pri:ʃɪeɪt/ *vt, vi* لە نرخی کەم دەکاتەوە، بەکاری دەهێنێت، سوکی ئەکا
ينقص من قيمته، يقلل من شانه، يستهلك

**depreciation** /dɪ,pri:ʃɪ'eɪʃn/ *n* [U] خراپ بوون بەهۆی زۆر بەکارهێنان وسوان، کەمی لە تواناو بایەخ، پاکودان، کێمکرن (بەهایی پارا)
استهلاك بسبب الاستعمال، نقص في القيمة أو القدر

**depredation** /,deprə'deɪʃn/ *n* راوو رووت، تاڵانکردن، شەلاندن، دزی، چەتەیی
(في صيغة الجمع عادة) سلب، نهب

**depress** /dɪ'pres/ *vt* ١. فشار ئەخاتە سەری، دەیگوشێ، بۆ خوارەوە پاڵی پێوە دەنێت، نزم دەکاتەوە
١. يضغط على، يدفع إلى الأسفل

*~ a lever/the keys of a piano* پەستان دەخاتە سەر بەرزکەرەوەکە، پاڵ بە دوگمەی پیانۆ دەنێ بۆ خوارەوە ٢. خەم دایدەگرێ ٣. ئەیترسێنێ، دایدەبەزێنێ (نرخ)
يضغط على رافعة/ مفاتيح البيانو ٢. يحزن ٣. يوهن، يخفض (يدني) الأسعار

**depressing** *adj* خەمناك، پەست، مەلول، سەرکز، بێزارکەر
محزن، مزعج

**depression** /dɪ'preʃn/ *n* [C,U] ١. پەستی، خەم، خەمۆکی، دڵتەنگی ٢. دابەزین، رۆچوو ٣. بێ‌بازاری، هەژاری، نائومێدی ٤. دابەزینی پەستانی هەوا
١. حزن، كآبة ٢. منخفض، غور ٣. كساد، فتور اقتصادي ٤. انخفاض جوي، هبوط الضغط، منخفض جوي

**deprive** /dɪ'praɪv/ *vt* بێبەری دەکات لە، بێ بەشی دەکات لە، رووت دکت
يجرد، يحرم من

*~ sb/sth of*

*trees that ~ a house of light and air* درەختەکان ناهێڵن رووناکی بچێتە ماڵەکەوە
مع اشجار تحرم منزلا من النور و الهواء

**depth** /depθ/ *n* [C,U] ١. قوڵیی، کۆرایی، کۆری، قوڵایی
١. عمق

*the ~ of the ocean* کورایی، قوڵایی ٢. قوڵ، بن، رۆچو
أعماق، عمق المحيط ٢. عمق، غور

*snow three feet in ~* بەفر بە قوڵی سێ پێ باریوە
ثلج بعمق، بارتفاع ثلاثة أقدام

*out of one's ~* لە قوڵایی باڵای زیاترە، شت لەسەرو ئاستی بۆچوونیەوە
في مياه اعمق من قامته (مجاز) (شيء) فوق مستوى إدراكه

**deputation** /,depjʊ'teɪʃn/ *n* [C] نوینەر، نێرراوە، شاندن
وفد، بعثة، تفويض، انتداب

**depute** /dɪ'pju:t/ *vt* دەیکاتە نوێنەر، ئە دەشێنت
ينيب، يوكل، يفوض

**deputize** /'depjʊtaɪz/ *vi* جێگری دەکات، نوێنەری دەکا، نمێنەندەری دکت، لەبری ئەو کەسە
ينوب عن، يقوم مقام (شخص ما)

**deputy** /'depjʊtɪ/ *n* [C] (*pl* -ties) بریکار، جێگر، شونگر، دکت، نوێنەر
نائب، وكيل، ممثل

**derail** /dɪ'reɪl/ *vt* ڤاری، شەمەندەفەرەکە لە خەت لادەدات
يخرج قطارا عن الخط

**derailment** /dɪ'reɪlmənt/ *n* [C] ڤارێکرن، لادانی شەمەندەفەرەکە لە خەت
اخراج قطار عن الخط

**derange** /dɪ'reɪndʒ/ *vt* ئەپەشۆکێ، شەپرزە دکت، شێلی دکت، شێت، مێشك تێکچوو، هار دکت، سەرگەردان
يشوش، يبلبل، يربك، مشوش العقل، مخبول

**derelict** /'derəlɪkt/ *adj* چۆڵ، پشت گوێ خراو، کاول، کاڤل، بەتایبەت پاپۆری پاتایی دەریادا
مهجور، مهمل (بخاصة سفينة في عرض البحر)

**deride** /dɪ'raɪd/ *vt* پێی پێدەکەنێ، گاڵتەی پێدەکات، پێی رادەبوێرێ
يضحك على، يسخر من

**derision** /dɪ'rɪʒn/ *n* [U] گاڵتە، تەڤز، قەشمەری، پێکەنین
هزء، سخرية

**derisive** /dɪˈraɪsɪv/ *adj* پێ رابوێر، قەشمەر جار سوك كەر

ساخر، مستهزیء، مستخف

*~ laughter* پێكەنینی گاڵتەجار پێكردن

ضحك يدل على السخرية

*a ~ offer* گاڵتینە، شایەنی گاڵتەپێكردن

عرض تافه يستحق السخرية

**derisory** /dɪˈraɪsərɪ/ *adj* بە راستی نی یە، گاڵتە یە

ساخر، غير جدي

**derivation** /ˌderɪˈveɪʃn/ *n* [C,U] بنچینەی ووشە لێ وەرگرتن، داتاشین، دەرهێنان، لی‌گرتن

اصل أو منشأ الكلمة، اشتقاق

**derivative** /dɪˈrɪvətɪv/ *adj, n* [C] وەرگیراو لە شتی تر، هاتو، داتاشراو، لاوەكی

مشتق، اشتقاقي، فرعي

**derive** /dɪˈraɪv/ *vi, vt* ١. دەستی ئەكەوێت، لێی وەردەگرێ، ژێ دگرت

١. يحصل على، ينال

*~ great pleasure from one's studies* دەستی دەكەوێت، زۆر شادی بەدەست دێنێ بەخوێندنەكەی ٢. دادەرێژێ، وەریدەگرێت

ينال، متعة بالغة من دراسته ٢. يشتق

*English words ~d from Latin* ووشەی ئنگلیزی دەگەرێنێتەوەبۆ لاتینی

كلمات إنجليزية من اصل لاتيني

**dermatologist** /ˌdɜːməˈtɒlədʒɪst/ *n* [C] تایبەت بە نەخۆشی پێست، چەرم زان

أخصائي أمراض الجلد

**dermatology** /ˌdɜːməˈtɒlədʒɪ/ *n* [U] چەرم زانی، دەردە پێست زانی

علم الجلد و أمراضه

**derogatory** /dɪˈrɒgətrɪ/ *adj* رسوایی، بێرێزی، داگرتنی پلەوپایە ناوزران، رق لێبونەوە

محط للقدر و السمعة، ازدرائي

*remarks ~ to one's reputation* تێبینی ناپەسەند بۆ ناوزراندن

ملاحظات مسيئة الى السمعة

**derrick** /ˈderɪk/ *n* [C] ئامێری بەرزكەرەوە/ هەڵگریان بەرزكردنەوەی قورسی جیاجیا (بە تایبەتی لە كەشتیدا)

مرفاع، آلة لرفع أو تحريك الاثقال (بخاصة في السفينة)

**derv** /dɜːv/ *n* [U] ووشە پێكهاتووە لە ووشەیەكی دەستەواژەی

كلمة مكونة من الاحرف الأولى من عبارة

*Diesel Engined Road Vehicle* سووتەمەنی مەكینەی دیزل

وقود لماكينات الديزل

**dervish** /ˈdɜːvɪʃ/ *n* [C] دەروێش، قەلەندەر، پاك

درويش، زاهد

**desalinate** /diːˈsælɪneɪt/ *vt* سوێری ئاوی دەریا لا دەبات ، بێ خوێی دەكات

يزيل ملوحة ماء البحر

**desalination** /diːˌsælɪˈneɪʃn/ *n* [U] لابردنی سوێری ئاوی دەریا، بێخوێكردن، شیرینكردن

إزالة ملوحة ماء البحر

**descend** /dɪˈsend/ *vi, vt* ١. دێتە خوارێ، خل دەبێتەوە، دائەبەزێ

١. يهبط، ينحدر، ينزل

*be ~ed from* ٢. لەوەچەی خۆی یان ناونیشانی واز دێنێ ٣. (خاوەنیەتی، ماف) بە رێگەی بۆماوە ئەگوێزرێتەوە، دەگەرێتەوە، بۆ سەردەمی كۆن

٢. ينحدر من سلالة أو نسب ٣. (الأملاك، الصفات، الحقوق) يؤول إلى، ينتقل عن طريق الإرث، يرجع إلى عهد بعيد

*~ upon* ٤. لەپڕ هێرش دەكاتە سەر

٤. يهاجم فجأة، ينقض على

**descendant** *n* [C] وەچە، بەرە، بێچو، دوول، توخم، بنەچە، نەوە

حفيد، سليل

**descent** /dɪˈsent/ *n* [C,U] ١. دابەزین، داكەتن، نزمبونەوە ٢. رەچەڵەك، بنەماڵە

١. هبوط، انحدار ٢. اصل، نسب

*of French ~* رەچەڵەكی فەرەنسی ٣. هێرشی لە پڕ

من اصل فرنسي ٣. هجوم مفاجيء، انقضاض

**describe** /dɪˈskraɪb/ *vt* ١. باسی دەكات، پیدا هەڵدەدات ٢. وێنە دكت، راڤە دكت كێشەی ئەندازەیی دەكێشێت

١. يصف ٢. يرسم صورة لفظية ٣. يرسم شكلا هندسيا

**description** /dɪ'skrɪpʃn/ *n* [C,U] ١. باس كردن، پێناسى، وەسف كردن، ڕاڤەكردن
١. وصف، صورة لفظية
*of any/every ~* ٢. لەهەموو شێوەو و جۆر
٢. من كل وصف أو نوع

**descriptive** /dɪ'skrɪptɪv/ *adj* باسى، وێنەيى، نيشانى، ڕاڤەدار
وصفي، تصويري

**desecrate** /'desɪkreɪt/ *vt* پيسى دەكات، لە پيرۆزى كەم دەكاتەوە
يدنس، ينتهك قدسية (المعبد)

**desecration** /,desɪ'kreɪʃn/ *n* [U] پيس كردن، پيرۆزى پێشێل كردن
تدنيس، انتهاك القدسية

[1]**desert** /dɪ'zɜ:t/ *vt, vi* ١. بەجێى دەهێڵێت، وازى لێ دێنێت، كۆچ دەكات، دەربەدەر دەبێت، دەرەڤێت ٢. لێى ڕادەكات، فيرار دەكات
١. يهجر، يترك، يتخلى عن ٢. يهرب أو يفر من الخدمة
*soldiers who ~ed* سەربازەكان ڕايان كرد ٣. وازى لێ دێنێت، ناپاكى دەكا
جنود فارون ٣. يتخلى عن، يخون
*His courage ~ed him.* ئازايەتى يەكەى دەست خەرۆى كرد
خانته شجاعته

**deserter** *n* [C] ڕاكردوو، دەرباز بوو، فيرار (سەرباز)
هارب، ابق (و بخاصة الجندي)

[2]**desert** /'dezət/ *n* [C,U] بيابان، چۆڵ، چۆڵى
صحراء، بيداء
☐ *adj* خەرابە، چۆڵەوانى
مهجور، غير مأهول، قاحل، مجدب
*a ~ island* دورگەى چۆڵ
جزيرة غير مأهولة

**desert** /dɪ'zɜ:t/ *n* خاوەن كارى
أهلية، استحقاق
*get one's ~s* بەدەستى دێنێ ئەوەى شايەنيەتى
ينال ما هو أهل له

**desertion** /dɪ'zɜ:ʃn/ *n* [C,U] دووركەوتنەوە، وازهێنان، بەجێ هێشتن، فيرارى
هجر، تخل عن، فرار

**deserve** /dɪ'zɜ:v/ *vt, vi* قابيلى ئەبى، شياوى ئەبێ
يستحق، يستأهل
*~ praise/punishment for good/careless work*
شايەتى پاداشتە/ سزا بە هۆى كارە باشەكەى/ بايەخى پێنەدانەكەى
يستحق الثواب/ العقاب بسبب عمله الجيد/ غير المعتنى به

**deservedly** /dɪ'zɜ:vɪdlɪ/ *adv* بە شايەنەوە، لێهاتوى، بە خاوەنى مافەوە، شياوى، لێهاتويى
بجدارة، بحق، باستحقاق

**deserving** /dɪ'zɜ:vɪŋ/ *adj* شايان، پێڕەوا، هێژا، شياو، شايان بەرگەتى
مستحق، جدير

**desiccate** /'desɪkeɪt/ *vt* ووشكى دەكاتەوە، زوها دكت
يجفف
*~d fruit* ميوەى ووشك كراوە
فاكهة مجففة

**design** /dɪ'zaɪn/ *n* [C,U] ١. نەخشە دانان، هێڵكارى، پلان ڕشتن، نەخشەكێشان، پلان دانان
١. تصميم، وضع تصميم
*~s for a dress/garden* برينى كراس، باخ ٢. پلان دانان، هێڵكارى گشتى (كێشەى پەراو يان خانو يان ئامێر) ٣. نەخشە كێشانى هونەرى ٤. ئامانج، ويست نەخشەى بۆ دادەنێ
تصميم لثوب (حديقة) ٢. تخطيط، تشكيل، خطة أو مخطط عام (للوحة أو كتاب أو مبنى أو الة) ٣. تصميم فني (على وعاء أو بساط) ٤. مقصد، نية، هدف
*have ~s on/against* نيەتى خراپە
يضمر نوايا سيئة
☐ *vt, vi* نەخشەى بۆ دائەنێ
يصمم، يضع تصميما لـ
*~ wall-paper/carpets* ١. نەخشەدائەنێ بۆ (ديوار، فەرش) ٢. نيەت هەيە، ئومێدى وايە، پلانى بۆ دائەنێ، ئامادە لەكا بۆ كارى دەست
١. يضع تصميما لورق (الجدران، للسجاجيد) ٢. يهدف الى، ينوي، يخطط، يعد
*a room ~ed for a workshop* ژوورى ئامادە كراو بۆ

کار کردن (وەرشە)

غرفة معدة لتكون مشغلا (ورشة)

**designate** /'dezɪgneɪt/ *vt* ١. دیاری دەکات، دەست نیشانی دەکات، ناوی لێ دەنێت (بۆکارێ)

١. یعین، یحدد

*~ boundaries* دەست نیشانی سنوور ئەکات ٢. دای دەمەزرێنێت، بۆ پۆست هەڵی دەبژێرێ، داینراوە، دامەزراندوە

یعین، یحدد الحدود ٢. یدل علی، یظهر بوضوح ٣. یعین، یختار لمنصب

*He ~d Smith as his successor.* سمسی لە جێی خۆی داناوە

عین، اختار سمث خلفا له

*□ adj* (پێش ناوە)، هەڵبژاردە، ناف کرت

(تتبع الاسم) مرشح، مختار لمنصب

**designation** /,dezɪg'neɪʃn/ *n* [C,U] ناوی ناز ناو، دیاری کراو، دامەزراندن، نیشان، دیاری کردن، هەڵبژاردنی پۆست

اسم أو لقب ممیز، تعیین أو اختیار لمنصب

**designer** /dɪ'zaɪnə(r)/ *n* [C] نەخشە کێش، بریکاری نەخشکەر

مصمم، واضع التصمیم

**desirable** /dɪ'zaɪərəbl/ *adj* داواکراو، خوازراو، خوازیار

مرغوب فیه، مطلوب

**desirability** /dɪ,zaɪərə'bɪlətɪ/ *n* [U] شتێکی داواکراو، ویستراو، خوازیاریەتی، ڤیان، خواستن

کون الشیء مطلوبا أو مرغوبا فیه

**desire** /dɪ'zaɪə(r)/ *n* [C,U] ١. بە ئارەزوو، دڵخازی، ٢. داخواز، ڤیان حەز، نیاز، هەوەس

١. رغبة فی، شوق ل ٢. رغبة، امنیة

*get one's ~s* ئاواتەکانی دێتە دی

یحقق رغباته (امانیه)

*□ vt* ١. حەزی لێ دەکات ٢. داوادەکات

١. یرغب فی، یتوق الی ٢. یطلب

**desirous** /dɪ'zaɪərəs/ *adj* دەخوازێ، شەیدا ئەبێت، دەیەوێت

راغب فی، تواق الی

*~ of success* حەز لە سەرکەوتن دەکات

تواق الی النجاح

**desist** /dɪ'zɪst/ *vi ~ from* ئەوەستێ، ئیدی ناکات، وازی لێ دێنێت، رادەوەستێت

یتوقف، أو یکف عن، یمسك عن

**desk** /desk/ *n* [C] مێز، تەختە

مکتب، منضدة للکتابة

**desolate** /'desələt/ *adj* ١. چۆڵ کراو، وێران کراو ٢. کڵۆڵ، چارەڕەش، هونەرمەندێك هاورێ کانی وازیان لێ هێناوە

١. مهجور، خرب، مقفر ٢. مستوحش، یائس، شاعر یتخلی الأصدقاء عنه

*□ vt* وێرانی ئەکات، چۆڵی ئەکات، ژەهرڤینیت، کافل دکت

یخرب، یهجر، یحیل الی الدمار

**desolation** /,desə'leɪʃn/ *n* [U] وێرانە، هەرڤین، کافلبون، کاول بوون

خراب، دمار، وحشة

**despair** /dɪ'speə(r)/ *vi, n* [U] بێ هیڤی، نا ئومێد، بێ هیوا، دۆشداماو

یائس، یقطع الأمل، یقنط

**despairing** *adj* بێزار، بێ هێڤی، ناچار، بە ناچاری

یائس، قانط، دال علی إلیأس

**despatch** /dɪ'spætʃ/ *n, vt* (بڕوانە *dispatch*)

(انظر *dispatch*)

**desperate** /'despərət/ *adj* ١. نائومێد، کڵۆڵ، بێ هیوا و چارە ڕەش، فەوتاو، بێ هێڤی

١. (الشخص) یائس، فاقد للأمل، متهور بسبب إلیأس، مستمیت

*~ criminals* تاوانبار بێ هیوان هیچ شتێك بەدەست ناهێنن ٢. ترسناك، دوودڵی

مجرمون مستمیتون (لا یتورعون عن شیء) ٢. خطیر، مترد

*a ~ state of affairs* باری ناهەموار (دوو دڵی)

وضع خطیر (مترد)

**desperately** *adv* بە ناچاری، بێ بیرکردنەوە، بەسەرچڵی

علی نحو یائس أو خطیر أو متهور

**desperation** /,despə'reɪʃn/ *n* [U] نائومێد، هیوابڕاو، بێ بی هیڤیبون

یأس، قنوط، یأس بالغ یقود إلى التهور

**despicable** /dɪˈspɪkəbl/ *adj* چەپەڵ، بێزراو، نەویستراو

حقیر، مقیت، مزدری

**despise** /dɪˈspaɪz/ *vt* سوکایەتی پێدەکات، ترۆی دەکات، بە نزمی سەیری دەکات

یحتقر، یستخف ب

**despite** /dɪˈspaɪt/ *prep* لەگەڵ ئەوەشدا، دژی، هەرچەند، سەرەڕای، مارزکی

على الرغم من، بالرغم

**despondency** /dɪˈspɒndənsɪ/ *n* [U] نائومێد، دڵتەنگی، بێ ئارام، ترساو

قنوط، کآبة، جزع، یأس

**despondent** /dɪˈspɒndənt/ *adj* کڵۆڵ، نائومێد، خەمگین، بێ هێڤی، بێتاقەت

یائس، قانط، مکتئب

**despot** /ˈdespɒt/ *n* [C] دادرەری رەها، زەبر بەدەست، زۆردار، ستەمکار، کوتەك

حاکم مطلق، طاغیة، مستبد

**despotic** /dɪˈspɒtɪk/ *adj* دیکتاتۆری، زۆرداری، زۆرکار

استبدادی، طغیانی

**dessert** /dɪˈzɜːt/ *n* [C] میوە یان شیرینی لەدوای خواردن پێشکەش دەکرێت

طبق من الفاکهة أو الحلوى یقدم بعد الطعام

**ˈdessertspoon** *n* [C] کەوچکی، کەفچکی قاوە و شیرینی پێ

ملعقة للحلوى

**destination** /ˌdestɪˈneɪʃn/ *n* [C] جێی مەبەست، دو ماهی، قەست، ئامانج

الجهة المقصودة، غرض، غایة

**destined** /ˈdestɪnd/ *adj* تەرخانکردن، دیاری کراو، ئارمانج کری

مقدر، مخصص، معین

**destiny** /ˈdestɪnɪ/ *n* [C,U] (*pl* -nies) ١. پەشك، قەزاو قەدەر، ئەنجام ٢. چارەنووس، چارە نڤیس، چارە، بەخت

١. القضاء و القدر، مصیر ٢. القسمة، النصیب

**destitute** /ˈdestɪtjuːt/ *adj* ١. بێ بەش، ئاوارە ٢. هەژار، دەربەدەر

١. محروم، معوز ٢. خلو من، عدیم

*entirely ~ of sympathy* بەبێ، بەبێ‌رەحم و بەزەیی

عدیم الإشفاق

**destitution** /ˌdestɪˈtjuːʃn/ *n* [U] هەژاری، نەبوونی، دەست کورتی

عوز، املاق، فقر مدقع

**destroy** /dɪˈstrɔɪ/ *vt* وێرانی دەکات، کاولی دەکات

یدمر، یهدم، یتلف

**destroyer** *n* [C] وێران کەر، پاپۆڕی جەنگی بچوك و خێرا، کەشتی جەنگی کاڵدکەر

المدمرة، سفینة حربیة صغیرة و سریعة

**destructible** /dɪˈstrʌktəbl/ *adj* توانای لە ناوبردن و وێران کردنی هەیە، شکەستوك

قابل للهدم و التدمیر

**destruction** /dɪˈstrʌkʃn/ *n* [U] وێران کردن، کاولکاری، رووخاندن، خاپور کردن، رۆخێن، هشین

هدم، تدمیر، تخریب

**destructive** /dɪˈstrʌktɪv/ *adj* وێرانکار، وێرانکەر

مدمر، هدام

**desultory** /ˈdesəltrɪ/ *adj* هەڵوەشاو، ڤەکری، بێ ئارمانج

متقطع، عابر، متفکك

*~ reading* خوێندنەوەی سەر پێیی / بێ‌ئامانج

قراءة عابرة (سطحیة)

**detach** /dɪˈtætʃ/ *vt* ١. جیای دەکاتەوە، لێی دەکاتەوە، ئەیکاتەوە ٢. (لە سوپادا) دەینێرێ، ناردن، ڤەرساندن، جیاکراوە، ئەتوانرێ

١. یفصل، یحل، یفك ٢. (الجیش) یرسل (کتیبة) فی مهمة خاصة

**detachable** *adj* جیابکرێتەوە، جوادکری

قابل للفصل، یمکن فصله

**detached** *adj* (هۆش، بیروڕا) سەربەخۆ، سەربەست، جیاواز، جوداکری، جیاواز کری

(العقل، الأفکار) مستقل، غیر متحیز، (المنزل) منفصل

**detachment** /dɪˈtætʃmənt/ *n* [C,U] ١. جیاواز (جیابونوە) ٢. بێ لایەنی، سەربەخۆیی لە بیروڕا، سەربەخۆبونا هزری ٣. سەربەخۆبوون لە سەربازی، کۆتایی

هێنان بەخزمەت
١. فصل، انفصال ٢. تجرد، عدم تحيز، استقلال في الرأي ٣. تجريدة عسكرية

**detail** /di:teɪl/ *n* [C,U] ١. خاڵێك، پارچەی بابەتێك ٢. کۆمەڵە بابەتێك
١. نقطة واحدة من جزئيات موضوع ٢. مجموعة من التفاصيل
*go into ~s* / دەچێتە بابەتەکانەوە، درێژەی پێدەدات/ ئەیخاتەروو
يدخل في التفاصيل، يستعرض التفاصيل
*explain sth in ~* روونی دەکاتەوە
يشرح شرحا مفصلا
□ *vt* ١. بەدرێژی روونی دەکاتەوە ٢. هەڵدەبژێری بۆ کاری گرنگ
١. يفصل، يشرح بالتفصيل ٢. يختار لمهمة خاصة
*Three soldirers were ~ed to guard the bridge.*
سێ سەرباز دابین کران بۆ پاسەوانی پردەکە
كلف ثلاثة جنود بحراسة الجسر

**detain** /dɪ'teɪn/ *vt* گل دانەوە، دگرت، دواخستن، گرتن
يحتجز، يعوق، يؤخر، يعتقل
*to be ~ed at the office* لە پەرتوك خانەکە گلیان دایەوە
يحتجز في المكتب

**detect** /dɪ'tekt/ *vt* بە دوایدا دەگەرێ، پێئەزانێ، تێبینی ئەکا، روونی ئەکاتەوە سەح دکت
يكشف، يلاحظ، يستبين، يتحرى

**detector** *n* [C] ئامێری پشکنینی تیشك، سەحکەر
جهاز كشف عن الأشعاع

**detection** /dɪ'tekʃn/ *n* [U] پشکنین، سەحکرن،
كشف، تحري
*the ~ of crime* بەشوێن تاواندا گەران
تحري الجريمة

**detective** /dɪ'tektɪv/ *n* [C] بەشوێن تاوانداگەران، پۆلیسی نهێنی، پشکنەر، سەحکەر
تحري، بوليس سري، مخبر

**detente** /,deɪ'tɑ:nt/ *n* [U] كۆك بوونی دەوڵەت، ئەبون
الوفاق الدولي

**detention** /dɪ'tenʃn/ *n* [U] گلدانەوە، دواخستن، گرتن، هەبەستن

احتجاز، تأخير، إعتقال

**deter** /dɪ'tɜ:(r)/ *vt* (-rr-) ناهێڵێت، رێگەی لێ ئەگرێت، ناهێڵێت
يمنع، يعوق، يثبط
*Let nothing ~ you from trying to succeed in life.*
لە پێناو سەرکەوتنەکانی ژیاندا نەهێڵێت هیچ شێك رێگەت لێبگرێ لە هەوڵدان
يحول بينك و بين محاولة النجاح في الحياة

**detergent** /dɪ'ɜ:dʒənt/ *adj, n* [C,U] خاوێن کەرە، پاکەرەوە، مادەیەکی پاقژکەر، خاوێن کەر، پاکژکەر
منظف، مطهر، مادة مطهرة

**deteriorate** /dɪ'tɪərɪəreɪt/ *vt, vi* پیس ئەبێ، نزمی ئەکاتەوە، ئەگەرێتەوە بۆ دواوە، خراپ دەبێ، دەکەوێ
يفسد، ينحط، يتراجع الى الوراء، يتدهور

**deterioration** /dɪ,tɪərɪə'reɪʃn/ *n* [U] نزم دەبێتەوە و پیس ئەبێ، ئەگەرێتەوە بۆ دواوە
انحطاط، فساد، تراجع

**determinate** /dɪ'tɜ:mɪnət/ *adj* دیاری کراو، کۆتایی هێنراو
محدد، نهائي

**determination** /dɪ,tɜ:mɪ'neɪʃn/ *n* [U] نەخشەدانا، بریار دان، دیاری کردن، دانان
عزم، تصميم، تحديد

**determine** /dɪ'tɜ:mɪn/ *vt, vi* دیاری ئەکات، رادەداری ئەکا، دای ئەنێت، دەست نیشانی دەکا
يحدد، يعين
*The size of your feet ~s the size of your shoes.*
١. قەبارەی قاچت پێوانەی پێلاوەکەت دیاری ئەکات، ٢. بریاری لەسەر ئەدات ٣. پابەندە بە بریار دان ٤. سنوری بۆ دائەنێ
١. حجم قدميك هو الذي يحدد مقياس حذائك ٢. يقرر، يعقد النية على، يبت ٣. يحمل على اتخاذ رأي أو قرار ٤. يحدد، يعرف بدقة
*~ the meaning of a word* مانای ووشەکە دیاری ئەکات
يحدد معنى كلمة ما

**determined** *adj* هەتەر، چارەنوسی، ئەبر، سوربون لەسەر

مُصرّ، مصمم، ذو عزم

**deterrent** /dɪ'terənt/ *adj, n* [C] بەهەڵست، گیرو، ترس، بەربەست، دواخەر

رادع، مانع، مثبط

**detest** /dɪ'test/ *vt* رقی لێبەتی، رقو کینە، ناپەوێت، حەزناکات، کین دکت

يكره، يبغض، يمقت

**detestable** *adj* نەویست، بێزراو، رق

بغيض، مكروه، مقيت

**detestation** /,di:te'steɪʃn/ *n* [C,U] رق، کینە، بوگەن، بێزکردن، قین، کین، قێز

بغض، كره، مقت

**dethrone** /,di:θrəʊn/ *vt* لای دەبات، بێ تەخت دکت، بێ تاج دکت، لە عەرش دایدەگرێت

يخلع (ملكا) ينزله عن العرش

**detonate** /'detəneɪt/ *vt, vi* دەیتەقێنێتەوە، دەتەقێ، دپەقت

يفجر، يتفجر، ينفجر

**detonator** *n* [C] تەقێنەر، پلیتەی تەقینەوە، پەقینکەر

مفجر، فتيل التفجير

**detonation** /,detə'neɪʃn/ *n* [C,U] تەقاندنەوە، تەقاندن

تفجير، انفجار

**detour** /'di:tʊə(r)/ *n* [C] دەوروەدان، رچە، دزفرت، تێوەگلان، سورانەوە، ڤارێ، ڤارێ دکت

التفاف، انعطاف، تحويلة مؤقتة للمرور

*to make a ~* پێچ دەکاتەوە، دایدەشکێنێ

ينعطف

**detract** /dɪ'trækt/ *vi ~from* کێم دکت، کەم دەکات، وێڤە دیت

ينتقص، يخصم، يقلل من

**detractor** *n* [C] شکاندن، لەئاستی دادەبەزێنێ

قادح، منتقص من شأن، ذام

**detriment** /'detrɪmənt/ *n* [U] زیان، ئازار، خراپەکاری، ئازادان

ضرر، أذى، إساءة

*A child cannot smoke without ~ to is health.*

منالێ ناتوانێ جگەرەبکێشێ و زیان بەتەندروستی نەگەیەنێت

لايمكن لطفل ان يدخن بدون الأضرار بصحته

**detrimental** /,detrɪ'mentl/ *adj* زەرەرمەند، زیاندار

ضار

**devaluation** /,di:,væljʊ'eɪʃn/ *n* [C,U] دابەزین و نزم بوونەوەی نرخی دراو، بەها شکاندن

تخفيض قيمة العملة

**devalue** /,di:'vælju:/ *vt* دابەزینی نرخی دراو، نرخ شکاندن

يخفض قيمة العملة

**devastate** /'devəsteɪt/ *vt* تێکدەشکێنێ، وێرانی دەکات، ماندووی ئەکات

يدمر، يخرب، يهلك

**devastation** /,devə'steɪʃn/ *n* [U] روخان، تێکشکاندن، وێران کردن

خراب، دمار، تخريب

**develop** /dɪ'veləp/ *vt, vi* ١. گەشەی پێئەدات، پەرەی پێ ئەدات، فرەهدکت، ئاڤا دکت ٢. دەرخستنی یان تەحمیز کردنی/ شتنەوەی وێنەی فۆتۆگرافی

١. ينمو، يتطور، يتوسع، يطور، يوسع ٢. يظهر يحمض صورة فوتوغرافية

**developer** *n* [C] گەشەپێکەر، ئاڤاکەر، پەرەسێنەر

منشئ، مطور

**development** /dɪ'veləpmənt/ *n* [C,U] پێش خستن، ئەشونماو گەشە

تطور، نمو

*the latest ~s in foreign affairs* دواهەمین پێشکەوتن لە کاروباری دەرەوە

آخر التطورات في الشؤون الخارجية

**deviate** /'di:vɪeɪt/ *vi* لادەدات، لەرێ دەردەچێت

ينحرف، يحيد، يخرج عن الطريق

**deviation** /,d:vɪ'eɪʃn/ *n* [C,U] لادان، ڤارێبون

انحراف

**device** /dɪ'vaɪs/ *n* [C] ١. رێباز، هۆ، فێڵ، دروشم

١. وسيلة، حيلة

*leave sb to his own ~ s* لێی گەرێ خۆی و خوای خۆی ٢. ئامراز، ئامێر ٣.ئالا، هێما، وێنە، دروشم

يتركه و شأنه ٢. أداة، جهاز ٣. رسم، شعار، رمز

**devil** /'devl/ *n* [C] ١. شەیتان، کەسێکی خراپ

١. شیطان، ابلیس، شخص شریر

٢. هاواری سەرسوڕمان *How the ~*

٢. صیحة تدل علی الاستغراب

ڕۆژگارێکی تاڵ *the ~ of a time*

وقت عصیب، مثیر (حسب السیاق)

**devilish** /ˈdevəlɪʃ/ *adj* شەیتانی، جەهەنەمی، بەد

شیطانی، جهنمی، شریر

**devious** /ˈdi:vɪəs/ *adj* خوار، ڕێبەردەر، تەڵەکەباز، چەقۆ

ملتو، منحرف، مراوغ

**devise** /dɪˈvaɪz/ *vt* دادەهێنێ، دایدەهێنێ، ڕاسپێرکرن، بۆدەرکەوتن

یبتکر، یخترع، یستنبط

**devoid** /dɪˈvɔɪd/ *adj ~ of* بێ لە، بەتەنها، پەتی

خال من، مجرد من

*~ of sense* بێ هەست، هەست مردوو

مجرد من الإحساس

**devolve** /dɪˈvɒlv/ *vi, vt* (کار، ئیش) ئەگوێزێ بۆ کەسێکی تر

(العمل، الواجبات) تنتقل أو تتحول الی (شخص آخر)

*~ on/upon*

*When Smith is ill, his work ~ s on me.* کەسمس نەخۆش کەوت من هەڵدەستم بەکارەکەی

عندما یمرض (سمث) یتحول عمله إلیّ

**devote** /dɪˈvəʊt/ *vt* تەرخان دەکات، دادنێت

یکرس، ینذر، یخصص

*~ all one's spare time to sport* هەموو کاتی خۆی بۆ وەرزش تەرخان دەکات

یکرس کل وقته الفائض للریاضة

**devoted** *adj* دڵسۆز، بەوەفا، بەئەمەك

مخلص، وفی

**devotee** /ˌdevəˈti:/ *n* [C] دڵسۆز، دروستکار، حەیران، دەمارگیری دینی، ئالیکار

المخلص أو المتحمس لفکرة ما، متعصب دینیا

**devotion** /dɪˈvəʊʃn/ *n* [U] دڵسۆزی، ئولداری، دینداری، دانان، پارانەوە

اخلاص، تفان، تقوی، ورع (فی صیغة الجمع) صلوات

**devour** /dɪˈvaʊə(r)/ *vt* لووش کردن، قووت دان، دەیخواتەوە، دەگرێتەبەر، دقرێنت، دخوت، وێرانی دەکات، داخوران

یبتلع، یفترس، یلتهم (مجاز) یلتهم (بعینیه، بأذنیه) (النیران) تدمر، تأکل

بێئارامی *~ed by (anxiety)*

یستبد به القلق

**devout** /dɪˈvaʊt/ *adj* ئایندار، پاك، دڵسۆز، لە خوا ترس، خۆپاراستن

ورع، تقی، مخلص، (الصلاة، الرغبات) تنم عن الخشوع والورع و الإخلاص

**devoutly** *adv* بەهێز دەبێت بە ئایینداری

بتقوی، بورع، بإخلاص

**dew** /dju:/ *n* [U] شەونم، ئاوی

ندی

**dewy** *adj* شەونم داری، شێدار

ندی، رطب

**dexterity** /ˌdekˈsterətɪ/ *n* [U] کارامەیی، زیرەکی، شەهرەزایی

مهارة، حذق، براعة

**dexterous** /ˈdekstrəs/ *adj* کارامە، زیرەك، دەست سفك، بەدەست و برد

ماهر، حاذق، بارع و بخاصة فی استخدام یدیه

**dhow** /daʊ/ *n* [C] (دهۆ) کەشتی گەمی یا برەکی، کەشتی چارۆکەداری عەرەبی

الدهو، مرکب شراعی عربی

**diabetes** /ˌdaɪəˈbi:tɪz/ *n* [U] نەخۆشی شەکرە

مرض السکر

**diabetic** /ˌdaɪəˈbetɪk/ *adj, n* [C] پەیوەندی بە کەسێکی تووش بوو بە نەخۆشی شەکرە، شەکر میزی

له علاقة بـ / شخص مصاب بمرض السکر

**diabolic** /ˌdaɪəˈbɒlɪk/ *adj* شەیتانی، جەهەنەمی، درندەیی

شیطانی، جهنمی، وحشی

**diagnose** /ˌdaɪəgˈnəʊz/ *vt* دناست، دیاری دەکات (بەتایبەتی نەخۆشی)

یشخص (و بخاصة المرض)

**diagnosis** /ˌdaɪəgˈnəʊsɪs/ *n* [C,U] (*pl* -noses) دیاری کردن، ئێش ناسین، تیرکی، لاداو، لارەهێڵ

استكشافي، تمهيدي

**explore** /ɪk'splɔ:(r)/ *vt* ١. پیادەگەڕێ، پەیدادكت ٢. ئەپشكنێ

١. يستكشف، يرود ٢. يتحرى

**explorer** *n* [C] گەڕیدە، دۆزەرەوە

مستكشف، رائد

**explosion** /ɪk'spləʊʒn/ *n* [C] تەقینەوە، تەقین، شیقین

انفجار، تفجير

**explosive** /ɪk'spləʊsɪv/ *n, adj* تەقەمەنی، تەقێندار، پەقیندار

مادة متفجرة، متفجر

**exponent** /ɪk'spəʊnənt/ *n* [C] لێكدەر، لاگر، ڕێبەر، رابەر

الشارح، المفسر، المؤيد (لنظرية)

**export** /ɪk'spɔ:t/ *vt* دەنێرێتە دەرەوە

يصدر (بضائع)

□ /'ekspɔ:t/ *n* [C] هنارتی (دەڤە)

تصدير

**expose** /ɪk'spəʊz/ *vt* ١. پیشان دەدات، دەخاتە ڕوو، دیاردبت

١. يعرض، يكشف

~ *soldiers to the enemy's fire* سەربازەكان شوێنی ئاگر بارانی دوژمنیان دۆزیەوە

يكشف الجنود لنيران الاعداء

~*d to the weather* هۆكارەكانی كەش كاری تێنەكات، مەیخەرەبەر تیشكی خۆر ٢. ئەیخاتە ڕوو (بۆ نمونە كەل و پەل بۆ فرۆشتن)، ئاشكرای دەكات ٣. ڕسوای ئەكا، ئابڕوی ئەبا ٤. (وێنە) فلیمەكە ئەخاتە بەر ڕووناكی

معرض للعوامل الجوية، لا تعرضه لأشعة الشمس ٢. يعرض (البضائع للبيع مثلا) ٣. يفضح، يشهر ب ٤. (تصوير) يعرض الفلم للضوء

**exposition** /,ekspə'zɪʃn/ *n* [C,U] ١. ڕوونكردنەوە، خستنە ڕوو، نیشانگە، ڕاڤەكرن، شیكردنەوە، شروڤە كرن ٢. پیشاندان، نمایش كردن، پەنگزانون

١. شرح، تفسير، تعليل ٢. عرض، معرض

**expostulate** /ɪk'spɒstʃʊleɪt/ *vt* شكات دەكات، بەرهەڵستی دەكا، گلەیی دەكات (بەشێوەیەكی جوان) سەرزەنشتی ئەكا

يحتج، يعترض على، يعاتب (باسلوب ودي)

**exposure** /ɪk'spəʊʒə(r)/ *n* [C,U] پیشاندان، خستنەڕوو، كەوتنەبەر، دەركەوتن، ڕیسواكردن، داخوران

عرض، تعرض، اظهار، تعرية

**expound** /ɪk'spaʊnd/ *vt* بەرەڤانی دكت، ڕوونی ئەكاتەوە

يشرح، يفسر

~ *the Scriptures* كتێبی پیرۆز ڕوون ئەكاتەوە

يفسر الكتاب المقدس

~ *a theory* ئاسانی ئەكات، بیردۆز پێشكەس دەكات

يبسط / يقدم نظرية

**express** /ɪk'spres/ *vt* ١. دەردەبڕێت، دەردەكەوێت

١. يعبر عن، يظهر

~ *one's feelings* هەستی دەرئەبڕێ

يعبر عن مشاعره

□ *adj* ئاشكرا، ئەشكەرا، تایبەت، دیار، ڕاشكاو

واضح، جلي، صريح

*an ~ wish command* ئارەزوی نەشاراوە/ فەرمانی ئاشكرا ٢. خێرا، بەپەلە

رغبة صريحة / امر صريح ٢. سريع، مستعجل

*an ~ train* شەمەندەفەری خێرا

قطار سريع

*an ~ messenger/letter* پەیامبەر/ نێراوی خێراو پەلە

رسول / خطاب مستعجل

□ *n* [C] شەمەندەفەری خێرا

قطار سريع

□ *adv* بەپەلە، بە شەمەندەفەری خێرا

بالسرعة الاستثنائية، بالقطار السريع

**expression** /ɪk'spreʃn/ *n* [C,U] ١. دەربڕین، ڕوونكردنەوە، دیاركرن

١. تعبير، ايضاح

*give ~ to one's gratitude* سوپاسگوزاری خۆی دەرئەبڕێ

يعبر عن عرفانه بالجميل / امتنانه

*a polite ~* ٢. (وشە، دەستەواژە) ژیرانە، بژارە، ڕێزدار ٣. دەربڕین، ڕواڵەت، دیاركرن

٢. (الكلمة، العبارة) مهذبة ٣. تعبير، سيماء، ملامح

**expressive** /ɪk'spresɪv/ دەربڕیندار

معبر، تعبیری
روانینێك نیشانەی بێزاری بوو *looks that were ~ of despair*
نظرات کانت تعبر عن الیأس

**expulsion** /ek'spʌlʃn/ *n* [C,U] دەرکردن، دەرنانین، دورخستن
طرد، اقصاء، ابعاد

**expurgate** /'ekspəgeɪt/ *vt* بژارئەکات، بژین دکت، کتێبەکە بژارئەکا، پوختی ئەکا
یهذب ینقح (کتابا) لیحذف منه ما یمس بالفضیلة
چاپی باش *an ~d edition*
طبعة مهذبة

**exquisite** /'ekskwɪzɪt/ *adj* ١. نایاب، بژارە، جوانێتی، دلگر ٢. (ئازار، خۆشی) تیژ، بەهێز، بەتین ٣. (توانا و هەست) تیژو وورد
١. ممتاز، فائق، متقن ٢. (الالم او البهجة) حاد، شدید ٣. (القدرة علی الاحساس) حاد، رقیق، دقیق

**extant** /ek'stænt/ *adj* ماوە، لە ژیانایە، هێشی هەیە
موجود، باق، علی قید الحیاة

**extend** /ɪk'stend/ *vt, vi* ١. فراوان دەکات، ئاسان دەکات، بلاوی دەکاتەوە، درێژەی پێ ئەدات ٢. ئەبەخشێ، پێشکەش دەکات
١. یمد، یمتد، یبسط، ینتشر، ینشر، یطیل ٢. یمنح، یقدم
دەعوەت ئەکات، بانگێشە ئەکات/ دەستی یارمەتی بۆ کەسێ درێژ دەکات *~ an invitation/one's hand to sb* ٣. درێژ ئەکا، ئاوەلای ئەکا (دەستی، قاچی) نایتوانی ٤. (زەوی، جێگا) درێژئەبێتەوە
یقدم دعوة / یده لشخص ما ٣. یمد، ینشر (یدیه او رجلیه) الی ابعد مدی ٤. (الارض، المکان) یمتد، یصل
زەویەکە بە سەدەها میل درێژ ئەبێتەوە. *land ~ing for hundreds of miles*
ارض تمتد مئات الامیال

**extension** /ɪk'stenʃn/ *n* [C,U] درێژ کردن، فرەهکرن، درێژە، پاشکۆ
اضافة، مضاف، ملحق
پاشکوێ ئوتێل *an ~ to a hotel*
ملحق لفندق

**extensive** /ɪk'stensɪv/ *adj* فراوان، پان، کەلەمپەر، فرەه
واسع، شامل، شاسع

**extent** /ɪk'stent/ *n* [U] ١. مەودا، بوار، قەوارە، رووبەر، پارچەیەکی پان ٢. پلە، سنوور
١. مدی، مجال، مساحة ٢. درجة، حد
بەشێك، تارادەیەك *to a certain ~*
جزئیا، الی حد ما

**extenuate** /ɪk'stenjʊeɪt/ *vt* هێوری ئەکاتەوە، مەترسی کەم ئەکاتەوە، سفك، نەرم دکت
یلطف، یخفف من شدة او حدة شیء (خطورة جریمة مثلا)

**extenuation** /ɪkˌstenjʊ'eɪʃn/ *n* [C,U] نەرم کردن، سوك کردن، کەمکردن
تلطیف، تخفیف، تبریر جزئی

**exterior** /ɪk'stɪərɪə(r)/ *adj, n* [C] دەرەوە، رووکەش، دەرڤە، دەرەکی
خارجي، الخارج، السطح الخارجي

**exterminate** /ɪk'stɜːmɪneɪt/ *vt* بنەبری ئەکات، لەناوی ئەبات، قوت دکت، قردکت، قەلاچۆی ئەکات
یستاصل، یفنی، یبید

**extermination** /ɪkˌstɜːmɪ'neɪʃn/ *n* [C,U] بنەبر کردن، نەهێلان، قەلاچۆ، قرکردن
استئصال، افناء، ابادة

**external** /ɪk'stɜːnl/ *adj* دەرەکی، دەرڤەیی، بۆ بەکارهێنانی دەرەکی
خارجي، ظاهري، للاستعمال الخارجي

**externally** *adv* لە دەرەوە، ژدەرڤە
خارجیاً، سطحیاً

**extinct** /ɪk'stɪŋt/ *adj* ١. دامرکاو، کوژاوە، لەناوچوو، دوابران، مری
١. هامد، منطفیء، خامد
گرکانی کوژاوە، دامرکاو ٢. لەناوچوو، فەوتاو، نەماو *an ~ volcano*
برکان خامد ٢. منقرض، بائد
جۆر/ رەگەزی دوابراو *an ~ species*
نوع / جنس منقرض

**extinction** /ɪk'stɪŋkʃn/ *n* [U] برانەوە، فەمرین، نەمان، دامرکان
انقراض، خمود

**extinguish** /ɪk'stɪŋgwɪʃ/ *vt* ١. دەکوژێنێتەوە، ئاگر دەکوژێنێتەوە ٢. دادەرمێنێت، لەدکوژێت، لە ناوی ئەبا (هیوا، خۆشەویستی)

١. يطفىء، يخمد (النار) ٢. يدمر، يحطم، يقضي على (الامل، الحب)

**extinguisher** *n* ئاگر کوژێنەرەوە، لەکوژ، لەمرکەر

جهاز لاخماد النار، مطفأة

**extol** /ɪk'stoul/ *vt* (-ll-) مەزنی ئەکات، پەسەندی ئەکات، مەزن دکت، پەسن دکت

يمجد، يفرط في المديح

**extort** /ɪk'stɔ:t/ *vt* بەزۆر لێی ئەسێنێ، ئەیفڕێنێ، داگیری ئەکا

يغتصب، ينتزع، يبتز

**extortion** /ɪk'stɔ:ʃn/ *n* [C,U] ئەتك کردن، پچڕین، ستاندن (بە کوتەکی)، داگیرکردن

اغتصاب، انتزاع، ابتزاز

**extortionate** /ɪk'stɔ:ʃənət/ *adj* گران بەها، ستاندنا گران

باهظ شديد الارتفاع

**extra** /'ekstrə/ *adj, n* [C] سەرباز، سەرموچەك، پتر، لە سەرووی ئەمەوە

اضافي، زائد، ممتاز، فاخر

**extract** /ɪk'strækt/ *vt* ١. دەردەکێشێت، پوختەی دەکات، دەردەهێنێت، هەڵقوك (ژکتێبی) ٢. دای دەچۆرێنێ، ئەیگوشێ

١. ينتزع، يستخلص، يستخرج ٢. يستقطر، يعتصر

*~ oil from cotton-seed* ڕۆن لە تۆوی لۆکە دەردەهێنێ ٣. هەڵئەبژێرێ، دەری دێنێ لە پەراو

يستخلص الزيت من بذر القطن ٣. ينتخب، يقتبس (من كتاب مثلا)

□ /'ekstrækt/ *n* [C,U] پاڵاوتە، پوختەکراو، گوشراو گوشراوی گۆشتی گوێرەکە، دەرهێنراو، هەڵبژێراو، لێ کراوە

مستقطر، خلاصة، عصارة، عصارة لحم البقر، خلاصة

*beef ~* پوختەکردن

منتخب، مقتطف

**extraction** /ɪk'strækʃn/ *n* [U] بنەبڕکردن (بە تایبەتی خەڵك) لە بنچینە، لە وەچە، لەنەژاد

(بخاصة اشخاص) من اصل، نسب

*of French ~* لە بنچینەی فەرەنسی

من اصل فرنسي

**extradite** /'ekstrədaɪt/ *vt* تاوانبار یا ئاوارەکە ئەداتەوە بە وولاتەکەی خۆی، رادەسپێرێت

يسلم مجرماً او لاجئاً الى حكومته

**extradition** /,ekstrə'dɪʃn/ *n* [U] راسپاردنی تاوانبار بۆحکومەتەکەی، دەرکرن

تسليم مجرم الى حكومته

**extraneous** /ɪk'streɪnɪəs/ *adj* دەرەکی، نەگەوهەری، بیانی، هەڵکەتن

غريب، دخيل

**extraordinary** /ɪk,strɔ:dnrɪ/ *adj* سەرئاسا، سەیر، نائاسایی، گێرە، ئاوارتە

استثنائي، مدهش، خارق للعادة

**extravagance** /ɪk'strævəgəns/ *adj, n* [C,U] بەفیرۆدان، لەناوبردن، زیادە ڕۆیی کردن

تبذير، اسراف، تطرف

**extravagant** /ɪk'strævəgənt/ *adj* ١. دەست بڵاو، زەهیکەر، دەست بەردایی ماڵبە لاف

١. مبذر، مسرف، متلاف

*~ habits* ٢. نەریتی بەهادار (بیرورا، قسە، رەوشت) زیادەرەو، سەرکەش

٢. عادات باهضة التكاليف (الافكار، الحديث، السلوك) متطرف، متهور

**extreme** /ɪk'stri:m/ *adj* ١. سەرپەڕ، ئەوپەڕ، کۆتایی، سەرچڵ ٢. بەرگر، تادوامەودا، زۆر، دژوار

١. طرف، اقصى، نهاية ٢. شديد، بالغ، الى اقصى حد

*~ patience* پشووی بێ پایان

صبر لامتناهي

*~ danger* مەترسی زۆر (ئەوپەڕ)

خطر بالغ

*in ~ pain* بە ئازاری سەختەوەدەتلێتەوە ٣. (کەس، بیرو را) توندرەو، نالەبار، ئەوپەرگیر

يعاني من الم مبرح ٣. (الاشخاص، افكارهم) متطرف، غير معتدل

*hold ~ opinions* هەڵگری بیرورای زۆر لە ڕادەبەدەر

يحمل اراء متطرفة

*~ measures* هەڵسوکەوتی توندڕەوی

اجراءات متطرفة

پلەی کۆتایی یا بەرزی □ *n* [C]

درجة نهائية او قصوى

گەلەك جیاوازی لە پلەی *the ~s of heat and cold* گەرماو ساردی دا هەیە

النقيض: النقيضان من الحرارة والبرودة

زیادەرەوی دەکات، هەڵسوکەوتی توندرەوی *go to ~s* ئەگرێتە بەر

يفرط، يشتط، يغالي، يتبنى اجراءات متطرفة

**extremist** *n* [C] توندرەو، زیادرەو

المتطرف، متطرف

**extremity** /ɪk'stremətɪ/ *n* [C] (*pl* -ties) ١. لا، کۆتایی، سنور، بەشەکانی لەش ٢. بەرزترین پلەی (خۆش، ناخۆش)

١. طرف، نهاية، حد (في صيغة الجمع) الاطراف، اطراف الجسم ٢. اقصى درجات (الفرح، التعاسة)

یارمەتی هاوڕێکەی لە کاتی *help friends in ~* تەنگانەدا ئەدات ٣. کارێکی زۆر زەحمەت

يساعد اصدقائه في وقت الشدة ٣. (في صيغة الجمع) عمل او اجراء في منتهى القسوة

**extricate** /'ekstrɪkeɪt/ *vt* رزگاری ئەکات لە (ناڕەحەتی، مەترسی)، رزگاردکت

يخلص من (شدة، خطر)

**extrinsic** /ek'strɪnsɪk/ *adj* (سیفەت، بیروباوەڕ) لاوەکی، نابنەڕەتی، دەرەکی، (بەراورد *intrinsic*)

(الصفات، القيم) عرضي، غير جوهري، خارجي، ظاهري (قارن *intrinsic*)

**extrovert** /'ekstrəvɜ:t/ *n* [C] / کەسێکی سادەو ساکار / کەسێکی کەیف خۆش، دەرفەیی‌خو، کەسێ‌هزر

شخص منبسط / غير منطو على نفسه

**exuberance** /ɪg'zu:bərəns/ *n* [U] زۆری، زرنگی، مشەیی، پر چالاکی و زیندەگی ١. زۆر، گەلەك، زرنگ

وفرة، غزارة، ترف، امتلاء بالحيوية والنشاط ١. وافر، غزير، مترف

**exuberant** /ɪg'zju:bərənt/ *adj* ٢. چالاك، چوست

٢. مليء بالحيوية والنشاط

**exude** /ɪg'zju:d/ *vt, vi* دادەچۆڕێ، بەلاڤ دکت، دەرد کەڤت

يتحلب، يتفصد

ئارەق لە کونوچکەی *Sweat ~s through the pores.* پێستەوە دەرئەچێ

عرق يتفصد من المسام

**exult** /ɪg'zʌlt/ *vi* زۆر دڵخۆش ئەبێ، ئەفڕێ لە خۆشیدا

يبتهج إبتهاجاً بالغا، يطير فرحا

**exultant** *adj* شاد، دڵگەش، بەختیار

جذل، مبتهج

**exultation** /ˌegzʌl'teɪʃn/ *n* [U] شادی، شادبوون، هەڵشابوون

جذل، ابتهاج، تهلل

**eye** /aɪ/ *n* [C] ١. چاو، چاڤ

١. عين

*see ~ to ~ (with sb)* لە بۆچوون دا رێك ئەکەوێت لە گەڵیا

يتفق معه اتفاقا تاما في وجهة النظر

*have an ~/a good ~ for* چێژی لێ‌ئەبینێ، بەباشی هەڵی ئەسەنگێنێ

يتذوق، يحسن التمييز

*with an ~ to* خوازیارە، تێ ئەڕوانێ

يتطلع الى، يامل في

*keep an ~ on* چاودێری ئەکات

يراقب بعناية، يرعى

*make ~s at* بە چاوی خۆشەویستی سەیری ئەکات، چاوبازی ئەکا ٢. کونی دەرزی، شتێکی وەك چاو کە لێوەی ببینرێ

ينظر بمحبة، يشاغل بعينيه ٢. ثقب الابرة شيء كالعين

□ *vt* سەیری ئەکات، تێبینی‌ئەکات، تێـەڕوانێ، چاودێری ئەکات

ينظر الى، يحدق في، يراقب

**'eyeball** *n* [C] گلێنەی چاو، تەپك یان توپکا چاڤی

مقلة العين

**'eyebrow** *n* ئەبرۆ، برۆ، بروانە *brow*

حاجب العين (انظر *brow*)

**'eyelash** *n* [C] مژگان، برژانگ، مژە، مژیلانك

هدب (اهداب) الجفن

**eyelet** /'aılıt/ *n* [C] کونی بچووك (کونی پێڵاو بۆ قەیتان)

ثقب صغير (يدخل منه شريط الحذاء مثلا)

**'eyelid** *n* [C] چەرمك، پێڵو، قەپولك یان بەری چاڵێ

الجفن، جفن العين

**'eyesight** *n* [U] بینین، بواری دیتن

ابصار، مدى البصر

**'eyesore** *n* [C] شتێکی خراپ، کرێت، ریۆقی چاو

شيء قبيح، قذى للعين

**'eyewitness** *n* [C] شایەت، بینەر، گواهنە خاسمە، گواهبین

شاهد عيان

# F

**F,f** /ef/ (*pl* f's /efs/) شەشەم پیتی ئەلفبێی ئینگلیزی
الحرف السادس من الابجدية الانكليزية

**fable** /ˈfeɪbl/ *n* [C] ١. ئەفسانە چیرۆك، چیڤانۆك، ٢. درۆوودەلەسە، ٣. راپۆرتی هەڵە
١. خرافة، اسطورة (عادة ذات مغزى) ٢. اكذوبة ٣. تقرير خاطىء

**fabled** *adj* هەڵبەستراو، ئەفسانەیی
١. خرافي، أسطوري

**fabric** /ˈfæbrɪk/ *n* [C,U] ١. پاتاڵ، کوتاڵ، سیپاڵ، ٢. ئاڤاهی، بنیات
١. قماش، نسيج ٢. بناء، بنية

**fabricate** /ˈfæbrɪkeɪt/ *vt* دای ئەنێ، چاکی ئەکا، چێدکت، ئاڤادکت، هەڵی ئەبەستێ، دای ئەهێنێ
يؤلف / يخترع قصة (كاذبة) يلفق

**fabrication** /ˌfæbrɪˈkeɪʃn/ *n* [C,U] دروستکردن ساختە، هەڵبەستراو شڵتاقی
إختلاق، تلفيق

**fabulous** /ˈfæbjuləs/ *adj* ئەفسانەیی، ستەمە بڕوای پێ بکرێ
اسطوري، خرافي، يصعب تصديقه

~ *wealth* سامانی خەیاڵی
ثروة خرافية

**facade** /fəˈsɑːd/ *n* [C] ڕووی خانوبەرە، بەری ئاڤاهیێ
واجهة مبنى

**face** /feɪs/ *n* [C] دەم و چاو، ڕوو
١. وجه

*make / pull a ~ (at)* دەم وچاوئەدا بەیەکا، پێکی ناهێنێ، ڕووگرژ ئەکا
يتعبس، يبدو مكتئبا

*save (one's) ~* ڕێزی خۆی ئەپارێزێ / حورمەتی خۆی دەگرێ
يحفظ ماء وجهه

*lose (one's) ~* خۆی ڕوزەرد ئەکات، نیانی خۆی ناهێڵێ
يفقد كرامته، يريق ماء وجهه

*~ to ~* ڕووبەڕوو، بەرامبەر، بەرهەف
وجها لوجه

*put a good ~ on (sth)* شتێك بەباشی لەقەڵەم ئەدا، ئازایانە بەرەنگاری ئەبێ
يجعل الشيء يبدو اقل سوء، يواجه بشجاعة

*keep a straight ~* لەژێرلێوە وەئە خەنێ، پێ نەکەنێ
يخفي ضحكه

*the ~ of a coin* ٢. ڕووی شتێکی فرەڕوو یان لا، ڕووی پارە ٣. دیمەنی دەرەوەی
٢. وجه لشيء متعدد الوجوه، سطح، جانب، وجه العملة ٣. المظهر الخارجي

*on the ~ of it* ئەوەی لەڕوالەتدا دیارە
في الظاهر مما يبدو

□ *vt, vi* ١. بەرەنگاری ئەبێتەوە، ڕووبەڕووی ئەبێتەوە، ڕووبەڕووی ئەبێتەوە
١. يواجه، يتجه الى، يجابه

*~ the music* ترس و تۆقین دەرناخات لەکاتی مەترسیدا
لايظهر خوفا / هلعا في وقت الخطر

*~ it out* خۆی نادا بەدەست نەیارەکانەوە ٢. ڕووی ئەگرێ بەمادەیەك کە دای ئەپۆشێ
يرفض الاستسلام للمعارضة ٢. يغطي بطبقة من مادة اخرى

*a wall ~ d with concrete* دیوارەکە بەچیمەنتۆ سواغ

صورة مطابقة (لكتابة مثلاً)

**fact** /fækt/ *n* [C] ڕاستی (بویەر) لەشێوەی تاك بێ ئامرازی نەرێ
حقیقة، (في صيغة المفرد دون اداة التنكير)، واقع

*in point of ~* ڕاستی، لەڕاستیدا،
في الحقيقة، في الواقع

*as a matter of ~* هەرچۆن هەیە
بطبيعة الحال

**faction** /ˈfækʃn/ *n* [C] ١. کۆمەڵە، بەند، پارت، (وەك لایەنی سیاسی) تاقم، دەستە ٢. ناکۆکی، شەڕی لایەنی، پارتایەتی
١. زمرة، جماعة منشقة (عن حزب سياسي مثلاً) ٢. نزاع، صراع حزبي

**factious** /ˈfækʃəs/ *adj* شەڕخواز، دووبەرەکی
حزبي، مثير للنزاع، للشقاق

**factor** /ˈfæktə(r)/ *n* [C] کۆلك، کارا، کۆلکە، هۆ، هۆکار، لێدراو یا لێکدراو، ئەوهۆکارەی کەئەتوانین بەهۆیەوە ژمارەی گەورەترمان دەست کەوێت
عامل، عنصر، سبب، مضروب او مضروب فيه، العامل الذي يمكن بواسطته تحليل رقم اكبر

*the ~s of 12 are 2, 3, 4, 6* ئەوکۆلکانە ژمارە (١٢) شیئە کەنەوە ٢، ٣، ٤، ٦
العوامل التي تحلل بها الرقم (١٢) ٢، ٣، ٤، ٦

*the ~s behind his success* ٢. کارای یاریدەدەر، هۆکارەکانی سەرکەوتنی
٢. عامل مساعد، العوامل المؤدية الى نجاحه

**factory** /ˈfæktərɪ/ *n* [C] کارگە، کارخانە، پاڵگە
مصنع

**factual** /ˈfæktʃʊəl/ *adj* ڕاستی، پشتی بەڕاستی بەستووە
حقيقي، مبني علي الحقائق

**faculty** /ˈfækltɪ/ *n* [C] (*pl-ties*) ١. توانا، بەهرە ٢. توانای هەستی (وەك بیستن یا بینین)، لەش، شیان، هێز ٣. کۆلیج (بەشێکەلە زانکۆ)، دەستەی وانەبێژانی کۆلیج
١. قوة عقلية، ملكة ٢. قدرة حسية (كالسمع او البصر مثلاً) ٣.كلية (جزء من جامعة)، (هيئة تدريس في كلية)

*the F ~ of Law* کۆلیجی یاسا (ماف)
كلية الحقوق

**fad** /fæd/ *n* [C] جل، باو، مۆدە، پەرۆشی کاتی

دراوە
حائط مغطي بطبقة من الإسمنت

**face-cloth** *n* [C] ووشك کەرەوە / پەچە
منشفة / فوطة للوجه

**face-cream** *n* [C] کرێمی دەم وچاو (بۆجوانکاری)
كريم للوجه (من مستحضرات التجميل)

**face-lift** *n* [C] پێست ڕاکێشان بۆلابردنی چرچی دەموچاو، گەنج کردنەوە / تازەکردنەوە
عملية شد جلد الوجه (لازالة التجاعيد)، (مجاز) عملية تجميل / تجديد شباب شيء

**facet** /ˈfæsɪt/ *n* [C] ڕوو، لا، ڕویەك لەڕووەکانی گەوهەر
جانب، سطح من عدة اسطح لجوهرة

**facetious** /feˈsiːʃəs/ *adj* گاڵتە، قسەی خۆش بۆپێکەنین
ساخر، طريف (يقصد به الضحك)

**faci** *adj* ڕوویی
وجهي

**facial** /ˈfeɪʃl/ *adj* ڕوی ڕواڵەتی، پەیوەندی بەڕووەوەیە
وجهي (خاصة بالوجه)

**facile** /ˈfæsaɪl/ *adj* ١. ئاسان، سووك ڕۆیی، نەرم، چەلەنگ ٢. (کەس) بەئاسانی کار ساز ئەکا، سوك ئەیێ لای، (نوسین، ئاخافتن)، دروست کردنی بێ هیلاکی
١. سهل، ميسور ٢. (الشخص) يستطيع أداء الأشياء بسهولة (الكتابة، الحديث) صنع دون جهد او عناية

**facilitate** /fəˈsɪlɪteɪt/ *vt* ئاسان ئەکات، سووکی دەکات، زووئەدات بەدەستەوە
يسهل، ييسر، يبسط

**facility** /fəˈsɪlətɪ/ *n* [C,U] ١. ئاسانی، شەهرەزایی، نەرمی، سوکی ئەکا ٢. (لەشیوگ کۆ) ئاسان کاری، هۆکاری یاریدەدەر
١. سهولة، يسر ٢. (في صيغة الجمع) تسهيلات، عوامل مساعدة

**facing** /ˈfeɪsɪŋ/ *n* بۆیاخ، بۆپاراستن، جوانی، ڕوویە ڕوو بوون زڵرین، هسین، ڕۆبەری، پێشبەر
طلاء (للوقاية او الزينة)، يواجه

**facsimile** /fækˈsɪməlɪ/ *n* [C] ڕۆنفیس، ڕوونوس، وێنەی دەقاودەق

موضة، حماس مؤقت

**faddy** *adj* ئارەزوی خواردن، پەرۆشی کاتی

ذوذوق غريب في الطعام، مليء بحماس مؤقت

**fade** *vt, vi* ١. دەپوکێتەوە، ئەوەرێ ٢. وورده وورده نامێنێ، لەبیرئە چێتەوە

١. يخبو، يبهت، يذبل ٢. يختفي تدريجيا (من الرؤية او الذاكرة مثلاً)

**fag** /fæg/ *vi, vt* (-gg-) هیلاك ئەكا، ماندو ئەبێ، خۆی ماندو دەكا

يتعب، يسبب الارهاق، يرهق نفسه

□ *n* لەشێوگی تاكدا، كاری قورس، جگەرە

في صيغة المفرد عمل شاق (عامية) سيجارة

**faggot** /ˈfægət/ *n* [C] گورزەیەك، پێچراوێك لە گۆچان یان تولی ئاسن

حزمة، ربطة من العصي او القضبان الحديدية

**fahrenheit** /ˈfærənhaɪt/ *n* فەهەرنهایەتی، پلەی بەستن، ٣٢ کولاندن ٢١٢، (بەراورد بکە بە سستمی سەدی)

فهرنهيت، مقياس حرارة تكون فيه درجة التجمد ٣٢ والغليان ٢١٢ (قارن نظام القياس المئوي)

**fail** /feɪl/ *vi, vt* دەكەوێت، دەرناچێت

يفشل، يرسب

*~ to pass an examination* ١. دەرناچێت لەتاقیکردنەوە ٢. بەشی ناكات، كۆتایی ٣. (ئەزمونكەر) دەرناچێ، ئەكەوێ

١. يرسب في الامتحان ٢. لايكفي، ينتهي ٣. (الممتحن) يسقط، يقرر رسوب

*water supplies that ~ed because of the hot summer* پێداویستی ئاوهێنان دەست ناكەوێ بەهۆی گەرمی هاوینەوە ٤. (تەندروستی، بینین) لاواز ئەبێ ٥. (كردنی شتێك) پشت گوێ ئەخرێ ٦. نابووت ئەبێ، پارەی لەكیس ئەچێ ٧. هەڵی ئەخەڵە تێنن

امدادات المياه التي نفذت بسبب حرارة الصيف ٤. (الصحة، البصر، الخ) يضعف، يهزّل ٥. يهمل (اداة شيء) ٦. يفلس، يضيع ماله ٧. يخذل

*Don't rely on him, he* پشتی پێ نەبەستی

لاتعتمد عليه

*may ~ you* تەنها هەڵت ئەخەڵە تێنێ

نقد يخذلك

□ *n without ~* بێ گومان، پشت راست

فقط (في التاكيد)

[1]**failing** /ˈfeɪlɪŋ/ *n* [C] لاوازی، خەوش، هەڵە

ضعف، عيب، خطأ

[2]**failing** /ˈfeɪlɪŋ/ *prep* بەبێ (لەكاتی نەبوونی شتێك)

بدون (في حالة عدم وجود شيء)

*~ an answer* ئەگەر وەڵامی نەبوو

اذا لم تكن هناك اجابة

**failure** /ˈfeɪljə(r)/ *n* [C,U] سستی، سەرنەكەوتن، نائومێدی پەككەوتن، نوشستی، رۆساری

فشل، اخفاق، رسوب

**faint** /feɪnt/ *adj* (-er, -est) ١. كاڵ، نادیار، دڵ بورێن، بێ هۆشی

١. باهت، غير واضح، مطموس

*feel ~* ٢. هەست بەبێهۆشی ئەكا

٢. يشعر بأعماء

□ *vi* دەبوورێتەوە، بێهۆش دەبێ

يغمي عليه

□ *n* بوورانەوە، بێهۆش بوون

اغماء، فقدان الوعي

**faint [1]hearted** /feɪnt/ *adj* ترسنۆك

جبان

[1]**fair** /feə(r)/ *adj* ١. دادوەر، هەقانی، ٢. گونجاو، باش، ٣. جوان، پاك، تازە، نوێ

١. عادل، منصف ٢. مناسب، جيد نوعا ما ٣. جميل، تنظيف

*a ~ share* بەشێكی یەكسانە، گونجاو لەبار، دادوەر، راست، رەوا

نصيب عادل، مناسب جيد نوعا

*a ~ chance of success* هەلێ بۆ، سەركەوتن ٣. كەش (خۆش، فێنك) بای هاتوو ٤. قژ، پێست، كاڵ ٥. رەنگ جوان، رەگەز، نیان (بۆ ژنان)

فرصة معقولة للنجاح ٣. الطقس (جميل، صاف) الرياح مواتية ٤. (الشعر، البشرة) اشقر فاتح اللون ٥. (أ.ق) جميل

*the ~ sex* رەگەزی جوان (بۆ ژنان) نەرم و نیان

الجنس اللطيف (النساء)

*~ copy* چاپكراوێكی خاوێن / پاكنوس

نسخة نظيفة

□ *adv* بەرێگە یەك بگونجێ لەگەڵ دەستوردا

بطريقة تتفق مع القواعد

لەهەڵسوکەوتدا پابەند بەدەستوورەوە ماوە ~ *play*

يلتزم بالقواعد في تصرفاته

**²fair** /feə(r)/ *n* [C] ١. بازار (بۆفرۆشتنی بەروبوومی کشتوکاڵی) ٢. پێشانگای گەورە

١. سوق (عادة للمنتجات الزراعية) يعقد في فترات منتظمة ٢. معرض كبير

**fairly** /ˈfeəlɪ/ *adv* ١. دادوەرانە، رەوایی، ئاشکرایی ٢. مام ناوەندی، بەشێوەیەکی باش

١. بالعدل ٢. بأعتدال، بشكل معتدل يتكلم الأنكليزية بشكل جيد

بەزمانی ئینگلیزی ئەدوێ *He speaks English ~ well*

**facultative** هەڵبژێری، خوازەکی، هشی

اختياري

**faeces** *n* گوو، پیسایی، پاشەڕۆ

غائط، براز

**fairness** /ˈfeənɪs/ *n* [U] ٢. دادپەروەری، داد، کەژی

٢. عدل، اعتدال

**fairy** /ˈfeərɪ/ *n* [C] (*pl*-ries) پەری، ئەفسانە، (جنۆکە، خێوی) باش لەوەی کە یارمەتی مرۆڤ ئەدا

(جنية) (من النوع الطيب الذي يساعد الانسان)

~ *tale* ١. چیرۆکی ئەفسانەیی، پەری گووتی ٢. چیرۆکی خەیاڵی

١. من قصص الجنيات ٢. قصة خيالية

**faith** /feɪθ/ *n* [C,U] ١. دڵنیایی، باوەڕ، متمانە، بڕوای قووڵ، پەرم، پەرمینەوە

١. ثقة، ايمان عميق

*put one's ~ in God* باوەڕی هەیە بەخوا ٢. بیروباوەڕ، ئاین، ٣. بەڵێن

يضع ثقته في الله ٢. عقيدة ديانة ٣. وعد

*keep ~ with sb* ٣. لە بەڵێنەکەی دا

يفي بوعده له

*in good ~* بەوەفایە، ٤. بەدڵسۆزی

٤. بأخلاص، يحسن نية

*in bad ~* بەنیەتی خراپ، بەد نیاز

بسوء نية

**faithful** /ˈfeɪθfl/ *adj* ١. دڵسۆز، وەفادار، ٢. ڕاستگو

١. مخلص، وفي، ٢. صادق، حقيقي، واقعي

ڕاستی باوەڕکار پیاهەڵدانی ڕاستگۆیی *a ~ description*

وصف صادق

**faithfully** *adv* بەدڵسۆزی، بەڕاستی، بە ئەمەکی

بأخلاص، بصدق

**faithless** /ˈfeɪθlɪs/ *adj* پیسۆز، ناپاك، غەدرکەر، بێ ئەمەك

غادر، خائن مزيف

**fake** /feɪk/ *vt* باسێك یان کارێکی هونەری هەڵدەبەستێ وەك ئەوەی ڕاست بێ، زردکت، قەڵب دکت

يزيف (يلفق) قصة او عمل فني مثلا ليبدو كانه حقيقي

کارێکی ساختە *n* [C]

عمل مزيف

**falcon** /ˈfɔːlkən/ *n* [C] باز، لاچین، شەهباز، هەڵۆ، شاهێن

صقر

**fall** /fɔːl/ *vi* (*pt* fell /fel/, *pp* ~ *en* /ˈfɔːlən/)

~ *flat on one's face*

١. دەکەوێتە خوارەوە، دادکەفت، نزم دبت ئەروخێ بەسەریا، بەڕویا ٢. (قەڵا، شار) ئەروخێ ٣. خۆئەدات بەدەستەوە، دائەرمێ ٤. بریندارئەبێ وئەکەوێ لەجەنگدا ٥. ڕێئەکەوێت، ئەگونجێ، ڕووئەدات

١. يقع، يسقط على وجهه، ٢. (قلعة او مدينة) يسقط في الحرب، ينهزم ٣. يستسلم للاغراء، ينهار ٤. يسقط جريحاً او قتيلاً في المعركة ٥. يصادف، يوافق، يحدث

ڕێکەوتی جەژنی *Christmas Day ~s on a Saturday* لەدایك بوون ڕۆژی شەممەیە

يوافق يوم عيد الميلاد السبت

~ *in love (with)* ئەکەوێتە خۆشەویستیەوە

يقع في حب (كذا)

~ *asleep* ئەخەوێ، خەوی لێدەکەوێ، وەنەوزئەدا

ينام، يغلبه النعاس

~ *short* کورتی ئەکاتەوە، ناتەواوی ئەکا ٦. (لەگەڵ (*prep*

ينقص، يكون غير كاف ٦. (مع *prep*، *adv*

~ *back* پاشگەز ئەبێتەوە، دەکشێتەوە، پاشقە دچت

يتراجع، يتقهقر

~ *back on* پەنا ئەباتە بەر، ئەیقۆزێتەوە، لەشتێك کەڵك وەرئەگرێ

يلجأ الى، يستغل شيئا، يستفيد من شيء

~ behind جێ ئەمێنێ / دوا ئەکەوێ پاشەدەمێنێت

يتخلف / يتأخر عن

~ behind with payments دوائەکەوێ لەقەرزدانەوەی

يتاخر في تسديد ما عليه

~ in (لەسوپا) بە ریز ئەوەستن، (لەشکری)

(في الجيش) يصطف، يقف بالصف

~ in with رێك ئەکەوێ لەگەڵیا، پێك دەهێنێت، توشی ئەبێ

يتفق مع (خطة شخص مثلاً) يصادف

~ off کەم دەکاتەوە، بچوك دەبێت

يقل، ينقص

~ on هێرش دەبا، هێرش دبت

يهاجم (العدو) ينقض عليه

~ out دەچێت بەگژیا، شەری

يتشاجر مع

It fell out that ... رێکەوتی ئەکا

تصادف ان

~ through توشی‌ئەبێ نامێنێ، کۆتایی پێ دێت

ينفذ، ينتهي

~ to دەست پێ دەکات، بناغە لێ‌دەدات

يبدا، يشرع في

□ n [C] ١. کەوتن، روودان ٢. لەئەمریکا (پاییز)

١. سقوط، وقوع ٢. (في امريكا) الخريف

the Niagara F ~ s ٣. (لەشێوگی ئاوی نیگارا) ٤. بری باران یان بەفرکە باریوە

٣. (في صيغة الجمع) مساقط مياه: شلال، شلالات نياجرا ٤. الكميات المتساقطة من مطر او ثلوج

**fallacious** /fəˈleɪʃəs/ *adj* نارەوا، هەڵە، خاپین

خاطيء

**fallacy** /ˈfæləsɪ/ *n* (*pl* -cies) بیروڕای هەڵە، دیاردەیا خاپین، چەوتی، بیرۆکەی هەڵە

اعتقاد خاطيء، فكرة خاطئة

**fallible** /ˈfæləbl/ *adj* هەڵەبار، چەوتبار

معرض، عرضة للخطأ

**fall-out** /ˈfɔːlaʊt/ *n* [C] تۆزی گەردیلەیی

الغبار الذري

**fallow** /ˈfæləʊ/ *adj, n* [U] زەوی (کێڵراوەو نەچێنراو)، زەوی بەیار، نەچاندی

ارض (محروثة لكن لم تزرع بعد)

**false** /fɔːls/ *adj* ساختە، هەڵبەستراو، ناراست، ساختە، قەڵب، هەڵە

مزيف، غير حقيقي، زائف، خاطيء

~ ideas بیروڕای درۆ

افكار زائفة

~ teeth ددانی دەستکرد، زرددان

اسنان صناعية

□ *adv* play sb ~ گزی ئەکات، فێڵ

يخدع، يغش

be ~ to him ئەکات ناپاکی ئەکا، ستەم ئەکا

يخون، يغدر به

**falsely** *adv* بەدرۆ، بەفێڵ

بشكل زائف

**false-hood** /ˈfɔːlshʊd/ *n* [C] فێڵ، درۆ، چورت، شلتاقی، دەلەسە

زيف، كذب اكذوبة

**falloplantube** جۆگەی هێلکەدان

قناة فالوبي

**falsetto** /fɔːlˈsetəʊ/ *n* دەنگی بڵند، قیژە

(*pl* ~ s /-təʊz/) دەنگی کەسێك زۆر بەرز دروستکراوێ

صوت شخص مرتفع جدا بشكل مصطنع

**falsification** /ˌfɔːlsɪfɪˈkeɪʃn/ *n* [C,U] ساختە کردن، بەدرۆ کردن، قەڵپکردن، زر کردن، بەدرۆخستنەوە

تزييف، تزوير، تكذيب

**falsify** /ˈfɔːlsɪfaɪ/ *vt* (*pt, pp* -fied)

١. درۆهەڵدەبەستێت، ساختە ئەکا، شت هەڵەبەسێ

١. يزور، يزيف، يختلق (قصة مثلاً)، يكذب، يدحض

~ fears / hopes ٢. بروابەترسان / هیواکانی ناکرێ

٢. لاتصدق مخاوفه / آماله

**falter** /ˈfɔːltə(r)/ *vi, vt* (دەنگ) دەلەرێتەوە لەوەشین، زمانگیران

(الصوت) يترنح، يتدهج، يتعلثم

**falxcerebri** دابری مێشکە لوو

منجل المخ

**fame** /feɪm/ *n* [U] ناوداری، ناوبانگ، ناقدار، پێگوتی

شهرة، صيت

**famed** *adj* بەناوبانگ، ناقدار
مشهور، ذائع الصيت

**familiar** /fəˈmɪlɪə(r)/ *adj* ناسراو، ئاشنا
مألوف

*~ with* ئەيناسێ، لێی ئەزانێ، چاك ناس، ئاگای لێیەتی، ئاشنایە پێی
على علم ب.. له معرفة ب...

*~ scenes* دیمەنی باو، ئاشنا ٣. نزيك، دڵسۆز
مناظر مألوفة. ٣. قريب، مقرب، حميم

*~ friend* هاوڕێی دڵسۆز، هاوڕێیەتی زۆر پتەوە
صديق حميم، مدعي او مظهر صداقة اقوى مماهي في الواقع

*too ~ with a stranger* لەرادە بەدەرلەگەڵ نەناسراودا نرخی زۆرزیاد کردووە
رافع الكلفة اكثر مما يجب مع غريب

**familiarity** /fəˌmɪlɪˈærətɪ/ *n* زانست، زانین، هۆگری،
علم، معرفة.

*n* [C,U] (*pl* -ties) ئاشنایەتی، نزیکی، سیوا
ألفة، قرب

**familiarize** /fəˈmɪlɪəraɪz/ *vt* وای لێدێت بیناسێت، ئەزانێت، رادێت لەگەڵیا، ئەیکاتە خوو، ئەیکاتە شتێکی باو
يصبح على علم ب. يعرف، يتعود على، يعتاد على، يجعل منه شيئاً مألوفاً

**family** /ˈfæməlɪ/ *n* [C,U] (*pl* -ties) ١. خێزان، ماڵیات، ٢. جۆر، توخم ٣. کۆمەڵە شتێك (رووك وئاژەڵ، زمان، هند) یەك رەگەزی، تایبەتمەندی چوون یەکیان هەبێت
١. اسرة، عائلة ٢. نسل، ذرية من ابوين، ٣. مجموعة من الاشياء (نباتات، حيوانات لغات.. الخ) لها صفات مشتركة أو اصل واحد

**famine** /ˈfæmɪn/ *n* [C,U] گرانی، برسیەتی
مجاعة

**famish** /ˈfæmɪʃ/ *vi be ~ed* لەبرسا ئەناڵێنێ، برسی ئەبێ، برسی دکت
يقاسي من جوع شديد، يجوع

**famous** /ˈfeɪməs/ *adj* ناسراو، بەناوبانگ، ناقدار، نامدار، ناودار
مشهور، شهير ذائع الصيت

[1]**fan** /fæn/ *n* [C] پانکە، باوەشێن، بازەن
مروحة

□ *vt, vi* هەوا دێنێ، باوەشێنی خۆی ئەکا، بادوەشێنێت
يهوي

*~ oneself / a fire* خۆی فێنك ئەکاتەوە/ باوەشێنی خۆی ئەکا ئاگر
يهوي على نفسه / النار

[2]**fan** /fæn/ *n* [C] شەیدا، لایەنگیر
(ل. د) معجب، نصير

**fanatic** /fəˈnætɪk/ *n* [C], *adj* دەمارگیر، توندڕەوە بۆ (ئاین)
متعصب، متحمس بشدة لشيء (خاصة ديانة)

**fanatical** *adj* دەمارگیری
تعصبي، متعصب

**fanaticism** *n* [U] دەمارگیرانە، دەماگیرێتی
تعصب

**fanciful** /ˈfænsɪfl/ *adj* بێ بناغە، نائاسایی، خوازایی، ناشوبی
خيالي، بلا أساس، غير واقعي

**fancy** /ˈfænsɪ/ *n* [C,U] (*pl* -cies) ١. خەیاڵ، تارمایی، توانی خەیاڵ کردنەوە ٢. بیرۆکە / باوەڕی بێ بنەما ٣. خۆشەویستی، حەز، ئارەزوو، خولیا
١. خيال، قدرة على التخيل / التصور ٢. فكرة / إعتقاد بلا أساس ٣. غرام، حب، رغبة

*take a ~ to sb* ئەکەوێتە داوی خۆشەویستی کەسێك
يقع في حب شخص

□ *adj* ١. (بەتایبەتی شتی بچوك) شتی جوانکردن، ڕەنگاو ڕەنگی جوان ورازاندنەوە، سەرنج ڕاکێش
١. (خاصة للاشياء الصغيرة) مزين، ملون بألوان زاهية، سار للناظرين

*~ goods* کەل و پەل جوانکاری
سلع جميلة للزينة

*~ cakes* کێکێکی جوان و نایاب
كعك فاخر

*~ dress* ٢. جلی سەیر ئاهەنگی خۆگۆڕکێ
٢. ملابس غريبة للحفلات التنكرية

*~ price* نرخی زۆر بەرز
سعر خيالي (مرتفع جدا)

□ *vt* ١. تێ ئەڕوانێ، هزر دکت ٢. حەز ئەکا، شەیدا

دەبىێ ٢. بیرۆکەی ئەفسانەیی، دروست دەکا ٤. (بۆ سەرسوڕمان) وا هەست دەکات
١. يتوهم، يتخيل، يتصور ٢. يجب، يرغب، يغرم بـ ٣. يكون فكرة خيالية ٤. (للتعجب) تصورا
~ oneself ٥. لەخۆی رازیە، بەخۆیدا ئەنازێ
٥. يفتر، يعجب بنفسه

**fang** /fæŋ/ *n* [C] کەڵەم، کەڵبە، چنگ
ناب، مخلب

**fantastic** /fæn'tæstɪk/ *adj* ١. نامۆ، خەیاڵی، سەیر، ئەندێشە
١. غريب، خيالي، وهمي
~ *dreams* خەو بینینی سەیر ٢. (بیروڕاو پلان) ئەفسانەیی، ناراست
احلام غريبة ٢. (الافكار، الخطط، الخ..) خيالي، غيرواقعي

**fantastically** *adv* بەشێوەیەکی سەیروسەمەرە، خەیاڵی، ئەندێشەیی
بشكل غريب، خيالي

**fantasy** /'fæntəsɪ/ *n* [C,U] ١. خەیاڵ، ئەندێشە ٢. خەو، شتێك وەك خەو
١. خيال، وهم ٢. حلم شيء كالأحلام

**far** /fɑ:(r)/ *adj* (شێوگی بەراورد، باڵا *farthest*، *further*) ١. دوور، لەدوورای (رەهەندی)
(صيغ *farther*، *furthest*) التفضيل والتفضيل العليا ١. بعيدا على بعد
*Did you walk ~ ?* ئایا دوور رۆیشتیت؟
هل سرت مسافة بعيدة؟
*They talked ~ into the night* مانەوە تا شەوێکی درەنگ قسەیان کرد
ظلوا يتحدثون حتى ساعة متأخرة من الليل
*in so ~ as / as ~ as* ٢. هەڵی ئەسەنگێنێ، دەیخە ملێنێ
٢. بقدر ما
*in so ~ as I am concerned* ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەیە
فيما يتعلق بي
*~ and away* بە برێکی زۆر، بە قۆناغ
بقدر كبير، بمراحل

**far-away** *adj* دوور، (تێڕوانینی کەسێك) خەوبین، خەیاڵی
بعيد، قصي (نظرات الشخص) حالم، خيالي

**far-fetched** *adj* بەبیردا نایەت، لەوانە نیە ڕووبدات
بعيد الاحتمال، غير محتمل حدوثه

**far-off** *adj* زۆر دوور، دوور
بعيد، ناء

**far-reaching** *adj* دوور، کاریگەری قوڵ
بعيدالاثر

**far-sighted** *adj* دوور بین، ژیر، زانا
بعيد النظر، حكيم

**farce** /fɑ:s/ *n* [C] ١. شانۆگەری کۆمیدی ٢. کۆمەڵە ڕوداوێکی پێکەنیناوی ٣. گاڵتە جاڕی
١. مسرحية هزلية مضحكة ٢. سلسلة من الاحداث المضحكة ٣. مهزلة

**farcical** /'fɑ:sɪkl/ *adj* ترانەیی، گاڵتینە، پێکەنیناوی
هزلي، مضحك

**fare** /feə(r)/ *n* [C] ١. کرێی گەشت (بەبەلەم، ترومبێل .. هتد) ٢. خواردن و خواردنەوە
١. أجر عن رحلة (بالسفينة، السيارة .. الخ) ٢. الطعام و الشراب
*bill of ~* لیستی خواردن (لە چێشتخانە)
قائمة الطعام (في مطعم)
□ *vi* ئەڕوا، گەشت ئەکا، بەخت دێنێ
يسافر، يرحل، يصيب حظا
*How did you ~ ?* دەستکەوتت چی بوو (لەسەر کەوتنەکەدا)؟
ماذا كان نصيبك (من النجاح)؟
*He ~d well* سەرکەوتنی بەدەست هێنا
لقد حقق نجاحا

**farewell** /,feə'wel/ *int* ماڵ ئاوایی، ئۆغری
وداعا
□ *n* [C] خوا حافیزی
وداع، توديع

**farm** /fɑ:m/ *n* [C] ١. کێڵگە، چاندنگە، دێهر ٢. خانوی لادێ (هەروەها *~ house*)
١. مزرعة ٢. بيت ريفي (ايضا *~ house*)
□ *vt, vi* ١. دەچێنێ، بەکشت و کاڵ وبەخێو کردنی ئاژەڵەوە خەریکە
١. يزرع، يتشغل بالزراعة او تربية الحيوان
*~ out (work)* ٢. شتێك ئەنێرێ بۆ ئەوەی کەسانی تر

یکەن

٢. یرسل شیئا لکي یعمله آخرون

**farmyard** *n* [C] پانو پۆری کێڵگە

فناء المزرعة

**farmer** /ˈfɑ:mə/ *n* [C] جوتیار /کشتیار، خاوەن کێڵگە، رەزقان

مزارع / شخص یدیر، یملك مزرعة

**farther** /ˈfɑ:ðə(r)/ *adv* (*far* دوورتر (شێوگی بەراوردی

(صیغة التفضیل من *far*)

*We can't go any ~ without rest* ناتوانین دوورتر لەمە برۆین تا پشونەدەین

لایمکننا التقدم ابعد من هذا دون ان نستریح

☐ *adj on the ~ bank of the river* لەکەنارەکەی تری رووبارەکە

علی الشاطیء الاخر من النهر

**farthest** /ˈfɑ:ðɪst/ *adv, adj* (*far* ئاوەڵناوی باڵایە بۆ)

(صیغة التفضیل العلیا *far*)

*Which English town is ~ from London?*

دوورترین شاری ئینگلیزی لە لەندەنەوە کامەیە؟

ماهي أبعد المدن الأنکلیزیة عن لندن؟

**farthing** /ˈfɑ:ðɪŋ/ *n* [C] (زوو) پارەی ئینگلیزی بوو یەکسان بوویە چواریەکی بنسێك / شتێکی بێبایەخ

(سابقا) عملة انکلیزیة تساوي ربع بنس، شيء عدیم القیمة

**fascinate** /ˈfæsɪneɪt/ *vt* ١. دڵ دەفرێنێت، رای دەکێشێت، دڵگیردکت ٢. لە جووڵەی ئەخا، پەکی ئەخا (وەك ئەوەی مار لەگەڵ نێچیرەکەی دەیکا)

١. یسحر، یجذب یبهر ٢. یسلب القدرة علی الحرکة (کما تفعل الثعابین بالفرائس)

**fascination** /ˌfæsɪˈneɪʃn/ *n* [C,U] دڵفران، جوان، شتێکی جوان، دڵگیر کردن، شەیدابوون

سحر فتنة، شيء فتان

**fascism** /ˈfæʃɪzəm/ *n* فاشێتی، فاشیەت

الفاشیة

**fashion** /ˈfæʃn/ *n* [C] (جل و بەرگ، رەوشت، بیروباوەر) باو، تەرز

(الملابس، السلوك، الفکر) موضة العصر

*the Paris ~ s* باو لە پاریس

موضات باریس

*styles which are in ~ / out of ~* رێبازی نوێ / کۆن

٢. (لەشیوگی تاك لەگەڵ ئامرازی ناسین و نەناسین) رێباز، شێواز

أسالیب / حدیثة، قدیمة ٢. (في صیغة المفرد مع اداة التعریف او التنکیر) طریقة، اسلوب

*behave in a strange ~* بەشێوەیەکی سەیر هەڵس و کەوت ئەکا

یتصرف بطریقة غریبة

*after a ~* بەشێوەیەك یان شێوەیەکی تری نەویستانە

بطریقة او بأخری، (غیر مرضیة تماما)

☐ *vt* دروستی ئەکا، دای ئەرێژێ، پێك دەهێنێت

یشکل، یکون، یصنع، یصوغ

*~ a canoe from a tree trunk* کەشتی لە قەدی درەخت دروست ئەکا

یصنع قاربا من جذع الشجرة

**fashionable** /ˈfæʃnəbl/ *adj* وەك باو، لە سەر تەرزی تازە، چینی باڵا بەکاری دێنن

حدیث، متمش مع الموضة، تستخدمه الطبقة الراقیة

*~ hotel / tailor* ئوتێل / بەرگ درووی چینی باڵا

فندق / خیاط للطبقة الراقیة

**fashionably** *adv* شتێکی نوێ، لەگەڵ مۆدێل، لەسەرتەرزی تازە

بشکل متمش مع الموضة / راق

[1]**fast** /fɑ:st/ *adj* ١. جێگیر، چەسپاو

١. ثابت، راسخ

*be stuck ~ in the ground* جێگیر لە زەویدا

٢. (هاوڕێ) دڵسۆز ٣. (رەنگ) جێگیر، تێك ناچێ

ثابت في الارض ٢. (الاصدقاء) مخلص، مقرب ٣. (الالوان) ثابت، لایتغیر، لایبهت

☐ *adv* بەجێگیری

بثبات، بأحکام

*hold ~* توند ئەیگرێ

یمسك بأحکام

*~ asleep* زوو ئەخەوێت

یغط في النوم

*play ~ and loose (with)* بە فرو فێڵ، گزی ئەکا، ناویستانە ئاراستەی دەگۆرێ

یمکر، یخدع، یغیر اتجاهاته بشکل متکر

[2]**fast** /fɑ:st/ *adj* (-er, est) ١. خێرا، بە پەلە، زو، لەز

١. سريع، مسرع

شەمەندەفەری خێرا ٢. (کەسێك و ڕابواردنی) *a ~ train*

مەست، چەلەنگ

قطار سريع ٢. (الشخص، طريقة حياته) منغمس في الملذات

پڕ کامەرانی، پڕ چێژ ٣. کاتژمێرەکە لەپێشە *a ~ life*

حياة مليئة بالملذات ٣. (الساعة) تسبق الوقت الصحيح

ئەو کاتژمێرە دە خولەك لە پێشە *This watch is 10 minutes ~*

هذه الساعة متقدمة عشرة دقائق

□ *adv* بە پەلە، بە خێرا

بسرعة

*speak ~* بە پەلە قسە ئەکا

يتكلم / يتحدث بسرعة

*rain ~* باران، شەستە ئەکا، بەلێزمە دەبارێ

تمطر بغزارة

[3]**fast** /fɑ:st/ *vi* بەڕۆژوودەبێت، لەخواردن وخواردنەوە دوور دەکەوێتەوە

يصوم، يمتنع عن الاكل والشرب

□ *n* ڕۆژوو، ڕۆژی، ڕۆژوو گرتن

صوم، صيام

**fasten** /ˈfɑ:sn/ *vt, vi* ١. توندی دەکا، گرێ ددت، لەیەبەستێ، بەتوند دایئەخا

١. يثبت، يرسخ، يربط، يغلق باحكام

دەرگاو پەنجەرەکان بە توندی دادەخا ٢. جێگیر ئەبێ، قایم، توند کراو / گەیەنراویە *~ doors and windows*

يحكم اغلاق الابواب والنوافذ ٢. يصبح ثابتا، محكما / موصولا ب

زۆربەی چاکەت بە دوگمە دادەخرێ *Most jackets ~ with buttons*

معظم السترات تثبت بأزرار

٣. دەست ئەگرێ بەسەریا، بەتوندی ئەیگرێ *~ upon*

٣. يسيطر على، يمسك بأحكام

**fastener** *n* [C] ئامێری بەستن، قایم کردن، جێگیر کردن، بەنەخوێن، ئەوقە

أداة ربط، تثبيت، تروق

**fastidious** /fəˈstɪdɪəs/ *adj* زەحمەتە قایل کردنی، هەستیار، گازندەکەر

يصعب ارضاءه، شديد الاهتمام بمسائل الذوق، الطعام، الخ...

**fat** /fæt/ *n* [C,U] ١. چەوری، بەز، پیو، ڕۆن ٢. مادەی ڕۆنی ڕووەك

١. دهن، شحم ٢. مادة دهنية نباتية

ڕۆنی ڕووەکی بۆ چێشت لێنان *vegetable cooking ~s*

دهون نباتية للطهي

لەسەر خۆشترین خواردن ئەژی *live on the ~ of the land*

يتمتع بافضل الاطعمة

□ *adj* (fatter, fattest) ١. قەڵەو، پڕ، تێکسمڕاو

١. سمين، بدين

*a ~ man* پیاوی قەڵەو

رجل بدين

گۆشتی چەور، پڕ لەدوگ ٢. ئەستوور، پڕکراو *~ meat*

لحم مليء بالدهن ٢. سميك، ممتليء

جانتای پڕ ٣. ئاسوودە، بە سوود، بە پیت *a ~ pocket-book*

محفظة ممتلئة ٣. مربح، مكسب، خصب

*a ~ job* کارێکی ئاسوودە

وظيفة مريحة

*~ lands* زەوی بە پیت

اراض خصبة

□ *vt, vi* (-tt-) قەڵەو ئەبێت، قەڵەو دکت

يسمن، يسمن

**fat-head** *n* گەمژە، گێل

احمق

**fatal** /ˈfeɪtl/ *adj* کوشندە، مردنی، دەبێتە هۆی مردن، کارەسات

مميت، مهلك، يفضي الى الموت / كارثة

**fatally** *adv* کوشندانە، بکوژانە

بشكل مميت، مهلك

*~ wounded* توشی برینداری کوشندە بوو

مصاب بجرح قاتل

**fatalism** /ˈfeɪtəlɪzəm/ *n* [U] باوەڕ بە قەزاو قەدەر، چارەنووس

الايمان بالقدر، القدرية

**fatalist** /ˈfeɪtəlɪst/ *n* [C] کەسێکی ئیماندار بەچارەنووس (بەبەسەر هاتی دنیا)

مقياس بحري لعمق الماء (يعادل ٦ اقدام)

□ *vt* تێی ئەگا، هەستی پێ ئەکا، پێدا ئەروا

يفهم، يدرك، يسبر غور (شيء)

**fathomless** *adj* زۆر قوڵ، بێ بن

لايمكن سبر غوره

**fatigue** /fəˈtiːg/ *n* [C,U] شەکەت، هیلاکی، ماندووبون

تعب، اجهاد، ارهاق

□ *vi* هیلاك ئەبێ

يتعب، يرهق

**fatten** /ˈfætn/ *vt, vi* (بروانە *fat*)

(انظر *fat*)

**fatuous** /ˈfætʃuəs/ *adj* گەمژە، گەوج، پورت

احمق، ابله

**faucet** /ˈfɔːsɪt/ *n* (لە ئەمریکا) بەلوعە، بلوسك، بۆری ئاو

(في امريكا) صنبور، حنفية

**fault** /fɔːlt/ *n* [C,U] ١. عەیب، لەکە، کەم‌و کووری، خەوش، چەوتی

١. عيب، نقص

*find ~ with* عەیبی لێ ئەدۆزێتەوە

يتصيد عيوب، يشكو من

*at ~* هەڵە، عەیبدار، شڵەژاو

خاطيء، به عيوب، متحير، مرتبك

*It's your own ~ if you've hurt yourself*

٢. (لەشێوگی تاکدا) هەڵە، شپرزە، شاش، بەر پرسیاری لە هەڵە کردن هەڵەی خۆت بو کە ئازاری خۆتدا ٣. هەڵە

٢. (في صيغة المفرد فقط) غلطة، خطأ، مسئولية عن الخطأ انها غلطتك قد اذيت نفسك ٣. خطأ

*~ of grammar* هەڵەی رێزمانی ٤. قڵیشی زەوی وەك درزی بەرد

خطأ في النحو ٤. شق في قشرة الارض او طبقة صخرية مثلا

**faultless** *adj* بێ گەرد، بێ چەوتی

بلا اخطاء

**faultlessly** *adv* بێ گەردی، بێ چەوتی

بشكل قويم ليس فيه اخطاء

**faulty** *adj* خەوشدار، نەساز، چەوت، سوچدار

به عيوب او اخطاء، خاطيء

**faun** /fɔːn/ *n* (لە رۆمای کۆن) خوای دارستان و باخچەو کێڵگە، (شاخی بزن وقاچی بزنی هەبوو)

قدري، شخص يؤمن بالقدر

**fatalistic** /ˌfeɪtəˈlɪstɪk/ *adj* چارەنووسی، داوەرداری

قدري

**fatality** /fəˈtæləti/ *n* [C,U] مردن، لەناوچون لە

موت، هلاك

*(pl -ties)* رووداوادا

(في حادث مثلا)

*bathing fatalities* مردن بە هۆی مەلە کردنەوە (لە کەناری دیاری کراو)

الوفيات الناتجة عن السباحة (على شاطيء معين)

**fate** /feɪt/ *n* [U] ١. چارەنووس، چارە، قەزاو قەدەر

١. القدر، القضاء

*meet one's ~* ٢. پاشەرۆژێك چارەنووس دیاری ئەکات ٣. مردن، لەناوچون، وێرانە ئەمرێ، نامێنێ، تیا دەچێ

٢. المصير الذي يجدده القدر ٣. الموت، الدمار يلقي حتفه

**fated** *adv* لە چارەی نوسراوە، چارە نقیسی، چارەنووس

مقدر له

**fateful** /ˈfeɪtful/ *adj* بەدووم، رەشبین، بێ چار، قەبر کوژ

مقدر، مشئوم، محتوم

**father** /ˈfɑːðə(r)/ *n* [C] ١. باوك، بابە ٢. دامەزرێنەر دەست پێکەر ٣. قەشە (لە کڵێسەی کاسۆلیك)

١. اب، والد ٢. مؤسس، مبتديء ٣. قسيس (خاصة في الكنيسة الرومانية الكاثوليكية)

□ *vt* ١. دای ئەهێنێ، دای ئەمەزرێنێ ٢. خۆی ئەکا بە باوکی منداڵ، خاوەن پەرتوك

١. يبتكر، يبتدع، يؤسس ٢. يقر بأنه والد طفل او مؤلف كتاب

*~ sth on sb* شتێك ئەگەرێنێتەوە بۆ کەسێك

ينسب شيأ لشخص

**fat-herin-law** *n* (*pl* ~s-in-law) خەزوور، باوکی مێرد یا ژنەکە

صهر، والد الزوج أو الزوجة

**fatherland** *n* نیشتمان، خاك، وڵات

الوطن

**fatherly** *adj* باوکانە

أبوي

**fathom** /ˈfæðəm/ *n* [C] ئامێری قوڵی پێوی دەریا، قوڵی پێو (یەکسانە بە ٦ پێ)

~ *on a rich relative* مامەیی بۆ خزمێکی نزیکی دەوڵەمەندی ئەکا

یتملق قریبا غنیا

**fear** /fɪə(r)/ *n* [C,U] ١. ترس، تۆقین، سامناك ٢. سەرکەشی، ترسناك ٣. ترسان لە (خودا)، سام

١. خوف، رعب، فزع ٢. مخاطرة، خطر ٣. خشیة، خوف (الله)

□ *vt, vi* ئەترسێ، ئەشڵەژێ

یخاف، یخشی، یقلق

**fearful** /fɪəfl/ *adj* ترسناك، سامناك، تۆقێنەر

مخیف، مرعب، خائف

**fearfully** *adv* بەشێوەیەکی ترسناك / تۆقێنەر

بشکل مخیف / مرعب

**fearless** *adj* نەترسی، ئازا، گوێی پێ نادا

لایخاف، لایهاب

**feasible** /fi:zəbl/ *adj* پەسەند، لەوانەیە ڕوو بدات، کرداری

معقول، محتمل حدوثه، عملي

**feast** /fi:st/ *n* [C] ١. جەژن، یاد ٢. خوان، نان خواردن

١. عید، ذکری ٢. ولیمة، مأدبة

□ *vt, vi* ئامادەی میوانداری دەبێ

یقیم / یشترك في ولیمة

**feat** /fei:t/ *n* [C] قەهرەمانی، مەردایەتی

عمل مجید

**feather** /feðə(r)/ *n* پەڕی پەلەوەر

ریشة الطائر

*birds of a* ~ هەرباڵندە لۆبراخۆ (گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێ)

الطیور علی اشکالها (تقع)

*a ~ in one's cap* شتێك جێی شانازی بێ

شيء یدعو للفخر

□ *vt* ئاسوودەیی زۆر ئەکا

یوفر اسباب الراحة

~ *one's nest* خۆی ئاسودە ئەکا

یهیء الراحة لنفسه

**featherbed** *n* [C] نوێنی نەرم و نۆڵ، ڕاخەر لە پەڕگولیفك، تشتێ سڤك

فراش وثیر من الریش

**feature** /fi:tʃə(r)/ *n* [C] شەقڵ، بەرگە، درف، ڕۆدەم،

(في روما القدیمة) اله الغابات والحدائق والحقول (له قرون الماعز و ارجلها)

**fauna** /fɔ:nə/ *npl* ئاژەڵی سەردەمێکی دیاری یا ناوچەیەکی تایبەت

حیوانات عصر معین أو منطقة معینة

**favour** /feɪvə(r)/ *n* [C,U] ١. چاڵاکە، لایەنگریی خۆشەویستی، ئامادە باشی بۆ یارمەتیدان

١. استحسان، تأیید، محاباة، استعداد للمساعدة

*in ~ of* أ. دڵەوایی ئەکا، پشتی بەرنادات، هاوسۆز ب. لەلایەنی ئەوە، لە بەرژەوەندی ئەوە، لە بری، لە جیاتی

أ. متعاطف مع ب. في جانب، في صالح، نیابة عن

*out of ~ (with)* نەویست، قێزەون، نەڤیانی ٢. جوان، ناسراو، خزمەت

مکروه، غیر محبوب (من قبل) ٢. جمیل، معروف، خدمة

*ask a ~ of sb* داوای یارمەتی لە کەسێك ئەکا

یطلب المساعدة من شخص

□ *vt* ١. لایەنی ئەگرێ، یارمەتی ئەدا، پشتگیری دکت ٢. فەزڵی کەسێك یا شتێك ئەدا بەسەر ئەوی تردا ٣. چوون یەك ئەبێ، وەك یەکی لێ دێ

١. یؤید، یساند ٢. یفضل شخصا / شیئا علی اخر، یحابي ٣. یماثل، یشابه

**favourable** /feɪvərəbl/ *adj* گونجاو، لەبار، ڕوپیرۆز

موات، مؤید

**favourably** *adv* بە پەسەندی، لەبارانە، بە پەسەند کراوی، هەڤیازی

بتقبل حسن، بشکل مواتي

**favorite** /feɪvərɪt/ *n* [C] (کەس، شت) چاك، پەسەند

(شخص، شيء) مفضل

**favouritism** *n* [U] خۆشەویستی، هەڤیازیتی، چاکە خوازی، لاگری

محاباة، تحیز

[1]**fawn** /fɔ:n/ *n* [C] ١. بێچوە ئاسك ٢. ڕەنگی تۆزێ مەیلەو زەرد

١. صغار الغزلان ٢. اللون البني الباهت المائل الی الصفرة

[2]**fawn** /fɔ:n/ *vi* ١. (سەگ) هەڵەتیزێنێ کلکە لەقێدەکا ٢. ماستاو ئەکا، مامەیی ئەکا

١. (الکلب) یظهر سروره بالقفز و هز الذیل ٢. (مجاز) یتملق، یتزلف

نیشانه، بەشێك لە دەم و چاو، روخسار ٢. (لە شێوگی کۆ) روالەتی دەم و چاو، نیشانە، جودا، جیاکەرەوە

١. سمة، قسمة من قسمات الوجه. (في صيغة الجمع) سمات، ملامح الوجه ٢. صفة مميزة، بارزة

geographical ~s of a district شێوەکانی جوگرافی تایبەتە بە ناوچە شاخاویەکان و دەریاچەکان .. هتد

الصفات الجغرافية المميزة لأقليم (كالجبال، البحيرات .. الخ)

□ vi ناسینەوە، رۆڵێکی دیار دەبینێت (لە فیلم)دا

يميز، يحتل مكانا بارزا (كممثل في فيلم)

**featureless** *adj* بێ روالەت، مت، هەدار

بدون ملامح مميزة

**february** /ˈfebjʊrɪ/ *n* مانگی شوبات، رەشەمێ، مانگی دوو

شهر فبراير، شباط

**fed** /fed/ دەرخواردی دا (بروانە *feed*)

(انظر *feed*)

~ *up* بێزاری، جارس بوو

(ل . د) ضجر

**federal** /ˈfedərəl/ *adj* فیدرالی، یەکگیری

الفيدرالي

**federalism** /ˈfedərəlɪzəm/ *n* [U] یەکگرتنی، یەکگرتوویی

المذهب الاتحادي، فيدرالي

**federate** /ˈfedəreɪt/ *vt, vi* (دەوڵەر، کۆمەڵگاکان) یەکی دەخات، یەکێتی پێکدێنێ / رێکی دەخات بە یەکگرتنی فەدرالی

(الولايات، المجتمعات) يوحد / ينظم في اتحاد فيدرالي

**federation** /ˌfedəˈreɪʃn/ *n* [C,U] ١. یەکیەتی، یەکگیریەتی، فەرمان روای فیدرالی، کۆبوونەوە ٢. یەکێتی فیدرالی، یەکێتی رێکخراوی بازرگانی ٣. دروست کردنی یاسای فیدرالی

١. حكومة فيدرالية، ٢. اتحاد فيدرالي، اتحاد منظمات تجارية، ٣. فدرلة (تشكيل نظام فيدرالي)

**fee** /fiː/ *n* [C,U] مز، مزە، کرێ، موچە، شاباش، بۆ کەسێکی هونەرکار / رێنمایی کردن

أجر لشخص مهني مقابل خدمات / استشارة

**feeble** /ˈfiːbl/ *adj* زەعیف، بەسەزمان، لاواز، دڵسار، پەککەوتە

ضعيف، واهن

**feeble-minded** *adj* گێل، لاژك، گەوج، خرپو، ناقل، سفك

أبله

**feebly** /ˈfiːblɪ/ *adv* بەلاوازی، بەبەسەزمانی، بەداماوی

بضعف، بوهن، بتخاذل

**fecal impaction** گووگیران (قەبزی)

حصر الحائط

**feed** /fiːd/ *vt, vi* (pt pt, pp fed/fed/) ١. خواردنی ئەداتێ، ٢. (بۆ ئاژەڵ) خواردنی ئەداتێ، ئەیلەوەرێنێ، تێری ئەکا

١. يطعم، يغذي ٢. (للحيوانات بصفة خاصة) يرعى، يتغذى

*cows ~ ing in the meadows* مانگا لە مێرگەکە دەلەوەرێ

ابقار، ترعى في المروج

~ (up) *on* لەسەری ئەژی

يتغذى على

*n* [C,U] ١. خواردن، خواردنی منال، ئاژەڵ / ژەم

طعام، غذاء (للاطفال، الحيوانات) وجبة

**feedback** /ˈfiːdbæk/ *n* [U] لادەستکەوت، راگەهێن یان خوراکا، فەگەراندی (بروانە *fed*) دەستی لێ دەدا

عائد للمعلومات (انظر *fed*)

**feel** /fiːl/ *vt, vi* (*pt, pp* felt /felt/) ١. هەست دەکا، دهەست، هشي دكت

١. يتحسس، يلمس ٢. يشعر، يحس

~ *like doing sth* ئارەزوی کردنی کارێك دەکا

٣. وادەرئەکەوێ، ـوادیارە (نەرمە / زبرە) بۆ هەست

يشعر بالرغبة في عمل شيء ٣. يبدو، يظهر، (ناعما، خشنا) للحواس

*A baby's hand ~s smooth* دەستی منال نەرم و نۆڵە، ناسکە

ان يد الطفل ناعمة الملمس

*Her skin ~s like silk* پێستی وەکو ئاوریشمە ٤. لەو بروایەدایە ٥. کاری تێ ئەکات، بیروڕای نارون

ان ملمس بشرتها كالحرير ٤. يعتقد ان، يكون فكرة غير واضحة عن ٥. يتاثرب، يروق ل

~ *sorrow for sb* هەست بە خەمباری ئەکات بۆ کەسێك

يشعر بالاسى من اجل شخص

~ the heat ئۆقرەی نییە لە گەرما، گەرمایەتی
یعاني من الحر

□ n by the ~ دەست تێوەردان (تەنها لە شێوەی تاکدا)
(في صيغة المفرد فقط) باللمس

**feeler** /ˈfi:lə(r)/ n [C] ١. شاخی هەست کردن لە هەندێ مێرووداً ٢. هەستیار، هەستەوەر، سەحکەر، بیروڕا، پێشنیار، بۆچارەسەر کردنی ڕای کەسانی تر
١. قرن الاستشعار، عند بعض الحشرات ٢. مجس، فكرة / اقتراح يقدم لتحسس أراء الآخرين

**feeling** /ˈfi:lɪŋ/ n [C,U] ١. هەموەس، هەستیار، هەست، هەست کردن
١. احساس، شعور، وعي

a ~ of discomfort هەست کردن بە ناڕارامی ٢. بڕوا، باوەڕ، بۆچون ٣. ویژدان، هەستو نەست، خۆشەویستی
شعور بعدم الراحة ٢. رأي، اعتقاد ٣. (في صيغة الجمع) مشاعر، وجدان، عواطف

rouse the ~ s هەستی ئەبزوێنێ هەستەکان دەوروژێنن
يثير المشاعر

hurt sb's ~ s ئازاری هەستی دەدا، هەستی بریندار دەکا
٤. ڕێزلێ نان
يؤذي مشاعره ٤. اعجاب (بفن او جمال مثلا) تقدير

□ adj هەڵچون، ڕۆمانسی، بەسۆز
عاطفي، انفعالي، حساس

**feet** /fi:t/ n پێ، پێیەکان (بڕوانە foot)
انظر (foot)

**felicitous** /fəˈlɪsɪtəs/ adj (وشە، تێبینی) خۆش، دڵگیر، باش هەڵبژێرراو
(الكلمات، الملاحظات) لبق، حسن الاختيار

**feline** /ˈfi:laɪn/ adj کتکی، پشیلەیی، فێڵباز
القطط غادر، ماكر

**[1]fell** /fel/ کەوت / (بڕوانە fall)
انظر (fall)

**[2]fell** /fel/ vt دکەفێت، دێخت، ئەکەوێ، دار ئەبڕێتەوە
يسقط، يوقع، يقطع شجرة

**fellow** /ˈfeləʊ/ n [C] ١. کەس، یەکێك، زەلام، کابرا، هۆگر، هەفەر ٢. لەشێوەگی کۆدا، هاوەڵان، برادەران، هاوکار
١. شخص ٢. (في صيغة الجمع) رفاق، زملاء

~ s in misfortune برادەران / هاودەم بۆ تەنگانە
٣. هاوچەشن / هاوچین
اصدقاء / زملاء في الشدة ٣. من نفس النوع / الطبقة ... الخ، مماثل

~ citizens هاونیشتمانیەکان
مواطنون

~ passengers هاوگەشتیاران، ٤. ئەندام لە کۆمەڵەیەکی زانستی
رفقاء السفر / الطريق ٤. عضو في جمعية علمية، زميل

F ~ of the British Academy ئەندام لە ئەکادیمی بەریتانی
زميل في الاكاديمية البريطانية

**ˌfellow-ˈfeeling** n هاوبەشی کردن لە هەستدا
مشاركة في الشعور

**fellowship** /ˈfeləʊʃɪp/ n [C,U] ١. هۆگری کری، هاوکاریەتی ٢. ئەندامیەتی، زەمالە (لە کۆمەڵەیەك یان ئەکادیمیەك)
١. رفقة، صحبة ٢. عضوية، زمالة (في جمعية و اكاديمية)

**felon** /ˈfelən/ n [C] تاوانبار، تاوان
مجرم، أثم

**felony** /ˈfelənɪ/ n [C,U] تاوان، کەتن
جريمة، أثم

**[1]felt** /felt/ بەرهەست، هەستی کرد (بڕوانە feel)
(انظر feel)

**[2]felt** /felt/ n [U] لباد (فەرشی خوری پەستێنراو
لباد

~ hats شەبقەی لباد، کلاف، کڵاو
قبعات من اللباد

**female** /ˈfi:meɪl/ adj ١. مێ، مێینە، مێچکە (ڕووەك) بەردار
١. مؤنث، انثوي (النباتات) مثمر

□ n [C] ٢. ژنانە، مێی (مرۆڤ یان ئاژەڵ) مێینە
٢. نسائي، نسوي انثى (الانسان او الحيوان)

***femoral hernia** قۆری بەر ڕان (قۆربون)
فتق فخذي

**feminine** /ˈfemənɪn/ adj مێینە، ژنانی، مێی
١. نسائي، انثوي، للنساء

~ hobbies خولیا، ئارەزوی ژنانە وەك درووماں

**fern** /tɜ:n/ *n* [C,U] جۆرە رووەکێکە تەنها گەڵای هەیەو گوڵی نییە، گەڵای سولکە (سەرخەس) پیچك، کەرەفسا کولی
نبات الخنشار، نبات له اوراق خضراء و ليس له ازهار

**ferocious** /fə'rəʊʃəs/ *adj* وەحشی، کێوی دڵ رەق، زیاندار، دژوار، در
عنيف، قاس، شرس، شديد

**ferocity** /fə'rɒsətɪ/ *n* [C,U] دری، دژواری، در درندەیی، ناهەمواری
عنف، قسوة، شراسة

**ferret** /'ferɪt/ *n* [C] ئاژەڵێکی بچوکی زیرەکە (مشکە خۆرە) راوی (مشك و کەروێشك) ئەکا
حيوان صغير ماهر، في صيد الفئران والارانب

□ *vt, vi* راو ئەکا بە هۆی ئەو ئاژەڵەوە، نێچیر دکت، نێچیر دئێنێت دەر
يصطاد (الفئران، الارانب) بمساعدة هذا الحيوان

~ *sth/sb out* کەسێك ئەی دۆزۆیتەوە دوای گەران ولیکۆڵینەوە
يكتشف / يجد شيئا او شخصا بعد بحث دقيق

**ferroconcrete** /,ferəʊ'kɒŋkri:t/ *n* [U] چیمەنتۆ دارژاو بەشیشی ئاسن / چیمە نتۆیا ئاسنکری
اسمنت مسلح

**ferrous** /'ferəs/ *adj* ئاسنی، ئاسنۆز، ئاسنی هەڤیز
حديدي

**ferry** /'ferɪ/ *n* [C] (*pl* -ries) کەلەك بەلەمی بچوك / بۆگواستنەوەی خەلك ئاودا
قارب / طائرة لنقل الركاب عبر نهر اوقنات، معدية

□ *vt, vi* بەکەلەك ئەپەریتەوە
ينقل / يعبر بالمعدية

**fertile** /'fɜ:taɪl/ *adj* ١.(زەوی) بە پیت، (کەسێك، هۆش) پڕیی لەبیرو باوەڕ، پلان ٢. بەپیت، توانای پیتاندنی هەیە، بەردار، پڕپیت، زایی
١. (الارض)، خصبة، خصيب، (الشخص، العقل) مليء بالافكار / الخطط .. الخ ٢. مثمر، مخصب، قادر على الاخصاب

~ *seeds* تۆوی بە پیت
بذور مخصبة

**fertility** /fə'tɪlətɪ/ *n* [U] بەرداری، بە پیتی، بەبەرهەمی
خصوبة

٢. (لەرێزمان) مێ پێچەوانەی نێر
هوايات نسائية (كاشفال الابرة) ٢. في النحو (مؤنث) عكس مذكر

**feminism** /'femɪnɪzəm/ *n* [U] بزوتنەوەی یەکسانی لە نێوان ژن و پیاودا
حركة المساواة بين الرجل والمراة

**¹fence** /fens/ *n* [C] (دەوری ئەگرێ) تەیمان، شورا، پەرژین، (لە تەختەیاتەلبەن)
(يحيط ب) سور، سياج، (من الاخشاب والاسلاك)

**²fence** /fens/ *vi* ١. شەرەشیر، شیربازی ئەکا ٢. خۆی لائەدا لەوەڵامی راستەوخۆی پرسیار
١. يبارز بالسيف ٢. (مجاز) يتجنب الاجابة المباشرة (على سؤال)

**fencer** *n* [C] یاریکەر / زۆرانباز
مبارز

**fencing** /'fensɪŋ/ *n* [U] شیربازی
مبارزة بالسيف

**fend** /fend/ *vt, vi* ~ *off* ١. خۆدەپارێزێت لە، خولە ددت، دەپارێزێت، دوورنەکەوێتەوە
١. يدافع عن نفسه ضد، يتقي

~ *for* ٢. بەخێوی ئەکا (خۆی ومناڵەکانی)، چاودێری دەکا
٢. يعول (نفسه أو أولاده مثلا) يرعى

**fender** /'fendə(r)/ *n* [C] ١. چوارچێوەی کانزایی دەوری زۆپـــا دەدات، درابـــزین، تـــانی زوپـــە پـــارێز ٢.بەربەست، لێکەوتن لە (پاپۆر، ئامێر)
١. اطار معدني يحيط بالمدفأة، درابزين ٢. (في السفن، الآلات، الترام، القاطرات) حاجز الاصطدام

**ferment** /fə'ment/ *vt* دەترشێت، کاری تێ ئەکا، ئەوروژێ، تورەی ئەکا، هەڵ دەچێ
يخمر، يتخمر، (مجاز) يثير، يهيج، يتهيج

□ /'fɜ:ment/ *n* هەوێن، مادەی ترشاندن، لەباری وروژاندنی شۆرشدا
خميرة، مادة تسبب التخمر، (مجاز) في حالة تهيج او ثورة (سياسية او اجتماعية) مثلا

**fermentation** /,fɜ:men'teɪʃn/ *n* ترشان، ترشاندن، ترشبون
تخم، تخمير

**fertilization** /ˌfɜ:təlaɪˈzeɪʃn/ *n* [U] پەڕین، پیتاندن، پەین کردن
اخصاب

**fertilize** /ˈfɜ:təlaɪz/ *vt* بەپیتی ئەکا، ئاوسی ئەکا
يخصب

**fertilizer** /ˈfɜ:təlaɪzə(r)/ *n* [U] بەپیت، پەین
مخصب، سماد

**fervent** /ˈfɜ:vənt/ *adj* ١.گەشاوە، گەرم ٢. پڕ لە هەست و سۆز، پەرۆش، دڵگەرم
١. متوهج، حار ٢. (مجاز) مليء بالشاعر، متحمس

~ *love* خۆشەویستی بە پەرۆش
حب متقد

**fervour** /ˈfɜ:və(r)/ *n* [U] هەست قوڵ، کڵپە کردن، شاراندن، پەرۆشی
شعور عميق، اتقاد

**festal** /ˈfestl/ *adj* جەژنیی، تایبەتە بە جەژن
عيدي، يخص الاعياد

**fester** /ˈfestə(r)/ *vi* ١. (برین) جەراحەت ئەکا، گەنی دبت، دەرزێ ٢. ئەبێتە هۆی تاڵی، هۆشی تێك ئەدا، پرزك، بزمارۆك
١. (الجرح) يتقيح ٢. يسبب مرارة، يفسد العقل، يسمم التفكير

**festival** /ˈfestəvl/ *n* [C] یاد، ئاهەنگ، جەژن
احتفال، مهرجان، عيد

**festive** /ˈfestɪv/ *adj* ئاهەنگی، جەژنی، شایی
مهرجاني، احتفالي

*the ~ season* وەرزی جەژنەکان (لەدایك بوون و سەری ساڵ)
موسم الاعياد (عيد الميلاد و رأس السنة)

**festivity** /feˈstɪvətɪ/ *n* [C,U] ١. جەژن، ئاهەنگ
(*pl* -ties) ٢. بۆنەیەکی خۆش، ئاهەنگی
١. عيد، احتفال ٢. مهرجان، مناسبة مرحة

*wedding festivities* ئاهەنگی ژن هێنان
احتفالات الزواج

**festoon** /feˈstu:n/ *n* [C] زنجیرەیەك گوڵی هەڵواسراو بۆ جوانی
سلسلة من الزهور متدلية و معلقة بين نقطتين للزينة

□ *vt* دەیرازێنێتەوە بەزنجیر یان پەتێکی گوڵین
يزين بسلسلة / حبل من الزهور

**fetch** /fetʃ/ *vt, vi* ١. دەهێنی، دێنێت، ئامادە دەکات، ئەروات بۆ ئامادە کردنی (شتێك، کەسێك)، دانە دەست ٢.دەری ئەکا (هەناسە، فرمێسك) بۆ (کەلوپەل) ئەیهێنێ
١. يجلب، يذهب لأحضار (شيء او شخص) ٢. يطلق (تنهدة، دموعا) (للبضائع) يحضر، يجلب

**fete** /feɪt/ *n* مەهرەجان، ئاهەنگ لە هەوای سازگاردا
مهرجان (عادة في هواء الطلق)

**fetid** /ˈfetɪd/ *adj* بۆنی پیس، ناخۆش، بۆگەن
كريه الرائحة

**fetish** /ˈfetɪʃ/ *n* [C] (*pl* ~*es*) بت پەرست لای گەلە بت پەرستەکان وا هەست دەکەن گیانی تێدایە نوشتە، خۆشەویستی وپەرۆشی گێلانە
صنم، عند الشعوب الوثنية يعتقد بان داخله روح، شيء يستعلق به، حب او ولع بشكل احمق

**fetishism** نەخۆشیەکی دەرونیە (جنسی) توشی هەندێك (ژن و پیاو) دەبێت
فيتشيزم

**fetter** /ˈfetδ(r) *n* [C] کۆت، زنجیری ئاسن، گرێدان، پاشبەند، بەندان، پێشبەند
قيد، غل، سلسلة حديدية (محاز) معوق، عائق، عقبة

□ *vt* ڕێگەی لێ ئەگرێ، بەند دکت، گرێ ددت
يقيد، يغل، يعوق

***feto** کۆرپەلە، ئاولەمە
جنين

***fetus** کۆرپەلەیی، ئاولەمی
جنيني

**feud** /fju:d/ *n* [C] شەڕ، ناکۆکی دورو درێژ، نەیاری، دوژمنی
ثأر، عداء شديد يستمر مدة طويلة

**feudal** /ˈfju:dl/ *adj* دەرەبەگی
اقطاعي

**feudalism** *n* [U] ڕژێمی دەرەبەگی
نظام اقطاعي

**fever** /ˈfi:və(r)/ *n.* ١. تا، بەرز بوونەوە٢. پلەی گەرمی لەش ٢. نەخۆشی تا
١. حمى (ارتفاع في درجة حرارة الجسم) ٢. مرض الحمى

*in a ~ of impatience* ٣. باری هەڵچون، خرۆشی، لەباری هەڵچون و خرۆشدایە، پرلە بێزاری

حامل الشيء، مالك، مستأجر، مستفيد من، مقبض، ممسك

office- ~ s فەرمانبەر، خاوەن دەسەڵات

شاغلو المنصب، من في يدهم زمام السلطة حامل القلم

pen- ~ نوسەر

حامل القلم

**holding** /ˈhəʊldɪŋ/ *n* [C] ئەوەی لایێ یا لەژێر دەستیایێ، بەتایبەتی خانوو بەرەو بەشە موڵك

ما في الحيازة أو تحت اليد بخاصة الأرض أو الأسهم، ممتلكات

**hold-up** /ˈhəʊld ʌp/ *n* [C] رێگر، پەكخستن، داخستن بەنیەتی تاڵان كردن

عائق، تعطيل، ايقاف بقصد السلب

*a traffic ~* هاتووچۆ پەك ئەخا

تعطيل في المرور

*a bank ~* بانق دزين، هێرش كردنە سەر بانقابۆدزی

سرقة بنك، هجوم على مصرف بقصد السرقة

**hole** /həʊl/ *n* [C] كون، چاڵ، كەلێن، ژووری بچوك

ثقب، حفرة، جحر

*pick ~ s in* هەڵ ئەقۆزێتەوە

يتصيد الأخطاء

*in a ~* لەكێشەدایە، لەتەنگانە

(ل.د) في ورطة، في مأزق

*~ and corner* (شێواز) شاراوە، نهێنی

(الأسلوب) خفي، سري

□ *vt* هەڵئەكەنێ، ئەیخاتە چاڵ

يحفر، يضع في حفرة

**holiday** /ˈhɒlədeɪ/ *n* [C] مۆڵەت، پشوو

إجازة، عطلة

*bank ~* پشووی بانق، ئەو رۆژەی بانق لەكاركردن ئەوەستێ

عطلة مصرفية، اليوم الذي تتوقف فيه المصارف عن العمل

**holiness** /ˈhəʊlɪnɪs/ *n* [U] ١. پیرۆزی ٢. پیرۆزی

١. قداسة ٢. قداسة البابا

*His/Your H ~* پاپا (پیرۆزتان) بۆ پاپا

(قداستكم) للبابا

**hollow** /ˈhɒləʊ/ *adj* ١. بۆش، پوك، داری

١. أجوف، مجوف

*a ~ tree* كلۆر، داری ناو پوك ٢. (دەنگ) گر، نەلەراوە ٣. (م) درۆزن، هەڵخەڵەتێن، ناراست

شجرة مجوفة ٢. (الصوت) عميق، غير رنان ٣. (مجاز) كاذب، خادع، غير حقيقي

*~ words/sympathy* ووشە/ هەستی پوچەڵ

كلمات / مشاعر جوفاء

*~ cheeks* ٤. لەخشتەبەر، كوڵمی دوور كوژ

٤. غائرة، وجنات غائرة

*~ -eyed* چاوگەش سەرنج راكێش

ذو عيون غائرة، غائر العينين

□ *adv* ئەیبەزێنێ، سەر لەكەوێ بە سەریا

*beat sb ~*

(ل.د) يهزمه (يتغلب عليه) تماما

□ *n* [C] بۆش، چاڵ، دۆڵ

تجويف، حفرة واد

□ *vt* بۆشی ئەكا، كونی ئەكا

يجوف

*river banks ~ ed out by water* كەناری دەریا فشەڵ بووە بەهۆی ئاوەوە

ضفاف نهر تجوفت بفعل المياه

**holly** /ˈhɒlɪ/ *n* [U] درەختی هەمیشە سەوز دڕكاوی و بەری سور

شجيرة دائمة الخضرة ذات ورق صقيل شائك الاطراف و ثمر أحمر اللون، البهشية

**hollyhock** /ˈhɒlɪhɒk/ *n* [C] هێرۆ

الخطمي، خبيزى افرنجية

**holocaust** /ˈhɒləkɔːst/ *n* [C] گوڵخەنی كۆ كوژی، قەسانجایە بۆ لەناوبردنی خەڵك بەسووتاندنو قڕكرن، رەشەكوژی

المحرقة، مجزرة بشرية خاصة بالأحراق

**holster** /ˈhəʊlstə(r)/ *n* [C] كیفی دەمانچە، كاڵان (قاڵكی چەرمی دەمانچەی)

قراب المسدس

**holy** /ˈhəʊlɪ/ *adj* (-ier, -iest) ١. پیرۆز، پاك

١. مقدس

*the H~ Bible* پەراوی پیرۆز

الكتاب المقدس

*the H~ Land* زەوی پیرۆز

الأرض المقدسة

*H~ Week* هەفتەی ئازارەكان (پێش جەژنی دیان)

۲. سۆفی، خۆی تەرخان ئەکا بۆخزمەتی ئایین

أسبوع الآلام (السابق لعيد الفصح) ۲. تقي، ناذر نفسه لخدمة الدين

*a ~ man* پیاوی ئاینی

رجل ورع معروف بالتقوى

*living a ~ life* ژیانی سۆفیەتی و لەخواترسی ئەژی

يحيا حياة التقوى والورع

**homage** /ˈhɒmɪdʒ/ *n* [U] ۱. ریزلێ نان، پێ زانین

۱. تكريم، تقدير

*paying ~ to (the genius of) Shakespeare* ریزگرتن بۆ (لێهاتویی) شکسپیر ۲. (دەرەبەگ) سەلەم، پارە ئەدا بە قازانج

تكريماً ل(عبقرية) شكسبير ۲. (الأقطاع) بيعة، تقديم فروض الطاعة

**home** /həʊm/ *n* [C] ۱. ماڵ، خانو، نشینگە

۱. بيت، دار، مسكن، وطن، موطن

*at ~ (to)* نیشتمان، هەوارگە پێشبین و ئامادەیە بۆ پێشوازی کردن

يتوقع و مستعد لاستقبال (الزوار مثلاً)

*make oneself/be/feel/at ~* (وەك میوان) سەربەستی تەواوی خۆی وەرئەگرێ لەماڵی کەسێکی تروخۆی بەخاوەن ماڵ ئەزانێ ۲. یانەی چاودێری، پەناگەی ناوماڵی

يأخذ كامل حريته في منزل غيره كما لو كان في بيته ۲. دار رعاية، ملجأ ۳. منزلي (سابقه للمنعون)

*~ life* ژیانی ناو ماڵ

حياة منزلية

*~ industries* پیشەسازی ناو خۆی

الصناعات المحلية، في

□ *adv* لەماڵی یەکێکدایە لەوڵاتەکەیدا

منزل (الشخص) أو وطنه

*bring sth ~ to sb* رازی ئەکا بەشتێك، جوان بۆی روون ئەکا

يقنعه بأمر ما، يوضحه له تماما

**home less** *adj* ئاوارە، دەربەدەر، لانەواز

شريد، بلا مأوى

**homelike** خێزانی، ماڵباتی، ئاسوودە

عائلي، مريح

**home-made** *adj* ۱. سادە، ئاسایی، باو، ساکار

۱. بسيط، عادي، مألوف، غير متكلف ۲. مريح، (جو) عائلي

**homely** *adj* ۲. خۆش (کەسێکی خێزانی)

۲. مريح، (جو) عائلي

*a ~ atmosphere* خێزانی ئاسایی، سادە

مريح، (جو) عائلي

*a ~ boarding-house* کەشێکی ئاسوودەیی (خۆیی) خوێشی کەشێکی خێزانی ۳. (لە ئەمریکا، کەسێك) ئاسایی، جوان نیە، سەرنج راکێش نیە

جو عائلي، نزل يتمتع بجو عائلي ۳. (في أميركا، الشخص) غير جذاب أو جميل

**the ˈHome Office** *n* وەزارەتی ناوخۆی بەریتانی

وزارة الداخلية البريطانية

**ˈhomesick** *adj* بیری نیشتمانی ئەکا

يشعر بالحنين لوطنه

**homestead** *n* [C] خانووی لادێوەدەوروبەری

مسكن ريفي و ماحوله من أرض وأبنية

**homeward** *adj, adv* بەرەونیشتمان، بەرەوماڵ

متوجه إلى أو نحو المنزل أو الوطن

**ˈhomework** *n* [U] ئەرکی ماڵەوە (قوتابی)

فرض أو واجب منزلي (التلميذ)

**homicidal** /ˌhɒmɪˈsaɪdl/ *adj* کوژ، پەیوەندی بەکوشتنەوە هەیە، ناکۆکی تاکوشتن، کوژدار

قتل الغير، قاتل إنسان، قاتل

**homicide** /ˈhɒmɪsaɪd/ *n* [C,U] کوشتنی کەسانی تر کوشتن، مرۆڤ کوژی

متعلق بالقتل، نزاع إلى القتل

**homogeneous** /ˌhɒməˈdʒiːnɪəs/ *adj* (لەچەند بەش پێك هاتوە) چونیەك، لە یەك رەگەزو رەوش، گونجاو

(مكون من أجزاء) متجانسة، من جنس أو طبيعة واحدة

**homonym** /ˈhɒmənɪm/ *n* [C] چونیەك، دوورەگ، دوو وشەی هاودەنگی ماناجیاوازوەك (*pale, pail*)

مجانسة، جناس، كلمتان بلفظ واحد ولكن تختلفان بالمعنى مثل (*pale, pail*)

**homosexual** /ˌhɒməˈsekʃʊəl/ *adj* نێربازی، لوتی،

مصاب بشذوذ جنسي، يميل إلى افراد من نفس الجنس

□ *n* [C] قونەکی، هەتیوبازی

شخص مصاب بشذوذ جنسي

**hompsexuality** /ˌhoʊməsekʃuˈæləti/ *n* [U] نێرباز، قونەکی
شذوذ جنسي

**honest** /ˈɒnɪst/ *adj* پیاوچاك، راستگۆ، راست بێژ، خانەدان، دەست پاك، بە ئابرو
شريف، صادق، نبيل، امين

**honestly** *adv* بەدەستپاکی، بەراستی
بشرف، بأمانة، بأستقامة

**honesty** *n* [U] راستی، دەستپاکی، سەرراستی، دڵسۆزی، راستگۆ
صدق، أمانة، إستقامة، إخلاص

**honey** /ˈhʌni/ *n* [U] هەنگوین، هنگڤین
عسل النحل، شهد

**honeycomb** /ˈhʌnikəʊm/ *n* [C,U] شانەی هەنگوین
قرص العسل

□ *vt* کون وکەلەبەر پرئەکا
يملأ بالثقوب والفجوات

**honeyed** /ˈhʌnid/ *adj* (ووشە) شیرین، خۆش
(الكلمات) حلوة

**honeymoon** *n* [C] هەنگونیە مانگ، مانگی هەنگوینی، بوک وزاوا
شهر العسل

**honeysuckle** /ˈhʌnisʌkl/ *n* [U] گوڵە هەنگوین، روەکێکی شاخاویە
زهر العسل، سلطان الجبل (نبات)

**honorarium** /ˌɒnəˈreəriəm/ *n* [C] کرێ یا پاداشت، بۆ خزمەتێك نەتوانرێت بری تێچوونی بزانرێ ئەبەخشرێ پێ داوا
أتعاب أو مكافأة، مكافأة على خدمات يحظر العرف تحديد مقدارها و تمنح بدون طلب

**honorary** /ˈɒnərəri/ *adj* (بە کورتی *Hon*) کارێك، پایەیەك بۆ شانازی، فەخری، پایەدانان (پێ موچە)
تختصر إلى (*Hon*) (الوظيفة أو المنصب) شرفي فخري (بدون راتب)

*the ~ secretary* سکرتێر بۆ رێزلێنان (بروانامەی یا پلە)
سكرتير فخري (الشهادة أو الرتبة) فخرية

*an ~ vice-president* رێزدانان جێگری سەرۆکی رێزلێنراو
نائب رئيس فخري

**honour** /ˈɒnə(r)/ *n* [C,U] شانازی، مەردی، مەزنی، رۆمەت، ناموس، ئابرو
شرف، نبل، إجلال

*win ~ s in war* بەسەربلندی سەرکەوتن لە جەنگدا
يفوز بالأمجاد في الحروب

*do ~ to the King* بەشان وباڵایی پاشادا هەڵئەدا
يحتفي بالملك

*a guard of ~* پاسەوانی شایانە
حرس شرف

*a ceremony in ~ of sb* ئاهەنگ گێران بۆ شکۆی کەسێك شکۆمەند، مەرد
إحتفال على شرف شخص ما، شرف، نبل

*on my ~* سوێند ئەخۆم بە ئابروم
أقسم بشرفي

*bound in ~ to do sth* پابەندە بەکردنی کارێك بەپێی ئابرو (نەك بە یاسا)
ملزم بعمل شيء بمقتضى الشرف (وليس القانون)

*word of ~* بەڵێنی ئابرو
وعد شرف

*May I have the ~ of your company at dinner?*
٣. (شێوگی بە رەوشت) ئایا ئەکرێ گەورەمان کەن بۆنانخواردنی نیوەرۆ؟
٣. (صيغة مهذبة) أيمكن أن أحظى بشرف إستظافتكم على طعام الغداء؟

*do the ~ s (of)* ٤. (شێوگی کۆ) دیاردەکانی رێزلێنانو خزمەتی میوان بەباشی
٤. (في صيغة الجمع) مظاهر الحفاوة والتكريم يحتفي بالضيف، يحسن وفادته

*Your/His H~* ٥. بەرێزتان/ خاوەن شکۆ، بەرێزی
٥. سيادتكم / سيادته

*an ~ to the school* ٦. شانازی قوتابخانە
٦. فخر للمدرسة

*the ~ s list* ٧. (لەشێوگی کۆدا) ئابروو، باڵاداری
٧. (في صيغة الجمع) شرف، امتياز قائمة الشرف في الأنعام الملكي

*an ~ s degree* لیستی شەرفەمەندان، بکلۆریۆس
بكالوريوس شرف

١. ڕێزی لێ ئەگرێ گەورەی ئەکا □ *vt*

١. يحترم، يبجل، يكرم

٢. بری کمبیالەو چەك ئەداتەوە لەکاتی خۆیدا، بەڵێن ئەباتەسەر ~ *a promise*

٢. يفي بقيمة كمبيالة أو شيك عند الأستحقاق يفي بالوعد

**honourable** /ˈɒnərəbl/ *adj* پیاوچاك، بەخشندە، ئاقدار، شایەن، بەرێز

شريف، نبيل، صادق

~ *conduct* ڕێزدار، ڕۆمەتدار شێوازێك شایستەی ڕێزگرتن بێت

سلوك جدير بالأحترام

~ *burial* ناشتن بەرێزلێنان (کوتکراوبۆ *Hon*) بەرێز نازناوێکە بۆ دادوەر وپیاوی گەورە

دفن مصحوب بمظاهر الاحترام (تختصر إلى *Hon*) محترم، لقب يخاطب به القضاة وغيرهم من كبار موظفي الدولة و أبناء بعض النبلاء

**hood** /hʊd/ *n* [C] ١. کڵاو، مێزەر کولاف، فێست ٢. لەچك بۆ سەروملّ، چادر بۆ گالیسکەو ماشێن ٣. هەرشتێك لە کڵاو بچێت، وەك پۆپە

١. قلنسوة، طرطور ٢. غطاء للرأس والعنق معا، غطاء متحرك لعربة أو سيارة ٣. شئ يشبه القلنسوة مثل غماء الصقر أو الفرس

**hooded** *adj* بەپۆشەرەوە، کڵاوی یا قۆچەکی

ذو غطاء أو غماء يشبه القلنسوة

**hoodwink** /ˈhʊdwɪŋk/ *vt* گزی لێئەکا، فێڵ ئەکا

يخدع، يغش

**hoof** /hu:f/ *n* (*pl* ~ *s*, hooves) سم (ئەسپ)، سم (مانگا)، زێر پێی حوشتر

حافر (الفرس)، ظلف (البقر)، خف (الجمل)

**hook** /hʊk/ *n* [C] ١. ئەڵە، قولاپ، چنگاڵ ٢. داس

١. كلاب، خطاف ٢. منجل

*by* ~ *or by crook* بە چ ڕێگەیەك لێی گیرئەکا

بأية وسيلة يكلّب

□ *vt, vi* بە قولاپ ئەیگرێ یان چنگری ئەکا بە گیرە

يمسك أو يثبت بكلاب

*a dress that* ~ *s/is* ~ *ed at the back* کراس لەدواوە بەگیرە بەستراوە

ثوب مثبت بكلاب من الظهر

~ *a fish* ماسی ڕاو ئەکات

يصطاد سمكة

**hooked** *adj*

مكلّب، مزود بكلاّب، شبيه بالكلاّب

ˈ**hookworm** *n* [C] کرمی ئەنگلوستۆما بەدیواری ڕیخۆڵە ئەنوسێ نەخۆشی توش ئەکا

دودة الأنكلستوما (تتعلق بجدران الأمعاء مسببة المرض)

**hookah** /ˈhʊkə/ *n* [C] نارگیلە، نەرگەلە

ناركيلة، شيشة

**hooligan** /ˈhu:lɪgən/ *n* [C] ئاژاوەچی یەکێ لە باندی جەربەزەکان

بلطجا، شقي، أحد أفراد عصابة من مثيري الشغب

**hooliganism** *n* [U] ئاژاوەنانەوە لەسەرجادە و شوێنی گشتی

بلطجه، إثار للشغب

**hoop** /hu:p/ *n* [C] تەوقی کانزایی یان دارین (لەدەوری بەرمیل)، خلۆکەی ئەڵقە

طوق معدني أو خشبي (يحيط ببرميل)، لعبة الأطواق

**hoot** /hu:t/ *n* [C] ١. قرانی کونەبەبو ٢. دەنگی هۆرنی ئۆتۆمبیل یا شەمەندەفەر (تیتە) ٣. هاوارێ نیشانەی نارەزایی و سوکایەتی پێ کردن بێ، ئەقیرێنێ

١. نعيقه البوم ٢. صوت بوق السيارة أو صفارة القطار ٣. صيحة تدل على عدم الرضا أو الأستهزاء

□ *vi, vt* فیکەو هاوار ئەکا بۆ گاڵتەپێ کردن، دەری ئەکا

ينعقه، يزمر، يصفر، يصيح مستهزئا يطرد بالنعيب او الصفير أو بصيحات الأستهجان

~ *an actor off the stage* بەفیکەو هاوار ئەکتەرێ ناچار ئەکا شانۆیەجێبهێڵێ بە فیکە وهەراو هوریا

يجبر ممثلاً على مغادرة خشبة المسرح مشيعاً بصيحات الأستهزاء والأستهجان

**hooter** *n* [C] هۆرنی ئۆتۆمبیل، شوتی کارگە

بوق السيارة، صفارة المصنع

**hooves** /hu:vz/ بڕوانە (*hoof*)

(أنظر *hoof*)

[1]**hop** /hɒp/ *n* [C] (گیادینار) (ڕووەکێکە) گەڵاکەی وشك ئەکرێتەوەو بیرەی لێ دروست ئەکرێ

حشيشة الدينار (نبات)، أوراقها تجفف و تستخدم لصنع البيرة

[2]**hop** /hɒp/ *vi, vt* (-pp-) ١. (کەس) هەنگەشەلی

ئەکا،لەسەر یەك قاچ بازئەدا، باڵندەهەڵەقونێ ۲. هەڵ ئەقونێ لەروا بە

۱. (الشخص) يحجل، يقفز على قدم واحدة (الطير) ينط، يحجل

۲. يجتاز أو يعبر بالحجل

□ *n* هەنگڵە شەلێ، قەڵەمباز، قۆناغێك لە گەشتی گەردوون

حجل، قفزة قصيرة، مرحلة في رحلة جوية

**hope** /həʊp/ *n* [C,U] ۱. ئومێد، تکا، هیوا، هەست بە دڵنیایی‌دەکا

۱. أمل، رجاء، تمني، شعور بالثقة والأطمئنان

*~ for sth/that.../ to have* ۲. کارێك بەهیوایەوە ئەبن، هیوابەخشە یا خوازیارە شتێکی دەست کەوێ/ بۆی بێتەدی

۲. أمر يعقد عليه الأمل أو الرجاء، مبعث للأمل يأمل أو يرجو الحصول على شيء / تحقيق شيء

**hopeful** /həʊpfl/ *adj* گەشبینە، گەشبینی و هیوابەخشە، پڕ هیوا

متفائل، يبعث على الأمل أو التفاؤل

**hopefully** *adv* بەگەشبینی و هیواداریەوە

على نحو متفائل أو يبعث على الأمل

**hopeless** /həʊplɪs/ *adj* نائومێد، بێ هودە، بێ‌هیوا

يائس، قانط، ميئوس منه، (الشخص) لاأمل في

*a ~ invalid* بێ کەڵك، (کەسێك) بێ هیوای چاکبونەوە لێ‌ی، بێ ئومێدن، نەخۆشێك چاکبونەوەی نیە

شفائه، ميئوس منه مريض لا شفاء له

**hopper** /hɒpə(r)/ *n* [C] ۱.کاسەی‌کوتین، رەحەتی بۆنەوەی گەنمەکەی تێکرێ و بهارێ ئامانی کولکی (بۆ تێکرنێ) ۲. کوللەی بچوك

۱. قادوس الطاحونة، وعاء على شكل قمع لتلقيم الطاحون أو الآلة بالقمح أو الفحم و نحوه ۲. جرادة صغيرة، حشرة نطاطة

**horde** /hɔ:d/ *n* [C] ۱. یەکێ لە هۆزە کۆچەرەکان، هۆزی تەتەر، هەمەجی

۱. واحدة من القبائل الرحل، قبائل من التتار أو الهمجيين

*~ s of Tartars* ۲. (بۆسوکایەتی پێ کردن) کۆمەڵێك خەڵك

۲. (للتحقير) حشد من الناس

**horizon** /hə'raɪzn/ *n* [C] ئاسۆ، سۆ

أفق

**horizontal** /ˌhɒrɪ'zɒntl/ *n* [C] ئاسۆیی، تەخت

أفقي، منبسط

**horizontally** *adv* ئاسۆییانە، بەتەریبی یان ئاسۆیی

على نحو أفقي أو منبسط

**hormone** /hɔ:məʊn/ *n* [C] هۆرمۆن

هرمون

**horn** /hɔ:n/ *n* [C,U] ۱. قۆچ، شاخ، ئەوماددەیەی کە قۆچی لێ‌پێك هاتووە ۲. بەشێك لە شاخ بچێت

۱. قرن، المادة المكونة لقرون الحيوانات ۲. جزء شبيه بالقرن

*draw in one's ~ s* پاشەگەز ئەبێت

ينسحب، يتراجع

*a huntsman's ~* ۲. فیقە، فیکە، فیکەی راو، فیکەی راوچی

۲. صور، بوق، نفير، بوق الصياد

*French ~* فیقەی ئاگادار کردن

بوق نحاسي، صفارة انذار

*a fog- ~* فیقەنەی خۆڵ، خۆڵ فرێدان

صفارة الضباب

*a car* هۆرنی ئۆتۆمبیل

بوق السيارة

**horned** *adj* قۆچدار، رەشەوڵاخی

ذو قرون

*~ cattle* قۆچدار (وەك گا)

مواش ذات قرون (ثيران مثلا)

**horny** *adj* (-ier, -iest) قۆچی، زبر، رەق

قرني، خشن، صلب

*hands ~ from hard work* دەستی زبربوو بەهۆی کاری سەختەوە

أيد خشنة بسبب العمل الشاق

**hornet** /hɔ:nɪt/ *n* [C] زەردەواڵە، سێنگ، موزەبەش

زنبور، دبور

**horoscope** /hɒrəskəʊp/ *n* [C] نەخشەی بورجەکان (بەختزانی)

خريطة البروج

**horrible** /hɒrəbl/ *adj* ترسناك، تۆقێنەر، بزدهێن، کریت، ترسێنەر، بێزارکەر

مخيف، مفزع، مرعب، رهيب

**horrid** /hɒrɪd/ *adj* ناشرین، ترسناك، رق وکینە، ئێسك قورس، بزدهێن، وەرس کەر، بێزارکەر

بشع، مروع، كريه (ل. د) بغيض، مكروه، مزعج

**horrify** /ˈhɒrɪfaɪ/ *vt* دەترسێنێت، دەتۆقێنێ

يخيف، يرعب، يروع

**horror** /ˈhɒrə(r)/ *n* [C,U] شتێکی تۆقێنەر، ترس، تۆقین، بزدهین، هەژلین، ترس، ترسیاری

شيء مرعب، رعب، فزع، هلع

**ˈhorrorstruck, -stricken** *adj* ترساو، توشی ترسێکی زۆر بووە

مرتعب، مصاب بخوف شديد

**hors d'oeuvres** /ɔːˈdɜːvrə/ *npl* (فەرەنسی) بەرکوڵ، شتی پێش خواردن

(فرنسية) مشهيات، مقبلات

**horse** /hɔːs/ *n* [C] ١. ئەسپ سوارە ٢. ئەسپ سوار، سوارچاك ٣. ئەسپە دارینە

١. حصان، جواد، فرس ٢. خيالة، فرسان ٣. حصان خشبي

**ˈhorseback** *n on ~* لەسەر پشتی ئەسپ سوار، سوارە

على صهوة الجواد خيال، فارس

**horsemanship** *n* [U] سوارچاکی، سواربونی ئەسپ

فروسية، ركوب الخيل

**ˈhorse-play** *n* [U] رەوشی توندو تیژ

مزاج خشن أو سمج

**ˈhorsepower** *n* [U] هێزا هەسپ، ئەسپەتوانا، شیانا هەسپ، (کورت دەکرێتەوە بۆ *h.p*)

قوة حصان، القدرة مقدرة بالحصان (وتختصر الى *h.p*)

**ˈhorse-radish** *n* [U] توری تون، تەڤرێ توژ

فجل حريف / حار

**ˈhorseshoe** ناڵ، ناڵی ئەسپ

حدوة الحصان، نعل الفرس

**ˈhorsewhip** *n* [C], *vt* (-pp) قامچی، جەلدەی لێ ئەدا بەقامچی لەئەسپ ئەدا

سوط، يجلد، يسوط الحصان

**ˈhorsewoman** *n* [C] ئەسپ سوار (ژن)

فارسة، خيالة

**horticultural** /ˌhɔːtɪˈkʌltʃəl/ *adj* پەیوەست بە بێستانکاری

متعلق بالبستنة أو فلاحة البساتين

**horticulture** /ˈhɔːtɪkʌltʃə(r)/ *n* [U] بێستان زانی، هونەری کشتوکاڵ، بێستانزانی

البستنة، فن زراعة الأزهار والثمار والخضر

**[1]hose** /həʊz/ *n* [C,U] سۆندەی ئاو، باخ ئاودەدات

خرطوم مياه يسقي (حديقة)

□ *vt* بەسۆندە ئۆتۆمبیل دەشوات

يغسل (سيارة) بالخرطوم

**[2]hose** /həʊz/ *n* ١. ناوی بازرگانی بۆ گۆرەوی درێژ ٢. پانتۆڵی تەسك کاتی خۆی بەروانکەو لەبەرئەکرا

١. الأسم التجاري للجوارب الجوارب (إسم جماعي) ٢. بنطلون ضيق كان يلبس في الماضي

*doublet and ~* پانتۆڵی تەسك

صدرة و بنطلون ضيق

**hospitable** /hɒˈspɪtəbl/ *adj* میوان دۆست، مەرد بەخشندە، دەست ئەکری (بۆ میڤانان)

مضياف، كريم، حسن الوفادة

**hospital** /ˈhɒspɪtl/ *n* [C] نەخۆشخانە، بیمارستان، خەستەخانە

مستشفى

**hospitality** /ˌhɒspɪˈtæləti/ *n* [U] میوانداری باش، مێڤانی، مێڤانداری، میوانودوستی

حسن الضيافة، كرم، جود

**[1]host** /həʊst/ *n* [C] مێڤاندار، خانەخوی، خاوەنی ئوتێل یادیوەخان، خاوەن ماڵ

المضيف، صاحب الدعوة صاحب الفندق أو الحانة

**[2]host** /həʊst/ *n* [C] ١. کۆمەڵێك خەڵك

١. حشد كبير، جمع، جمهرة

*~ s of friends* کۆمەڵێك هاورێ

جموع من الأصدقاء

*a ~ of difficulties* کێشە / تەنگوچەڵەمەی بێ سنوور

٢. سوپا

متاعب / مصاعب لا حد لها ٢. (ا.ق) جيش

**Host** /həʊst/ *n the ~* نان لەرۆی خودا خێرکردن

خبز القربان المقدس

**hostage** /ˈhɒstɪdʒ/ *n* [C] بارمتە، کەسێك یان شتێك دەگیرێ وەك بارمتە

الرهينة، شخص أو شيء يحتجز للفدية أو ضمانا لتنفيذ إتفاق

**hostel** /ˈhɒstl/ *n* [C] ئوتێل، خانوو، یانەی لاوان،

میوانگه

فندق، نزل، بيت شباب، دار لأقامة الطلبة

**hostess** /ˈhəʊstɪs/ *n* [C] خانەخوێ، میڤاندار (مێ)

مضيفة

*air ~* خانەخوێ (ژن) میوان بەرێکەری ناڤرۆکە

مضيفة جوية

**hostile** /ˈhɒstaɪl/ *adj* دژ، نەیار، تایبەتە بەدوژمن

معاد، خاص بالعدو

*a ~ army* سوپای نەیار

جيش معاد

*~ looks* مۆرەکردن، دژایەتی

نظرات عدائية

*~ to reform* نەیاری چاکسازی

معاد للأصلاح

**hostilely** *adv* نەیارانە، دوژمنانە

بعداوة، على نحو عدائي

**hostility** /hɒˈstɪlətɪ/ *n* [C,U] (*pl* -ties) نەیاری

دوژمنایەتی، شەڕ (لەشێوەگی کۆ) شەڕ، کاروباری شەڕ

عداء، عداوة، خصومة (في صيغة الجمع) حرب، عمليات حربية

**hot** /hɒt/ *adj* (-ter, -test) ١. گەرم، شلەتێن، داخ

(بروانە *feverish*) تیژ، توون، دژوار

١. حار، ساخن، حام (قارن *feverish*) لاذع، حريف، حاد

*get into ~ water* کەسکون، تێنەکەوێت توشی کێشە نەبێت ٢. (بۆنی راوە ماسی) بەهێزە، دیار

يقع في ورطة، يجر على نفسه المتاعب ٢. (رائحة الأثر في الصيد) قوي، ظاهر

*~ on the trail* شوێنەواری تاوانبار هەڵ ئەگرێ یەکسەر

في أعقاب (مجرم)، في أثره مباشرة

□ *adv* بەپەرۆشەوە، بەگەرمی

بحماسة، بحرارة، بحدة

*blow ~ and cold* جارێ ساردو جارێ گەرم هەڵەکا، جارێ گونجاوو جارێ نەگونجاو

تهب حارة مرة و باردة اخرى ملائم تارة وغير ملائم تارة اخرى

**ˌhot ˈair** *n* [U] قسەی پرۆپوچ

هراء، هذر، كلام فارغ

**ˈhotbed** *n* [C] گەرمەوەرارگە، تاوانکردن یا سوکایەتی، شوێنێك پەینی ترشاوی تیابێ، سەلوێنك

منبت فيه سماد متخمر (مجاز) مرتع (للجريمة أو الرذيلة)

**ˌhot-ˈheaded** *adj* گوژیەستوو، سەرگەرم، سەرچڵ، خەیدوك، گەوج، هوڵ

(شخص) مندفع، متهور

**ˈhot-house** *n* [C] خانووی شوشە بۆ رووەك رواندن

بيت زجاجي لتنمية النباتات

**hotly** *adv* بەپەرۆشی، بەگەرمی

بحماسة، بحرارة، بأندفاع

*~ pursued by the enemy* دوای دوژمن کوتوە

ملاحق من الأعداء بلا هوادة

**hotness** *n* [U] گەرمی، گەرما، تاڵێ هاتن

حرارة، سخونة، إندفاع

**hotchpotch** /ˈhɒtʃpɒtʃ/ *n* تێکەڵ وپێکەڵ، تێکەڵ

خليط، لخبطة، خربطة

**hotel** /həʊˈtel/ *n* [C] ئوتێل، خان

فندق، نزل

**hound** /haʊnd/ *n* [C] ١. تانجی راوکردن، تاژی ٢. کەسێکی سوك، چەقاوەسوو، سپڵە

١. كلب صيد، كلب ٢. شخص دنيء، نذل، وغد

□ *vt* لێ ئەکۆڵێتەوە، دوای دەکەوێ، تەنگەتاوی ئەکا

ينعقب، يلاحقه، يضايقه

*~ ed by one's creditors* خاوەن قەرز بەدوای ئەچێ یان دوای ئەکەوێ

يتعقبه أو يلاحقه الدائنون

**hour** /aʊə(r)/ *n* [C] ١. سەعات، کاتژمێر، ٦٠ خولەك

١. ساعة، ستون دقيقة

*at the eleventh ~* لەدوا ساتدا

في آخر لحظة

*the small ~ s* کاتی کازیوە، بەرەبەیان

ساعات الصباح الباكر

*a clock that strikes the ~ s* ٢. سەعات، کاتژمێرەکە لێ ئەدات لەکۆتایی سەعاتەکاندا

٢. ساعة، ساعة تدق الساعات

*office ~ s, 9.30 a.m. to 5.30 p.m.* ٣. (لە شێوگی کۆ) کاتی دیاری کراو، کاتی ئیش نۆو نیوی بەیانی هەتا پێنج ونیوی ئێوارە

٣. (في صيغة الجمع) زمن محدود وبخاصة للعمل، ساعات

العمل من التاسعة والنصف صباحاً إلى الخامسة والنصف، مساء

*keep early/late ~ s* ئەچێتە ناو جێگا زوو هەڵئەسێ لەخەو زوو / درەنگ ٤. دواکەوتوە لەو وەختە، کاتە

يأوي إلى فراشه ويصحو في وقت مبكر / متأخر ٤. متأخر في ساعة كذا، في وقت كذا

*in the ~ of danger* لەوکاتە / کاتی مەترسی

في ساعة / وقت الخطر

*questions of the ~* کێشەی سەعات

قضايا الساعة

**hourly** /ˈaʊəlɪ/ *adv* هەموو کاتێ، بەردەوام، هەردەم ژمێرەکێ لە هەموو کاتێ

كل ساعة، في كل ساعة

**¹house** /haʊs/ *n* [C] (*pl ~ s*) ١. ماڵ، خانو، ئاقاپی، ماڵ، جێنشین، بەراوردیکە بە

١. بيت، منزل، مسكن

*hatel, block of, flats, offce, factory keep ~*

کاروباری ماڵ ئەبابەرێوە

١. بيت، منزل، مسكن (قارن *block of, hotel*) يدبر شؤون المنزل

*H~ s of Parliament* ٢. ئەنجومەنی نوێنەرایەتی وپیران، پەرلەمان

٢. مجالس النواب والشيوخ، البرلمان ٣. (المتفرجون في) مسرح

*a full ~* ٣. (سەیرکەران) شانۆ

الصالة مملوءة، جميع المقاعد مشغولة

*bring down the ~* هۆڵەکە پرە لە خەڵك، شوێنەکان گیراون

(الممثل) يثير عاصفة من الهتاف أو التصفيق

*the H~ of Windsor* ٤. خێزانی شاهانەی بەریتانی، خێزانی وندسور ٥. خانو، دامەزراوی بازرگانی

٤. عائلة، أسرة: أسرة وندسور (العائلة المالكة البريطانية) ٥. دار، مؤسسة تجارية

**ˈhouse agent** *n* [C] دەلالی خانوو بریکاری خانوبەرە

سمسار منازل، وكيل عقاري

**ˈhouseboat** *n* [C] بەلەمێك بۆ دانیشتن (لەرووباردا) ماڵ گەمی

المركب معد للسكنى (بخاصة في نهر) عوامة

**ˈhousebreaker** *n* [C] ١. کرێکار هەڵئەسێ بە رووخانی خانووی کۆن ٢. دزی ماڵان بەرۆژ (بەراوردیکە لەگەڵ *burglar*)

١. عامل يقوم بهدم المنازل القديمة ٢. لص المنازل، لص يقوم بالسطو على المنازل نهاراً (قارن *burglar*)

**ˈhousehold** *n* [C] ماڵ، خێزان، خانەخوێ

عائلة، أهل الدار، المنزل و من فيه

**ˈhouseholder** *n* خاوەن ماڵ یا کرێچی

صاحب منزل أو مستأجره

**ˈhousekeeper** *n* [C] ژنی خاوەن ماڵ

مدبرة شؤون المنزل

**ˈhousemaid** *n* [C] کارەکەر (لە ماڵدا)

الخادمة (في منزل)

**ˈhousemaster** *n* [C] مامۆستای چاودێر لە بەشی ناوخۆ

مدرس يشرف على مدرسة داخلية

**ˈhousewife** *n* [C] بانو، کابان، کەیبانو (بەراوردیکەلە گەڵ *housekeeper*)، خاتون، خانم

ربة بيت (قارن *housekeeper*)

**ˈhousework** *n* ئیشی ماڵ

شغل البيت، الأعمال المنزلية

**²house** /haʊz/ *vt* ١. نیشتەجێ دەبێ، داڵدەی دەدا

١. يسكن، يؤوي ٢. يضع، يحفظ

*Where to ~ my books is a problem.* ٢. دائەنێ، ئەپارێزێ کێشەکە ئەوەیە جێگە نیە بەراوەکانم دانیم

إنها لمشكلة أجد مكانا أضع فيه كتبي هو مشكله

**housing** /ˈhaʊzɪŋ/ *n* ١. نیشتەجێ کردن، حەواندن

١. إيواء، إسكان

*the ~ problem* ٢. کێشەی نشتەجێ بوو، جێ‌ورێ نیشتەنی

٢. سكنى، مساكن، مشكلة السكن

**ˈhousing estate** *n* [C] شوێنی نیشتەجێبون، ٣. قەپاغ، قوتو

منطقة سكنية ٣. غطاء وقاء علبة (لأجزاء آلة)

**hove** /həʊv/ بروانە *heave*

انظر *heave*

**hovel** /ˈhɒvl/ *n* [C] خانوچکە، ماڵی پچوکی پیس

كوخ، منزل صغير قذر

**hover** /hɒvə(r)/ *vi* (باڵندە) دەفڕێت (کەسێك) دەوروخول ئەکا، خولێرێتی ئەکا، دەگەڕێت
(الطائر) يحوم، يحلق (الشخص) يحوم، يتسكع

**'hovercraft** *n* [C] جۆرە بەلەمێکە لەسەر دۆشەکێکی هەوایی دەڕوات
حوامة، مركبة تسير محمولة على وسادة من الهواء

**how** /haʊ/ *adv* ١. تاچ رادەیەك، بەچ رێگایەك؟
١. كيف، إلى أي مدى أو درجة، بأي طريقة؟
*He told me ~ he had seen it in the newspaper.*
٢. چۆن، پێی وتم چۆن بینی لەرۆژنامەدا
٢. كيف، أخبرني كيف رآها في الصحيفة
*H~ about going for a walk?* رات چۆنە؟ رات چیە پێاسە بکەین؟
ما رأيك؟ ما رأيك في القيام بترهة؟
*H~ s that for a beginner?* ئایا ئەمەش باش نیە بۆدەستپێکەر؟ (وەڵام زۆر باشەیە)
أليس هذا جيداً بالنسبة لمبتدىء؟ (السائل يتوقع ان تكون الاجابة جيد جداً)

**however** /haʊ'evə(r)/ *adv* بەهەرشێوازێ یا رێگەیەك، هەرچۆنێ بێ، هەرکور بێ
بأي وسيلة أو طريقة مهما
□ *conj* بەهەرحاڵ و لەگەڵ ئەوەشدا، بەڵام
و مع ذلك، في ناحية اخرى، ولكن

**howl** /haʊl/ *n* [C] لورە، وەڕین، قیژە، حەپین، پێکەنینی گاڵتەپێکردن
عواء، نباح، صرخة، ضحكة ساخرة
□ *vt, vi* ئەلورێنی، ئەوەڕێ، ئەحەپێ، ئەلاوێنەوەو
يعوي، ينبح، يولول، يصرخ
*the wind ~ ing through the trees*
بەزریکێنێ پاکەگڤەی دێ لەبەینی درەختەکانەوە
الريح تزمجر من خلال الأشجار
*~ ing with pain/laughter* لەئازا ئەزریکێنێ / لەپڕ بەقیژە
يصرخ من الألم / ينفجر
*~ a speaker down* بێ دەنگی دەکات
يسكت متحدثاً بالصياح المعادي

**howler** *n* هەڵەی شایەنی پێکەنین
(ل. د) غلطة تدعو إلى الضحك

**hub** /hʌb/ *n* [C] تەوەرە، نیڤا چەرخی تەوەرەی چالاك
محور العجلة (مجاز) محور النشاط

**hubble-bubble** /'hʌbl bʌbl/ *n* [C] = *hookah.* نێرگەلە، نارگیلە
نارجيلة، شيشة

**hubbub** /'hʌbʌb/ *n* [U] هەرا، دەنگە دەنگ، قاوقیژ هەلەبەل، گالەگوت، قەرقەشە
ضجيج، صخب، هرج و مرج

**huddle** /'hʌdl/ *vt, vi* ١. کۆ دەبێتەوە
١. يجتمع، يحتشد، يلتف
*sheep huddling together for warmth* گرد ئەبێتەوە، مەڕەکان گرد ئەبنەوە بۆ ئەوەی گەرمبنەوە
أغنام تلتف حول بعضها طلباً للدفء
*~ (oneself) up* ٢. خۆی ئەپێچێتەوە، خۆی گورج ئەکاتەوە تا گەرم بێتەوە
٢. يلتف (حول نفسه) (يتكور في جلسته طلباً للدفء)

**[1]hue** /hju:/ *n* [C] رەنگ، بۆیە
لون، تدرج في اللون

**[2]hue** /hju:/ *n* *~ and cry* هاواری بەدواکەوتن (بەدوای تاوانبارێك) نارەزایی دەربڕین بۆ شتێك
صيحة المطاردة (في أثر مجرم)، إحتجاج على أمرما

**huff** /hʌf/ *n* *in a ~* تورە، زویر
غاضب، مستاء

**hug** /hʌg/ *vt* (-gg-) لەئامێزی دەگرێ، خۆی پێ هەڵئەواسێ
يعانق، يتشبث ب... (معتقد مثلاً)، (السفينة) تظل بمحاذاة الساحل
□ *n* [C] هەمێز باوەش
عناق، التزام

**huge** /hju:dʒ/ *adj* زل، مەزن، قەبە، گەورە
ضخم، هائل

**hulk** /hʌlk/ *n* [C] ١. کەشتی کۆن لەکارکەوتوو یا لەکۆندا بەکارئەهات وەك زندان ٢. کەسێکی زل وقەبەوکەتە
١. سفينة قديمة غير صالحة أو كانت تستخدم (فيما مضى) سجناً
٢. شخص ضخم ثقيل الحركة

**hulking** *adj* گەورە، قورس
ضخم، ثقيل

**[1]hull** /hʌl/ *n* [C], *vt* قالك، توێکڵی دەرەوە (پاقلە یا

بزاليا)، تويكلّى لىّ ئەكاتەوە
القشرة الخارجية (للفول أو البازلاء)، يقشر

**²hull** /hʌl/ *n* [C] لاشەپاپەيكەرى كەشتى
بدن أو هيكل السفينة

**hullo** /hə'ləʊ/ *int hallo.*

**hum** /hʌm/ *vi, vt* (-mm-) هەم همە ئەكا، ورتە ورت، منگەمنگ ئەكا
يهمهم، يطن، يدندن، يترنم (وشفتاه مغلقتان)

*~ a song to oneself* بەورتەورت گورانى ئەلّىّ
يدندن بأغنية لنفسه

*a factory ~ming with activity* كارگەيەك پرجولّەو چالاكيە
شركة تعج بالحركة والنشاط

*make things ~* دەسازێنێت بارێكى جولّەو چالاكى
يحدث حالة من الحركة والنشاط

□ *n* [C] منگە منگ
همهمة، دندنة

*the distant ~ of traffic* هەنگى جولەى رۆيشتن لەدوورەوە
همهمة حركة السير من بعيد

**'hummingbird** *n* [C] بالّندەى گيزەكەرە
طائر طنان

**human** /'hju:mən/ *adj* مرۆڤ، مرۆيى
آدمي، بشري، إنساني

*a ~ being* مرۆڤ
إنسان

**humanly** *adv* مرۆڤى لە رووى مرۆيىيەوە
بشرياً، من الوجهة البشرية

*all that was ~ possible* هەموو ئەوەى لە تواناى مرۆڤ دا بێت
كل ما هو في طاقة البشر

**humane** /hju:'meɪn/ *adj* مرۆڤايەتى، بەزەيى
إنساني، شفوق

*~ learning/studies* دلۆڤانى/خوێندنى مرۆڤايەتى
إنسانيات/دراسات إنسانية

**humanely** *adv* بەبەزەيى بە سۆز، بەمرۆڤايەتى
بشفقة، بعطف، على نحو إنساني

**humanism** /'hju:mənɪzəm/ *n* [U] مرۆيى، بزوتنەوەى مرۆڤايەتى كەبرواى وايە مرۆڤ دەتوانىّ بونى خۆى بسەپێنێ لەرێى هۆش نەك ئاينەوە
إنسانية، الحركة الإنسانية (وهي تؤمن أن الأنسان قادر على تحقيق ذاته عن طريق العقل لا الدين)

**humanitarian** /hju:,mænɪ'teərɪən/ *adj, n* [C] چاكە، خێرەومەن (بەچارەكردنى ئازارى خەلّك و چاكسازى)، خێركار
خير، محب للخير العام (بالعمل على تخفيف آلام الناس وإصلاح القوانين)

**humanitarianism** *n* كارى خێر، چاكە، مرۆڤايەتى
الأحسان انسانيه، خيريه

**humanity** /hju:'mænətɪ/ *n* [U] ١. مرۆڤايەتى رەگەزى مرۆڤ، مرۆڤ، بونەوەر ٢. سروشتى، مرۆڤايەتى ٣. مرۆڤايەتى، بەزەيى
١. الجنس البشري، البشر الخليقه ٢. الطبيعة الانسانية ٣. انسانية، شفقة

*the humanities* تۆژینەوەى مرۆييەكان وەك رەگەزى مرۆڤ، مرۆڤ، تۆژینەوەى رۆشنبيرى يۆنانى و لاتينى
دراسة الثقافه اليونانية واللاتينية

**humanize** /'hju:mənaɪz/ *vt, vi* دادەمالّىّ، دەيكاتە مرۆڤ، مرۆڤى دكت قەنج دكت
يخلع (على شيء) الصفات البشرية. يعد له ليتلائم مع طبيعة البشر

**humble** /'hʌmbl/ *adj* (-r, -st) سادە، ساكار، بىّ فيز، چەوساوە، هەژار
متواضع، وضيع، ذليل، فقير

*men of ~ birth* پياوى، بێفيز، دەستبلاو
رجال من أصل متواضع

*~ occupations* كارى ساكار/سوك (وەك جادە پاك كردنەوە)
مهن متواضعة/وضيعة (تنظيف الشوارع مثلا)

□ *vt* (ئەپرەتێنێ، ئەيچەوسێنێ، ملكەچى ئەكا
يقهر، يذل، يخضع

**humbly** *adv* بەسادەيى، بەداماوى، بەمل كەچى
بتواضع، بتذلل، بضعة

**humbug** /'hʌmbʌg/ *n* [C,U] فێلّ، هەلّخەلّەتاندن، گزى، گالّتەجارى
خدعة، مخادعة، إحتيال، هراء

هەڵەخەڵەتێنێ، گزی لێ ئەکا، فێڵی لێ ئەکا □ vt (-gg-)

يخدع، يحتال على، يغش

هەڵەخەڵەتێنێ بۆ قایلبون بەکردنی شتێك / شتی لێ بدزێ ~ sb into/out of

يحتال عليه ليقنعه بعمل شيء / ليسلبه شيئاً

**humdrum** /'hʌmdrʌm/ *adj* هیچ وپوچ، وەڕس کەر، کەم بایەخ

مبتذل، مضجر، رتيب

**humid** /'hju:mɪd/ *adj* (ئاوهەوا، کەش) شێدار، تەڕ

(الهواء، الطقس) رطب، ندي

**humidity** /hju:'mɪdɪtɪ/ *n* [U] شێداری، تەڕی (کەش)

رطوبة (في الجو)

**humiliate** /hju:,mɪlɪ'eɪt/ *n* [U] ئەبچەوسێنێ، زەبونی ئەکات، سوکایەتی پێ ئەکات

يذل، يهين، يحقر

**humiliation** /hju:,mɪlɪ'eɪʃn/ *n* [U] چەوساندنەوە، سوکایەتی پێکردن، سەرشۆڕی، زەبونکرن، شەرمەزاری

إذلال، تحقير، إهانة

**humility** /hju:'mɪlətɪ/ *n* [U] ساکاری، ملکەچی

تواضع، خضوع، مذلة

**hummock** /'hʌmək/ *n* گردۆلکە، تەپۆڵکە

ربوة، أكمة، رابية

**humorist** /'hju:mərɪst/ *n* [C] نوسەری گاڵتەجاڕ، قۆشمە، ترانەکەر

كاتب فكاهي، كاتب ساخر

**humorous** /'hju:mərəs/ *adj* گاڵتە، گاڵتەجاڕ، توانجاوی، قۆشمەچی، پێکەنینی

فكه، هزلي، ساخر

~ *remarks* تێبینی توانجدار

ملاحظات ساخرة

**humour** /'hju:mə(r)/ *n* [U] ١. گاڵتەوگەپ، دەست بازی، ڕوخۆشی، گاڵتە، قۆشمەیی

١. مزاح، دعابة، ظرف، مرح

*a story full of ~* چیرۆکی پڕ لە گاڵتە

قصة مليئة بالدعابة

*have a good sense of ~* ئارەزوی زۆری بەدەست بازیە، نوکتەبازە

لديه حس مرهف للدعابة، حاضر النكتة

٢. گاڵتەی خۆش / ناخۆش *in a good/bad ~*

٢. مزاج، رائق / معكر المزاج

زویرکەر / دڵتەنگ ئەکات *not in the ~ for work*

هەوەسی کارکردنی نیە، بەدڵی ئەکا

ليس لديه مزاج للعمل

چاودێری ئەکا □ *vt*

يجاري، يداري

**hump** /hʌmp/ *n* [C] پشت قوپاو، کۆپارە، کۆمی پشت، قەمبور

سنام، حدبة

**humus** /'hju:məs/ *n* [U] پەین، سەرچاوەکەی گیاندار وڕووەك پێ، ئاخا ئەندامێ

الدبال، مواد عضوية متحللة لها خواص السماد

**hunch** /hʌntʃ/ *n* ١. کۆم، پشتی کۆم ٢. پارچەیەکی گەورە (وەك لە نان)

١. حدبة، تقوس في الظهر ٢. قطعة كبيرة (من الخبز مثلاً)

٣. دڵی ئاگاداری کردوە کە شتێك ڕوو ئەدات *have a ~ that...*

٣. (ل.د) لديه شعور / إحس داخلي بأن (شيئاً سيحدث مثلاً)

ئەچەمێنەوە □ *vt*

يحني، يقوس

شان دائەنەوێنێ *~ the shoulders*

يحني كتفيه

**'hunchback** *n* [C] کۆم، قەنبور، قەمبور

أحدب، ذو قتب

**hundred** /'hʌndrəd/ *n* [C] سەد

مائة، ١٠٠

**'hundredweight** *n* [C] (ئەنوسێ *cwt*)

(تكتب *cwt*) $\frac{1}{20}$ من الطن

**hundredth** /'hʌndrədθ/ *n* [C], *adj* سەدەم، بەشێك لە سەد

المائة، جزء من مائة

**hung** /hʌŋ/ بڕوانە (*hang*)

انظر (*hang*)

**hunger** /'hʌŋgə(r)/ *n* [U] ١. برسی، برسێتی، بێ تاقەتی

١. جوع، سغب، الطوى

*die of ~* لەبرسانەمرێ
يموت جوعاً
*satisfy one's ~* تێر ئەبێ / تێری ئەکا ۲. حەز، ئارەزووی زۆر
يشبع، يرضي جوعه ۲. شوق، رغبة ملحة، ولوع
*a ~ for adventure* حەز لە سەرکەشی ئەکا
ولوع في المغامرة
□ *vi* برسی ئەبێ، برسیەتی ئەچێژێ
يجوع، يعاني من الجوع

**'hunger-strike** *n* [C] مان گرتن لەخواردن
إضراب عن الطعام

**hungrily** /hʌŋgrəlɪ/ *adv* بە هەڵپە، بەچڵێسی، بەپەرۆشیەکی زۆرەوە
بشراهة، بلهفة بالغة

**hungry** /'hʌŋgrɪ/ *adj* برسی
جائع

**hunk** /hʌŋk/ *n* [C] پارچەیەکی گەورە (لە گۆشت)
قطعة ضخمة (من اللحم مثلاً)

**hunt** /hʌnt/ *vt, vi* ۱. دەچێت بۆ راو، راو دەکات ۲. بۆی‌ئەگەرێ، لێ‌یدەگەرێ
۱. يصطاد، يصيد، يتصيد ۲. يبحث عن، يفتش
*~ for a lost book* ئەگەرێت بۆ پەراوێکی وون بوو
يبحث عن كتاب مفقود
*~ sb/sth down* دوای تاوانبار ئەگەوێ تادەستگیری ئەکا / دەگەرێ بۆ شتێك تا دەیدۆزێتەوە
يطارد (مجرما) إلى ان يقتنصه / يبحث عن شيء إلى أن يجده
*~ sth up* ئەگەرێ بۆ (شتێك کەدۆزینەوەی کارێکی گرانە)
يبحث عن (شيء يصعب العثور عليه كالملفات والمعلومات)
□ *n* [C] (دۆسیەوزانیاری) راوکردن، بەدواکەوتن
صيد، مطاردة

**hunter** *n* [C] نێچیرڤان، راڤیار، راڤکار، راوکەر (پیاو)
صياد

**huntress** /'hʌntrɪs/ *n* [C] راڤکار، راوکەر (ژن)
صيادة

**huntsman** /'hʌntsmən/ *n* راوکەر
الصياد

**hurdle** /'hɜ:dl/ *n* [C] ۱. پەرژینی گوێزراوە، بەربەستی تەختەت ۲. بەربەستی تەختە (وەرزشی)
۱. سياج نقال، حاجز خشبي ۲. حاجز خشبي (رياضة)
*~ race* پێشبرکێی بەربەستەکان
سباق الموانع

**hurdler** *n* [C] پێش برکێ کەر لە پێش برکێی بەربەستەکان
متسابق في سباق الموانع

**hurl** /hɜl/ *vt* ئەیهاوێ، بە توندی هەڵی ئەدا
يقذف، يرمي بعنف

**hurly-burly** /'hɜ:lɪ bɜ:lɪ/ *n* [U] دەنگەژاو، هەرا، قاوقیژ
ضجيج، جلبة هرج و مرج

**hurrah** /hʊ'rɑ:/, **hurray** /hʊ'reɪ/ *int* پێشوازیگەرم، بۆ دەست خۆشی و بەخێرهاتن
هتاف يدل على الأبتهاج أو الأستحسان أو الترحيب

**hurricane** /'hʌrɪkən/ *n* [C] زریان، گەردەلولی بەهێز
اعصار، زوبعة شديدة

**hurry** /'hʌrɪ/ *n* [C,U] (لەگەڵ ئامرازی نەرێ وپرسیار) پێداویستی پەلەکردن، پەلەئەکا، تاوی‌ئەدا، خێرا ئەبێ
(مع النفي أو الأستفهام) حاجة للعجلة، يسرع، يعجل، يستعجل
*There's no ~* پێویستی بە پەلە نیە
لاحاجة للعجلة
*What's the ~?* چ پێویست ئەکا بە پەلەکردن؟
ما الداعي إلى العجلة؟
*in a ~* پەلەیەتی، لەکارەکەی بەپەلەیە
مستعجل، في عجلة من أمره
□ *vt, vi* تاوی‌ئەدا، داوائەکا خێرابێ
يعجل، يحث على الأسراع
*~ up* خێرابە، زووکە، پەلەبکە
إسرع، عجل
*~ away* بە پەلە دورئەکەوێتەوە
يبتعد بعجلة
*~ (over) one's work* پەلە ئەکا لە کارەکەی زوو تەواوئەکا
يعجل في عمله، ينهي عمله بعجلة

**hurried** *adj* خێرا، بەپەلە، لەزین
مسرع، مستعجل

**hurriedly** *adv* بەپەلە، بەخێرایی، بەلەز

بحة، خشونة الصوت

**hussar** /hʊ'zɑ:(r)/ *n* سەرباز بە چەکی‌سوارە سەربازی سواری سڤك

جندی من سلاح الفرسان

**hussy** /'hʌsɪ/ *n* (*pl* -sies) ژنی داوێن پیس، خراپ

أمرأة، فاجرة، فتاة وقحة

**hustle** /'hʌsl/ *vt, vi* بەتوندی پاڵ پێوەدەنێ پاڵەپەستۆ دەکا، پەلە دەکات

يدفع بخشونة، يزاحم، يعجل، يدفع إلى العمل بنشاط بالغ

□ *n* [U] بە چوستی زۆر پاڵ دەنێ بۆ کارکردن چوست‌وچالاکی

نشاط و حيوية

**hut** /hʌt/ *n* [C] زنج، کولیت، کوشك

كوخ، خص، كشك

**hutch** /hʌtʃ/ *n* [C] سندوق، لانە یاقەفەزی کەروێشك، کۆلکەوار

صندوق، بيت أو قفص للأرانب

**hyacinth** /'haɪəsɪnθ/ *n* [C] یاقوتا شین، کلدان گوڵە سوسن سمبول

الكحلة، الياقوتية، زهرة في فصيلة الزنبقيات

**hyaena** /haɪ'i:nə/ = *hyena.* کەمتیار

الضبع

**hybrid** /'haɪbrɪd / *n* [C] دوورەگ، مەلەزی

هجين، مولد

*A mule is a ~ animal.* هێستر ئاژەڵی دوورەگە (لەدوورەگەزی جیاوازە)

البغل حيوان هجين (من أبوين مختلفين جنسياً)

**hydrant** /'haɪdrənt/ *n* بۆری ئاوی سەرجادە بۆ پاك کردنەوە یان ئاگر کوژاندنەوە

حنفية أو صنبور مياه في الشوارع للتنظيف أو لأطفاء الحريق

**hydraulic** /haɪ'drɔ:lɪk/ *adj* هایدرۆلیکی، ئاوی

هيدروليكي، مائي

**hydro-** /'haɪdrəʊ/ *prefix* پێشگرێکە بە مانای ئاوی یا هایدرۆجینی

بادئة معناها (مائي) هيدروجيني

بأستعجال، بتعجل

**hurt** /hɜ:t/ *vt, vi* (*pt, pp* hurt) ئازاردەدات، ژان ئەکا توشی ئازارئەبێ، بریندار دەکات

يؤذي، يؤلم، يصاب بأذى

□ *n* [U] ئازار، زیان

أذى، ضرر

**hurtful** *adj* بەئازارە، زەرەرمەند، بەئێش‌وئازار

مؤذ، ضار، مؤلم، موجع

**hurtle** /'hɜ:tl/ *vi* (وای لێ‌ئەکا) دەرپەڕێ بەتوندی‌و خێرایی

(يجعله) يندفع بعنف وسرعة

**husband** /'hʌzbənd/ *n* [C] هاوسەر، شو، مێرد

زوج، بعل

*~ one's strength* دەست‌پێوەدەگرێ، پاشەکەوت ئەکا، هێزی کۆ ئەکاتەوە

يقتصد، يوفر يدخر قواه

**hush** /hʌʃ/ *vt, vi* ورتەی دەبرێ، بێ‌دەنگی‌دەکا، ناچاری‌ئەکا بێ‌دەنگ‌بێ

يصمت، يسكت، يجبر على الصمت، يخمد، يقمع (في صيغة الامر)

*~ sth up* بێ دەنگ بە، هش، وس، هەواڵێك ئەپۆشێ، ئەیشارێتەوە، دەینێژێ

اصمت، صه، يكم خبرا، يخفيه، يطمسه

□ *n* [U] بێ‌دەنگی، ئارامی، هێمنی

صمت، سكون، هدوء

**husk** /hʌsk/ *n* [C] سۆس، کەپەك

قشرة الثمرة أو البذرة بخاصة الحبوب

□ *vt* توێکڵی لێ ئەکاتەوە

يقشر

**husky** /'hʌskɪ/ *adj* (-ier, -iest) (وشك) وەك توێکڵ (دەنگ) نوساو، دەنگ گڕ، نوساو

أجش، مبحوح

**huskily** *adv* بە دەنگ گڕی

على نحو أبح أو أجش

**huskiness** *n* [U] گڕی، دەنگی گڕ، دەنگ ژێکەتی

**hydroelectric** /ˌhaɪdrəʊɪˈlektrɪk/ *adj*
هایدرۆکارەبایی، کارۆئاوی
هیدرو کهربائي، متعلق بتوليد الكهرباء من الماء

**hydrogen** /ˈhaɪdrədʒən/ *n* [C] هایدرۆجین
هيدروجين، الأيدروجين

**hydrophobia** /ˌhaɪdrəˈfəʊbɪə/ *n* [U] دەردەسەگ، هاری، ئاف ترسی
داء الكلب، الرهبة من الماء

**hyena, hyaena** /haɪˈiːnə/ *n* کەمتیار
ضبع

**hygiene** /ˈhaɪdʒiːn/ *n* [U] دروست زانی
علم الصحة

**hygienic** /haɪˈdʒiːnɪk/ *adj* دروستی، پاکژکراو لەمیکرۆب، پاقژ، خاوین
صحي، خال من الجراثيم

**hygienically** *adv* دروستیانە، لەلایەنی تەندروستیەوە
صحياً، من الناحية الصحية

**hymn** /hɪm/ *n* [C] دوعا، سروودی ئاینی، ستایشی کردنی خوا
ترتيلة، أنشودة دينية، تسبيح بحمد الله

**hymnal** /ˈhɪmnəl/ *n* [C] پەراوی سروودی ئاینی
كتاب تراتيل أو ترانيم دينية

**hyper-** /ˈhaɪpə/ *prefix* پێشگرێکە بەمانای زۆر یان سەرەرای
بادئة معناها الأفراط في

*~ critical* زیادەرەولەرەخنەگرتن، توندرەو لە رەخنەگرتن
مفرط في الأنتقاد، متطرف في النقد

*~ sensitive* زۆر هەستیارە، لەرادە بەدەر هەستیارە
شديد الحساسية، مفرط في الحساسية

**hyperbole** /haɪˈpɜːbəlɪ/ *n* [C,U] زل کردن، پێوەنانی نفوم کردن (رەوانبیژی)
مبالغة، غلو، إغراق (بلاغة)

**hyphen** /ˈhaɪfn/ *n* [C] (-) هێلی بچوك لە نێوان دوو وشەی لێکدراویان بۆ جیاکردن، گەیەنەر، هێلی کورت
شرطة بين جزئي كلمة مركبة أو لفصل بين الكلمات، الواصلة، خط قصير

ئینگلیزی فەرەنسی *Anglo-French*
أنجليزي ـ فرنسي

**hypnosis** /hɪpˈnəʊsɪs/ *n* [C,U] (*pl* -ses) خەواندنی موگناتیسی، نواندنی موگناتیسی
التنويم المغناطيسي

**hypnotic** /hɪpˈnɒtɪk/ *adj* بەکاریگەری موگناتیسی
ذو تأثير مغناطيسي

**hypnotism** /ˈhɪpnətɪzəm/ *n* [U]
خەوخستنی موگناتیسی
التنويم المغناطيسي

**hypnotist** /ˈhɪpnətɪst/ *n* خەوێنەری موگناتیسی
منوم مغناطيسي

**hypnotize** /ˈhɪpnətaɪz/ موگناتیسی دەیخەوێنێ
ينوم مغناطيسياً

**hypocrisy** /hɪˈpɒkrəsɪ/ *n* [C,U] (*pl,* -cies)
دووروویی، ریایی
نفاق، مراءة

**hypocrite** /ˈhɪpəkrɪt/ *n* [C] دووروو، ریاکەر
منافق، مصانع، مراء

**hypocritical** /ˌhɪpəˈkrɪtɪkl/ *adj* بەریا، ریاکار، درۆینە، دوو رووپانە
نفاقي، ريائي، زائف

**hypocritically** *adv* بەشێوەیەکی ریاکاری یان درۆیانە
على نحو نفاقي أو زائف

**hypodermic** /ˌhaɪpəˈdɜːmɪk/ *adj* ژێر پێست / ژێر چەرم
تحت الجلد

*~ needle/syringe* دەرزی لێدانی ژێر پێست
إبرة للحقن تحت الجلد

**hypothesis** /haɪˈpɒθəsɪs/ *adj* گریمان، گریمانکاری، رایەکی زانستیانە کە هێشتا نەسەلمێندراوە
فرض، فرضية، رأي علمي لم يثبت بعد

**hypothetical** /ˌhaɪpəˈθetɪkl/ *adj* گریمان، بەگریمان، وادانان
فرضي، على سبيل الأفتراض

**hysteria** /hɪˈstɪərɪə/ *n* [U] ١. هیستریا ٢. شێتگیری، هەڵچوونی دەماری پەشێوی زۆر
١. هستريا، تهيج عصبي ٢. هياج عصبي، إنفعال

**hysterical** /hɪˈsterɪkl/ *adj* پەرکەمانە، توشی نۆرەی پەرەکەم بووە
هستيري، مصاب بنوبات عصبية

**hysterics** /hɪˈsterɪks/ *npl* نۆرە پەرکەم، هستریا، توشی هیستریا ئەبێ
نوبة هستريا، يصاب بنوبة من الهستريا

*go into* ~ (پێکەنینی یان گریانی ناکاو و خۆنەویست)
(ضحك أو بكاء مفاجيء)

# I

[1]I, I /aɪ/ (*pl* i's /aɪz/) پیتی نۆیەم لەئەلفبێی ئینگلیزی
الحرف التاسع من الابجدية الانكليزية

[2]I /aɪ/ *pers pron* من، راناوی کەسی یەکەمی تاك
انا، ضمير المفرد المتكلم

**ice** /aɪs/ *n* [U] بەفر، سەهۆڵ، سەخوار، قەشا، زوقم
جليد، ثلج

*break the ~* بێ دەنگی ئەشکێنێ، دەست پێشکەری قسەکردن لەگەڵ بێگانەیەکدا دەکات، شەرم ئەشکێنێ
يكسر الجمود، يبادر غريباً بالحديث، يزيل الكلفة

□ *vt, vi* ١. ساردی ئەکاتەوە، ئەیبەستێنێ، (خواردەمەنی)
١. يبرد، يجمد (المأكولات)

*~ d water* ئاوی سەهۆڵاو ٢. بەبەفر دایئەپۆشێ، کێکێك بە کرێمە دائەپۆشێ
ماء مثلج ٢. يكسو (يغطي) بالثلج، يغطي كعكة بطبقة رقيقة من مسحوق السكر والبيض والحليب

'**Ice Age** *n* چەرخی سەهۆڵین
العصر الجليدي

'**iceberg** *n* [C] بەفرەچیا ـ چیای بەفرین / چیای سەهۆلی، شاخی سەهۆڵ، مرۆڤی سار
جبل جليدي عائم

'**icebound** *adj* بەسەهۆل دەورە گیراوە، جەمەدگرتی
محاط أو محصور بالجليد

'**icebox** *n* [C] بەفرگری بچوك، بەفردانك
ثلاجة صغيرة، براد

,**ice-'cream** *n* دۆندرمە، بەستەنی
بوظة، جيلاتي، دندرمة

'**icefield** *n* [C] کێلگە / کەستەك سەهۆڵی
حقل / طوف جليدي

**icicle** /'aɪsɪkl/ *n* [C] چلورە زەنگلوك
الدلاة الجليدية، كتلة جليدية متدلية بسبب تجلد قطرات الماء

**icily** /'aɪsɪlɪ/ *adv* زۆربەساردی، بێ بایەخانە
بفتور، ببرود شديد

**icing** /'aɪsɪŋ/ *n* [U] ١. توێژێ شەکر بەسەر کێکەوە ٢. چینێ سەهۆڵی پێکهاتو لە سەر باڵی فڕۆکەکان
١. طبقة من السكر تغطي كعكة ٢. تكوين ثلجي على أجنحة الطائرات

**icon** /'aɪkɒn/ *n* [C] ئایکۆن، پوت، پەیکەر وێنەی کەسێکی پیرۆز (کڵێسەی خۆرهەڵاتی)
أيقونة، تمثال أو صورة لشخص مقدس (الكنيسة الشرقية)

**icy** /'aɪsɪ/ *adj* (-ier, -iest) زۆر سارد، بێقام سارد، سەهۆڵی، داپۆشراو بە سەهۆڵ
بارد جدا، (مجاز) فاتر، يخلو من الحرارة، مغطى بالثلج

**I'd** /aɪd/ = *I had, I would*

**idea** /aɪ'dɪə/ *n* [C] ١. بیرۆکە، بۆچونی هۆشی، رامان ٢. پلان، تەگبیر، پرۆژە
١. فكرة، تصور عقلي ٢. خطة، مشروع

*He's full of new ~ s.* پیاوێکی زیر، کارامە
انه رجل متكير

**ideal** /aɪ'dɪəl/ *adj* ١. نمونەیی
١. مثالي

*~ weather* کەشی خۆش ٢. ئەفسوناوی، بۆچونی، دوورلە راستی، خەیاڵی
طقس بديع / رائع ٢. خيالي، تصوري، بعيد عن الحقيقة

□ *n* [C] نمونەی باڵا، ئامانج، مەبەست
مثل أعلى، هدف، غاية

*the high ~ s of Islam/ Christianity* نمونەی باڵا لەئیسلام و دیان

المثل العليا للأسلام / لمسيحية

**Ideally** *adv* ب نمونەیی، نمونەی هۆشی، هەقڵی

مثالیاً، ذهنیاً

**Idealism** /aɪ'dɪəlɪzəm/ *n* [U] ١. مەزهەبی نمونەیی

٢. نموونەی هونەری (دژ راستی) ئەفسانەیی

١. مثالية، المذهب المثالی ٢. المثالية الفنية (عكس الواقعية) و

هی تعطی قیمة كبری للخیال

**Idealist** /aɪ'dɪəlɪst/ *n* [C] کەسێکی یان ڕێبازێ

نمونەیی

شخص مثالی، معتنق المثالیة

**Idealistic** /aɪˌdɪə'lɪstɪk/ *adj* نمونەیی

مثالی

**Idealize** /aɪ'dɪəlaɪz/ *vt* دەیکاتە نمونەیی، چارەسەری

ئەکات و بیری لێ ئەکاتەوە بەشێوەیەکی نمونەیی

یجعله مثالیاً، یعالج أو یفكر ب علی نحو مثالی

**Identical** /aɪ'dentɪkl/ *adj* خۆی، خودی، هاوجوت،

چونیەك، وەك یەك

نفسە، ذاتە، مطابق، مماثل

~ *with* دەقاودەق

مماثل أو مطابق ل

**Identification** /aɪˌdentɪfɪ'keɪʃn/ *n* [U]

هاوجووتكردن، دیاری كردن، ناسینەوە، سەلماندنی

کەسیەتی، چونەسەریەك هەریەك لە (وەك بیروباوەر)

مطابقة، مماثلة، إثبات الشخصية، إندماج كل فی (مبدأ مثلاً)

**Identify** /aɪ'dentɪfaɪ/ *vt* دەناسێنێ پێی، ناسنامەکەی

دیاری ئەکات (بۆشتێ یا کەسێ)

١. یتعرف علی، یعنی هویة أو شخصیة (شیء أو شخص)

~ *oneself with* ٢. پاڵپشتی دەکات، پشتی دەگرێ،

هاوبەشی كردنی لە بیروڕایەكدا دیاری ئەكا

٢. یدعم، یؤید، یعلن اشتراكه فی الرأی مع

**Identity** /aɪ'dentətɪ/ *n* [C,U] ١. هاوچون، لێك چوون

٢. پێناسە، هەڵیەکی ناسنامە

١. تماثل، تطابق ٢. هویة الشخص أو الشیء

**Ideology** /ˌaɪdɪ'ɒlədʒɪ/ *n* [C,U] (*pl* -gies) بیرۆکەی

ئایدۆلۆجیایی، ڕیبازی، هزری

أیدیولوجی، مذهبی

**Ideological** /ˌaɪdɪəlɒdʒɪkl/ *adj* ئایدولوجیا هزر،

کۆمەڵێك بیروبۆچون تایبەت بە ڕێبازێکی ڕاسیاری و

کۆمەڵایەتی

آیدلوجیة: مجموعة مفاهیم أو نظم فكریة ممیزة لنظام سیاسی

إجتماعی

أیدیولوجی، مذهبی

**Idiocy** /'ɪdɪəsɪ/ *n* [C,U] دەبەنگی، گەوجی، خرپۆی

حماقة، بلاهة

**Idiom** /'ɪdɪəm/ *n* [C] ١. شێوەزار، زمانی تایبەت

بەدەستەیەك یان چینێك لەچینەكانی گەل، زاراوە،

دەستەواژە، كورتەگوتن ٢. دەستەواژەیەکی زاراوەیی

واتاداری، بەگشتی لێی تێك بگەی نەك لە ڕێی

لێکدانەوەی مانای ئەو و شانەی کە لێوەی پێك هاتووە

١. لهجة، لغة ممیزة لفئة من فئآت الشعب ٢. عبارة إصطلاحیة

تفهم كاملة ولیس عن طریق معرفة معانی الكلمات المكونة لها

**Idiomatic** /ˌɪdɪə'mætɪk/ *adj* شیوازی دەر برینی چاك

وەکو چاکسازی، زاراڵی

إصطلاحی، أسلوب یستخدم التعبیرات الحیة

**Idiosyncrasy** /ˌɪdɪə'sɪŋkrəsɪ/ *n* [C] (*pl* -eies)

ئەتواری نامۆی كەسی، سیەیر یان نامۆ، هەستێتی خۆیی

شواذ شخصی، أطوار غریبة أو شاذة تحاسس ذاتی

**Idiosyncratic** /'ɪdɪəsɪŋ'krætɪk/ *adj* نامۆ، ناباو

غریب، خارج عن المالوف

**Idiot** /'ɪdɪət/ *n* [C] کەودەن، گێل، گەوج، گەمژەڵ،

لاژك، خرپو، گەمژەیەتی، بێئەقڵی

معتوه، ابله

**Idiotic** *adj* گێل، گەوج، کەودەن

أحمق، ینم عن بلاهة

**Idiotically** *adv* بەنەفامی، بەگەوجی

علی نحو أحمق أو معتوه

**Idle** /'aɪdl/ *adj* (-r, -st) ١. بێ ئیش، بێ كار، تەمبەل،

بێبەها، نابەکار، پشت گوێخراو

١. عاطل عن العمل، غیر مستخدم، مهمل

~ *machinery* ئامێری بەکارنەهێنراو ٢. کەسێکی

بێکارە، ٣. تەمەڵ، کەمتەرخەم

آلات غیر مستخدمة ٢. (الشخص) عاطل عن العمل ٣. كسول،

مهمل، متوان

*an ~ worthless boy* کوڕێکی تەمەڵی هیچ و پوچ

٤. هیچ وپوچ بێ کەڵك

ولد كسول تافه ٤. تافه غير مفيد

~ gossip چەنەبازی / پروپوچ

ثرثرة تافهة / عقيمة

□ vi, vt پشتگوێی ئەخات، تەمەڵی ئەکات، کات بەفیرۆ ئەدا لەشتی بێسود

يهمل، يتكاسل، يضيع وقته

~ away one's time کات بەفیرۆدەدات

يضيع وقته فيما لايفيد

**Idleness** *n* [U] تەمەڵی، بێ ئیش، بێ کار

كسل، إهمال، تعطل

**Idler** *n* [C] تەمەڵ، باپیف، زەغل

شخص كسول

**Idly** /ˈaɪdlɪ/ *adv* بەتەمەڵی، بێ گوێ پێدان

بكسل، بأهمال

**Idol** /ˈaɪdl/ *n* [C] ١. بت، شەبەنگ، پوت، پەرستراو ٢. شتێك / کەسێکی زۆر خۆشەویست

١. صنم، وثن، معبود ٢. شيء أو شخص محبوب جدا

**Idolater** /aɪˈdɒlətə(r)/ *n* [C] بت پەرست، ئەڤیندار، پوتی

عابد اصنام

**Idolatrous** /aɪˈdɒlətrəs/ *adj* ئاینی بت پەرستی، ئەڤینداری، پوتی

وثني، (معتقدات أو طقوس) وثنية

**Idolatry** /aɪˈdɒlətrɪ/ *n* [C,U] بت پەرستی

عبادة الاصنام

**Idolize** /ˈaɪdəlaɪz/ *vt* دەیپەرستێ، دەیکاتەخوا وەك بت، خۆشەویستی و شەیدایی لەرادە بەدەر

يؤله، يعبد على نحو وثني، يحب أو يعجب بأفراط

**Idyll** /ˈɪdɪl/ *n* [C] هەڵبەستی جوانی سروشت یان رووداو، دیمەن، کەش خۆشی کە بۆ ئەوە دەست پدات

قصيدة تصف الطبيعة أو الأحداث، منظر أو جو يصلح لهذا

**Idyllic** /ɪˈdɪlɪk/ *adj* ئاووهەوای خۆش ودڵفرین

(جو) شاعري يملا النفس بالرضى

**If** /ɪf/ *conj* ١. ئەگەر، ئایا

١. اذا، لو، ان

*I ~ you want to go there I will take you.* ئەگەر ویستت بچیت بۆ ئەوێ ئەتبەم لەگەڵ خۆم

إذا رغبت أن تذهب إلى هناك، فسوف أخذك معي

*I ~ it rains, we shall not go.* ئێمە ناڕۆین ئەگەر باران باری ٢. هەرکاتێ، گشت کاتێ، ئەگەر

إذا أمطرت السماء فأننا لن نذهب ٢. عندما، كلما، اذا لم، ان

*I~ I don't wear my spectacles I get a headache.* ئەگەر چاویلکەکەم لەچاونەکەم تووشی سەرئێشەئەبم ٣. ئەگەر، سەرەرای

ان لم اضع نظارتي فانني اصاب بصداع ٣. ولو ان، برغم ان

*I will do it, (even) ~ it takes me all day.* ئەوکارەئەکەم گەر رۆژێکی تەواویش بخایەنێ

سأقوم بها ولو اقتضاني ذلك يوما كاملا

*Do you know ~ Mr Smith is at home?* ٤. کە، کەوا، ئایا تۆ ئەزانی کاك سمث لەماڵە؟ ٥. هەتا ئەگەر (بروانە *as*) ٦. گەر، خۆزگە

٤. ما إذا: هل تعلم اذاكان السيد سمث في البيت؟ ٥. كما لو (انظر *as*) ٦. لو، ليت

*I~ only I had know that...* خۆزگە ئەمزانی کەوا

لو انني (ليتني) كنت اعرف ان...

**Igloo** /ˈɪgluː/ *n* (*pl* ~ *s*) کوختەی بەفرین بەشێوەی کڵاو ئەسکیمۆکان تیادەژین

كوخ ثلجي على شكل قبة يقيمه الاسكيمو

**Igneous** /ˈɪgnɪəs/ *adj* بەو .ی ئاگرین، ئارگونی، گڕکانی

(الصخور) نارية بركانية

**Ignite** /ɪgˈnaɪt/ *vt, vi* داڵەگیرسێنێ، داڵەگرێ، گڕی ئێ، بەرئەدا، گڕئەگرێ

يشعل، يشتعل، يلهب، يلتهب

**Ignition** /ɪgˈnɪʃn/ *n* داگرسان، ئاگر کرن

إشتعال، إشعال

**Ignoble** /ɪgˈnəʊbl/ *adj* بێ نرخ، سوك ـ کوتی / ڕسوا

حقير، خسيس، وضيع المولد

**Ignominious** /ˌɪgnəˈmɪnɪəs/ *adj* ناپەسەندو / دزێو، ئەنگ

شائن، مخز، حقير

**Ignominy** /ˈɪgnəmɪnɪ/ *n* [C,U] (*pl* -nies) ڕسوایی، ئەنگی سەرشۆڕکرن، ڕسوا، شورەیی

عار، خزي، عمل مشين أو مخز

**Ignoramus** /ˌɪgnəˈreɪməs/ *n* [C] (*pl* ~ *es*) نەزان،

کەسێکی نەزان
الجهول، شخص تام الجهل

**Ignorance** /ˈɪgnərəns/ *n* [U] نەزانی، نەفامی
جهل

**Ignorant** /ˈɪgnərənt/ *adj* نەزان، نەخوێندەوار، نەفام
جاهل

**Ignore** /ɪgˈnɔː(r)/ *vt* خۆی گێل ئەکا، گوێ پێ نادات
يتجاهل

**Il-** /ɪl/ *prefix* پێشگرە بە مانای پێچەوانە
بادئة معناها العكس أو غير

**I'll** /aɪl/ = *I will, I shall* ١. (زۆرجار هەواڵدەرە)
١. (خبرية عادة)

**Ill** /ɪl/ *adj* نەخۆش، دەردەدار
مريض، عليل

*fall* ~ توشی نەخۆشی ئەبێ
يصاب المرض

*be taken* ~ نەخۆش ئەکەوێ/ توشی دەردئەبێ
٢. (باسکردن) خراپ
يمرض، يصاب بالسقم ٢. (وصيفة) ردیء، سیء

~ *health* تەندروستی خراپ
صحه سيئة، سوء الصحة

~ *breeding* بەد پەروەردەیی، کەم ڕەوشت
سوء التربية، قلة التهذيب

□ *n* [C,U] ١. شەر، خراپ، زەرەر
١. شر، سوء، ضر

*do* ~ خراپ ئەکا، شتێك بە خراپی ئەنجام ئەدا
نەگبەتی، نوشستی، دەردەسەری
يفعل السوء، ينجز شيئا بشكل ردیء ٢. نكبات، متاعب

*the many* ~ *s of life* دەردەسەرەزۆرەکانی ژیان
متاعب الحياة العديدة، مصائب الدهر

□ *adv* بەشێوەیەکی خراپ یا نەگونجاو
على نحو سيء أو غير مناسب

~ *at ease* شلەژاو، نیگەران، دوودڵ، ڕاڕا
مضطرب، قلق، يشعر بالحرج

*I can* ~ *afford it.* لە تواناما نیە
سيكلفني هذا ما لا أطيق

**ˌIll-ˈbred** *adj* بێ ڕەوشت، بەد پەروەردە کراو، بەدخودانکری
سيء التربية، قليل التهذيب

**ˌIll-ˈfated** *adj* بێ بەخت، بەخت ڕەش
منحوس، سيء الطالع

**ˌIll-ˈfavoured** *adj* کەسێکی ناشرین بەدفەساڵ، نەڤیایی
(الشخص) دميم، قبيح الشكل

**ˌIll-ˈgotten** *adj* بەرێگایەکی ناپەسەند دەستی دەکەوێ
يكسب بطريقة غير مشروعة

**ˌIll-ˈnatured** *adj* نەگریس، نالەبار، زوو هەڵچو، توڕە
سيء الخلق، سريع الغضب

**ˌIll-treaat/-ˈuse** *vt* بەتوندی مامەڵەی لەگەڵ ئەکا، بەد ڕەفتاری دەکات
يمتهن، يعامل بقسوة وغلظة

**Illegal** /ɪˈliːgl/ *adj* زۆڵ، بێژی، نارەوا
غيرقانوني، مخالف للقانون

**Illegally** *adv* بەشێوەیەکی نایاسایی
بطريقة غيرقانونية

**Illegality** *n* [C,U] بێ یاسایی، دژە یاسایی
عدم الشرعية، مخالفة القانون

**Illegible** /ɪˈledʒəbl/ *adj* نەخوەندەبار، ناخوێنرێتەوە
غير مقروء

**Illegibly** *adv* بەشێوەیەکی نەخوێنراوە
بشكل غير مقروء

**Illegiblity** /ɪˌledʒəˈbɪlətɪ/ *n* [U] نوسراوێکی ئاڵۆز، نەخوێندە بارێتی، نەخوندەییتی
انعدام الوضوح (في شيء مكتوب)

**Illegtimate** /ˌɪlɪˈdʒɪtɪmət/ *adj* نایاسایی، نارەوایی زۆڵ، بێژی
غير شرعي

**Illicit** /ɪˈlɪsɪt/ *adj* ناباو، نایاسای نارەوا، قەدەغە، قاچاخ
محظور، غير مشروع، يحرمه القانون

**Illiteracy** /ɪˈlɪtərəsɪ/ *n* [U] نەفام لەنوسین وخوێندن، نەخوێندەواری، نەخوێندەتی
امية، الجهل بالقراءة والكتابة

**Illiterate** /ɪˈlɪtərət/ *adj* (کەسێکی) نەفام، نەخوێندەوار، باشی ناخوێنێ، نانوسێ
(الشخص) جاهل، امي، لايحسن القراءة أو الكتابة

**Illness** /ˈɪlnɪs/ *n* [C,U] نەخۆشی، دەرد، ئازار
مرض، داء، علة

**Illogical** /ɪ'lɒdʒɪkl/ *adj* بێ‌جێ، ناژیری، نەژیریێز
غیر منطقی

**Illogically** *adv* ناپەسەند، نابەجێ
بشکل غیر منطقی

**Illogicality** /ɪ,lɒdʒɪ'kælətɪ/ *n* [C] (*pl* -ies) نەبوونی ژیری، نەبوونی راستی
انعدام المنطق

**Illuminate** /ɪ'lu:mɪneɪt/ *vt* روونی ئەکاتەوە (بەزانین و زانست) روناهیکرن دەیرازێنێتەوە، بەرووناکی
یضیء، ینیر، ینور (بالعلم أو المعرفة) یزخرف یزین (الشوارع) بالانوار (ابتهاجا)

**Illumination** /ɪ,lu:mɪ'neɪʃn/ *n* [C,U] روناککرن، رووناکی کردنەوە، رووناکی کارەبا، بۆ روون کردنەوەی شار
اضاءة، انارة، تنویر، انوار کهربائیة لأضاءة بلدة

**Illusion** /ɪ'lu:ʒn/ *n* [C,U] خەیاڵ، گزی کردن
وهم، خداع

**Illusive** /ɪ'lu:sɪv/ *adj* = *illusory*. ساویر، هەڵخەڵەتاندن

**Illusory** /ɪ'lu:sərɪ/ *adj* گزی کەر، رێونکەر، خاپێنەر، خەیاڵی، ئەندێشەیی
خداع، مضلل، وهمی

**Illustrate** /'ɪləstreɪt/ *vt* روونی ئەکاتەوە بە وێنەو نمونەوە
یشرح، یوضح بالصور و ضرب الامثلة

**Illustrator** /'ɪləstreɪtə(r)/ *n* [C] نیگارکێشی وێنەی رون کردنەوە (پەراو)
رسام صور توضیحیة (الکتاب مثلا)

**Illusrtation** /,ɪlə'streɪʃn/ *n* [C,U] راڤەدان، روونکردنەوە بە وێنە، راڤەکردن، وێنەی روونکردنەوە
توضیح بالصور، صورة توضیحیة

**Illustrative** /'ɪləstrətɪv/ *adj* بەرونکراوەیی راڤەیی، خەملی
توضیحی

**Illustrious** /ɪ'lʌstrɪəs/ *adj* درەوشاوە، بەناوبانگ
لامع، شهیر

**I'm** /aɪm/ = *I am.*

**Im-** /ɪm/ *prefix* پێشگر بەمانای دژ
بادئة معناها: عکس، غیر

**Image** /'ɪmɪdʒ/ *n* [C] ١. وێنە، پەیکەر، ئەندێشە ٢. ساوێر، پوت، وێنە، بۆچون ٣. چونیەکی، وەرگرتن (رەوانبێژی)
١. صورة، تمثال ٢. صورة عقلیة، انطباع ذهنی ٣. تشبیه، استعارة (بلاغة)
٤. وێنەی دەقاودەق ئەگری *be the (very) ~ of (sb)* بۆ کەسێك
٤. یکون صورة طبق الأصل من (شخص ما)

**Imagery** /'ɪmɪdʒərɪ/ *n* [U] پەیکەر، بت، پوت، خوازە (ئاشوپکرن)
صورة، تماثیل، اصنام، استعارة، مجاز (بلاغة)

**Imaginable** /ɪ'mædʒɪnəbl/ *adj* دەتوانرێ بهێنرێتە بەرچاو، هەستی پێ بکرێت، ئاشوپیار
یمکن تصوره أو تخیله

**Imaginary** /ɪ'mædʒɪnərɪ/ *adj* ئەندیشەیی، خەیاڵی، ئاشوپی
تصوری، تخیلی، وهمی

**Imagination** /ɪ,mædʒɪ'neɪʃn/ *n* [C,U] ئەندیشە، داهێنان، بۆچوون، ئاشوب، خەیاڵ
تخیل، ابداع، خیال

**Imaginative** /ɪ'mædʒɪnətɪv/ *adj* خەیاڵی فراوان، جوانکراو، ئاشوپدار
واسع الخیال، مبدع

**Imagine** /ɪ'mædʒɪn/ *vt* ١. دێتەبەرچاو هزردکت، ئاشوپ دکت ٢. واهەست ئەکات، بروای وایە، وای‌دائەنێ
١. یتخیل، یتصور، یتوهم ٢. یظن، یفترض، یعتقد

**Imam** /ɪ'mɑ:m/ *n* [C] پێشنوێژ، ئیمام، (پێشنوێژکەری موسوڵمانان لە نوێژدا)
الإمام، أحد ائمة المسلمین، من یؤم المسلمین فی الصلاة

**Imabalance** /,ɪm'bæləns/ *n* [C] نەمانی هاوسەنگی، لاسەنگ، نەهەڤسەنگی، ناهاوسەنگی
إختلال التوازن

**Imbecile** /'ɪmbəsi:l/ *adj* گێل، دەبەنگ، خرپو، لاژك، گەوج
ابله، احمق، معتوه
□ *n* [C] دەبەنگی، سەرسامی
(شخص) ابله، معتوه

**Imbecility** /,ɪmbə'sɪlətɪ/ *n* [C,U] گەمژەیی، داماویی،

تمزيق، تفجير، قطع العلاقات الودية

□ vt ئەدڕێنێ، ئەپچڕێنێ، کۆتای پێدێنێ

يمزق (وعاءً دموياً مثلاً) يقطع، ينهي (العلاقات)

**rural** /ˈrʊərəl/ *adj* لادێی (ب *urban*)

ريفي، قروي (قارن *urban*)

**ruse** /ruːz/ *n* [C] فروفێڵ، تەڵەکە، خاپ، فناز، لابان، ڕەوشتی فێڵاوی

خدعة، حيلة، أسلوب ماكر

**1rush** /rʌʃ/ *vi, vt* ١. پاڵی پێوەدەنێ بە توندی، هێرشدەکات، تەکانئەدات

١. (يجعله) يندفع بعنف

*~ing fresh troops to the front* بەهێزێکی نوێوە بەرەو بەرەی پێشەوە پاڵ دەنێ ٢. پەلە دەکات، تەکان دەدات ٣. هێرش ئەبات، دەست ئەگرێ بەسەر (قەڵا) بە هێرشی لەناکاو

يدفع قوات جديدة الى الجبهة الامامية ٢. يتسرع، يستهور ٣. يقتحم، يستولي على (قلعة مثلاً) بهجوم مفاجيء:

*~ the gates of the sports ground* جەماوەرەکە هێرشیان هێنا بۆ دەرگاکانی خوارەوەی یاریگاکە

(الجماهير) تقتحم بوابات الملعب

□ *n* [C,U] ئامازبوون

إندفاع:

*swept away by the ~ of the flood* شەپۆلی لافاوەکە ڕایماڵی

جرفه التيار

*the ~ hours* ماوەی قەرەباڵغی ڕێگاوبان

فترة أزدحام الطرق والمواصلات

**2rush** /rʌʃ/ *n* [C] (لقی درێژ لە) درەخت بۆ دروستکردنی کورسی

(الساق الطويلة ل) نبات الأسل او السمار (تصنع منه الكراسي)

**rusk** /rʌsk/ *n* [C] پارچەیەك نانی سورەوکراو، جۆرێك لە پسکیت

بقسماط (خبز محمص)؛ من أنواع البسكويت

**russet** /ˈrʌsɪt/ *n* [U], *adj* سورهەڵەك، شەرابی، سێوەلاسورەی توێکڵ ئەستوور

لون بني محمر (خمري)؛ تفاح خمري اللون ذو قشرة خشنة

**rust** /rʌst/ *n* [U] ژەنگ

صدأ

□ *vt, vi* ژەنگ دێنێ، ژەنگاوی ئەبێ، جوانی نامێنێ لەبەر بەکار نەهێنانی

(يجعله) يصدأ (مجاز) يصدأ، تضعف جودته لعدم الإستعمال

**rusty** *adj* (-ier, -iest) ژەنگاوی، کەسێکی کەم تەرخەم ئامادەی مەشق ئەبێ

صدىء (مجاز: الشخص) لا يواظب على التمرن

**rustic** /ˈrʌstɪk/ *adj* ١. لادێی، ساویلکە، زبر، لوس نەکراو

١. قروي، خشن، غير مصقول

*~ dress/speech* ٢. پەیوەندی بە خەڵکی لادێوە هەیە، جل و بەرگ/ قسە کردن سادە، گەوج، ساویلکە

٢. يتعلق بأهالي الريف، ريفي، ساذج، بسيط:

□ *n* [C] لادێی، جوتیار، گوندی

ريفي، قروي، فلاح

**rustle** /ˈrʌsl/ *n* [U], *adj* دشنینەوەی گەڵای درەخت شانەوەی گەڵا، ورشەی درەخت

صوت ناعم حفيف (حفيف ورق الشجر مثلاً)

□ *vt, vi* ئەشنێتەوەی دەنگێکی وەك شنانەوە دروستدەکا

يحف، يحدث صوتاً شبيهاً بالحفيف

**rut** /rʌt/ *n* [C] شەق، درز (ئاسەواری تایە لەسەر زەوی تەڕ) (شوێن پێی جێماو)

أخدود (تتركه العجلات في الأرض الطرية)

*get into a ~* لەژیانیدا پابەند دەبێ بەڕۆتینەوەولێی لانادات

يلتزم في حياته بروتين معين لا يحيد عنه

**ruthless** /ˈruːθlɪs/ *adj* دڵ ڕەق، بەزەیی نیە

قاس، لا يرحم

**rye** /raɪ/ *n* [U] بەرشە، شەلیل (ڕووەکێکی گیایەوەك ئالف بەکاردێ)

الجاودار، الشليل (نبات عشبي يستخدم علفاً للحيوانات)

# S

**S, s** /es/ (*pl* s's /'esɪz/) نۆزدەیەم پیتی ئەلفبێی ئینگلیزی
الحرف التاسع عشر من الابجدية الانكليزية

**Sabbath** /'sæbəθ/ *n* رۆژی پشووی هەفتانە بۆ حەوانەوە، شەممە بۆ جولەکەیەو یەکشەممە بۆ گاور و هەینی بۆ موسولمانە
يوم العطلة الاسبوعية للراحة والعبادة، السبت عند اليهود والاحد عند المسيحيين والجمعة للمسلمين

**sable** /'seɪbl/ *n* [C,U] سمۆرە (جۆرە ئاژەڵێکە)
(فراء) السمور

□ *adj* رنگی رەش
(مجاز) اسود

**sabotage** /'sæbətɑːʒ/ (بەشداریدەکا) وێرانکاریی، تێکیدەدا، وێرانیدەکا
(يشترك في) اعمال التخريب، يخرب

□ *n* [U] لەناویدەبا، هەڵیدەوەشێنەوە
يدمر، يتلف

**saboteur** /ˌsæbə'tɜː(r)/ *n* [C] وێرانکار، تێکدەر، کاڵلکەر
مخرب

**sabre** /'seɪbə(r)/ شمشێری چەماوەی شۆرەسوار
سيف معقوف قليلاً يستخدمه الفرسان

□ *n* [C]

**sachet** /'sæʃeɪ/ *n* [C] تورەکەی بچووکی
كيس صغير معطر

*a ~ of shampoo* بۆنخۆش، حەت حەتۆکە

[1]**sack** /sæk/ *n* [C] تورەکە، توربە، جەواڵ
كيس، جوال، زكيبة

□ *vt* ئەیکاتە توورەکەوە
يضع في كيس

**sackcloth** *n* [U] گوش، تەونی ئەستوور توورەکەی لێ دروست ئەکرێ
خيش، نسيج غليظ تصنع منه الاكياس

**sacking** *n* [U] گوش
خيش

[2]**sack** /sæk/ دەرئەکرێ لە کارێك
(ل. د) يصرف من الخدمة، يرفت

□ *n get the ~* دەرئەکرێ لە ئیش، سەرفراز ئەکرێ لە ئیش
يصرف من الخدمة، يرفت

*give sb the ~* دەری ئەکا لە کارەکەی
يصرفه من الخدمة، يرفته

[3]**sack** /sæk/ *vt* تاڵانیەکات، لێی زەوتدەکا
ينهب، يسلب

□ *n* تاڵانکردن، زەوتکردن
نهب، سلب

**sacrament** /'sækrəmənt/ *n* [C] ئاهەنگی ئاینی شکۆدار لە کەنیسەی دیان (وەك خۆپاککردنەوە لە گوناه یان ژنهێنان)
احتفال ديني مهيب في الكنيسة المسيحية (كالتعميد أو الزواج)

**sacred** /'seɪkrɪd/ *adj* ١. پیرۆز، خوایی
١. الهي، مقدس:

*a ~ building* خانوویەکی پیرۆز (وەك مزگەوت یان کەنیسە)
بناء مقدس (كالمسجد أو الكنيسة مثلاً)

*~ music* ئاوازی پیرۆز
موسيقى مقدسة

*a ~ promise* ٢. پایەبەرز، خاوێن، سالار، پیرۆز، پەیمان، سەردەم

٢. جليل، طاهر، مهيب: نذر، عهد

**sacredly** *adv* بە پیرۆزی

بقداسة، بطهارة

**sacredness** *n* پیرۆزیتی

قداسة، طهارة، حرمة

**sacrifice** /ˈsækrɪfaɪs/ *n* [C,U] ١. خۆبەختکردن، قوربانیدان

١. تضحية، ضحية، قربان

*the ~ of an ox to Jupiter* گایەك ئەكایە قوربانی بۆ (جوپیتر)

تقديم ثور ضحية لجوبيتر

*parents who make ~ s in order to educate their children* ٢. قوربانیەکان ٣. قوربانیدان ٤. زیان

٢. تضحيات: ٣. تضحية ٤. خسارة

*sell sth at a ~* شتێك بە زیان ئەفرۆشرێ

يبيع شيئاً بخسارة

☐ *vt, vi* قوربانی ئەدات، شتێك ئەکا بە قوربانی لە پێناوی یەکێکی کەدا

يقرب، يقدم ضحية، يضحي بشيء (من اجل غيره):

*He ~ d his life to save the child from drowning.*

**sacrificial** /ˌsækrɪˈfɪʃl/ *adj* قوربانکار

قرباني، تقربي، لأجل التضحية

**sacrilege** /ˈsækrɪlɪdʒ/ *n* [U] پیس کردنی شوێنە پیرۆزەکان وە کەم کردنەوەی رێزیان

تدنيس المقدسات وانتهاك حرماتها

**sacrilegious** /ˌsækrɪˈlɪdʒəs/ *adj* پیسکەر بۆ شوێنە پیرۆزەکان

مدنس للمقدسات، تدنيسي

**sacrosanct** /ˈsækrəʊsæŋkt/ *adj* (پیرۆزەکان) پیس ناکرێ لەبەر پیرۆزیان، پێڤام پیرۆز

(مقدسات) لا تدنس لحرمتها

**sad** /sæd/ *adj* (-der, -dest) خەمبار، خەمگین

حزين، محزن، كئيب

**sadly** *adv* بەخەمەوە، بەئێشەوە، بەدڵتەنگیەوە

بحزن، بأسى، بكآبة

**sadness** *n* [U] خەفەت، ئیش، خەمۆکی

حزن، أسى، كآبة

**sadden** /ˈsædn/ *vt, vi* خەفەت دەخوا، بەخەمەوە

يحزن، يحزن

**saddle** /ˈsædl/ *n* [C] ١. زین یان کوشن (ئەسپ یان پایسکیل) ٢. بەرزایی نێوان دوو لوتکە

١. سرج (الحصان او الدراجة) ٢. مرتفع يصل بين قمتين

☐ *vt* ١. زینی (ئەسپەکە) ئەکات ٢. بەرپرسیاری ئەکات، بارگرانی ئەکا

١. يسرج (الفرس) ٢. يحمله عبئا او مسؤلية ثقيلة، يرهق

*~ with big debts* باری گران دەکا بە قەرزی گەورە

يرهقه بديون كبيرة

**ˈsaddle-bag** *n* [C] خورج، پشتە زین، قاشا زین کۆپان، کورتان

عدل الخرج، خرج، حقيبة السرج (لدراجة مثلا)

**saddler** /ˈsædlə(r)/ *n* [C] زین دروو، سەراج، زینکەر

صانع السروج، سروجي، المشتغل بها، سراج

**sadism** /ˈseɪdɪzəm/ *n* [C] سادێتی، کەیفی بە ئازاری خۆشەویستەکەیەوە دەبینێ، ئەشکەنجەدانی سێکسی

السادية، التلذذ بتعذيب المحبوب، تعذيب جنسي

**sadist** *n* کەسی ئارەزومەندی ئەشکەنجەدانی سێکسی بێت

السادي، شخص مبتلى بالسادية

**sadistic** /səˈdɪstɪk/ *adj* سادی: کەسێك حەز بە ئازاردانی سێکسی خۆشەویستەکەی بکا

سادي، خاص بالسادية

**safari** /səˈfɑːrɪ/ *n* [C,U] راوە گەشت، گەشتێکی راوکردن لە ناوەراستی ئەفریقیا

رحلة للصيد في اواسط افريقيا

**safe** /seɪf/ *adj* (-r, -st) ١. بێترس، دڵنیاکراو، بێ مەترسی ٢. ساغ ٣. بێئازارو بێمەترسی

١. أمن، مأمون، خال من الخطر ٢. سالم، سليم ٣. غير مؤذ أو خطر

*travelling at a ~ speed* دەچێت بۆ گەشت بە خێرایەکی (بێ مەترسی)

يسافر بسرعة مأمونة (غير خطرة)

*a ~ driver* ٤. وریا، بەئاگا، ئارەزومەندی سەرکەشی

نیه
٤. حذر، غیر میال للمخاطرة
*on the ~ side* سەرپار، وەك پەدەك
على سبيل الاحتياط
□ *n* [C] ١. قاسە، گەنجینە، خەزێنە ٢. پرنجۆك بۆ پاراستنی خۆراك
١. خزنة، خزانة (فولادية) ٢. نملية لحفظ الطعام
**,safe-'conduct** مۆڵەتێ بۆ دەربازبوون لەرێگاویان (بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا)
إذن يضمن لحامله سلامة المرور (خاصة اثناء الحرب)
**'safeguard** *n* [C] پاراستن
وقاية، صيانة، تحفظ
**,safe-'keeping** *n* [U] پاراستنی وریای دەبێ، چاودێری
حفظ، صيانه
**safely** *adv* بەسەلامەتی، ئاسایشانە
بسلامة، بأمان
**safety** /'seɪftɪ/ *n* [U] ئاسایش، بێ‌مەترسی
سلامة، امن، أمان:
*play for ~* دوورنەکەوێتەوە لە مەترسی
يتجنب المخاطر
*in ~* بە ئاسایشی، بەبێ کێشە
بأمان، بسلامة
**'safety-pin** *n* [C] دەرزی سنجاق، دەرزی داخستن، ماشەك، تەوقە
دبوس بقفل أو بمشبك، دبوس الأمان
**'safety-valve** *n* [C] زمانەی‌دڵنیایی، رێگایەك بۆ حەواندنەوەی هەست، دەمەوانە
صمام الامان (مجاز) وسيلة للتنفيس عن المشاعر
**saffron** /'sæfrən/ *n* [U] زەعفەران، وەك زەعفەران رەنگ دکت، رەنگ زەردی پرتەقاڵی
الزعفران، لون اصفر برتقالي
**sag** /sæg/ *vi* (-gg-) ١. دەچەمێتەوە، شۆڕبونەوەو داهێلان (لەژێر قورسای وپەستان)
١. يتقوس من الوسط (تحت الثقل والضغط)
*~ ging roof* ١. شۆڕدەبێتەوە، ئەچەمێتەوە: رویەکی چەماوە ٢. شۆڕئەبێتەوە، پێچ دەداتەوە، لارئەبێ، لادەدات
١. يتدلى، يتقوس: سطح متقوس ٢. يتدلى، ينعطف، يميل،

ينحرف، درجة الميله أو الأنحراف
□ *n* پلەی چەمانەوە
درجه التقوس
**saga** /'sɑ:gə/ *n* [C] چیرۆکێکی کۆن پڕ لەکاری پاڵەوانێتی
قصة قديمة، زاخرة بالأعمال البطولية
**sagacious** /sə'geɪʃəs/ *adj* ژیر، هۆشیار، وریا، بیرەوەر
حصيف، بصير، عاقل
**sagacity** /sə'gæsətɪ/ *n* ژیریی، هۆشیاری، پەند
حصافة، حكمة
[1]**sage** /seɪdʒ/ *n* [C], *adj* (-r, -st) دانا، ژیر، پەنرپار زیرەك، کەسێکی ژیر، زانا، هشدار
حكيم، راجع العقل، محنك، حصيف
**sagely** *adv* بە ژیری، بەدانایی
بحكمة، بحصافة، بحنكة
[2]**sage** /seɪdʒ/ *n* [U] گیایەکی بۆنخۆشی پەڵ گەورە
الناعمة المريمية (نبات)
**sago** /'seɪgəʊ/ *n* [U] ساغو: خواردنێك نیشاستەیی لە بەری درەختی ساغو دەردێنن
الساغو: طعام نشوي يستخرج من حبوب نخل الساغو
**said** /sed/ (بروانە *say*)
(انظر *say*)
**sail** /seɪl/ *n* [C,U] ١. چارۆکە، پەردەدار، کەوتنە رێی کەشتی چاروکەدار
١. شراع، قلع:
*under ~* (کەشتی) چارۆکەکانی دەکاتەوە، دەیخاتەکار
(السفينة) تنشر اشرعتها
*set ~* کەشتێك دەست پێدەکات، کەشتیەکە دەست بەگەشتەکەی دەکات
يبدأ رحلة، تنطلق السفينة في رحلتها
*go for a ~* ٢. گەشتی دەریایی بۆ خۆشی ٣. کەشتی چارۆکەدار:
٢. جولة في البحر للمتعة ٣. سفينة شراعية:
*a fleet of fifty ~ s* کەشتیگەلی پەنجا کەشتی
اسطول من خمسين سفينة
□ *vi, vi* ١. بە دەریادا ئەڕوات ٢. دەست بە گەشتی

دەریایی ئەکات ٣. گەشت بە دەری ئەکا، تێپەڕێ
١. يبحر، يقلع ٢. يبدأ رحلة بحرية ٣. يسافر بحراً، يعبر:

*~ the Pacific* بەئۆقیانوسی ئارام تێپەڕدەبێ
٤. کەشتی بەرێوە ئەبات ٥. بەئۆقیانوسی ئارامدا ئەڕوات
يعبر المحيط الهادی ٤. يوجه، يقود (قارباً) ٥. يتهادی

**'sailing-boat** *n* [C] بەلەمی چارۆکەدار
قارب شراعي

**'sailing-ship** *n* [C] کەشتی چارۆکەدار
سفينة شراعية

**sailor** /'seɪlə(r)/ *n* ١. دەریاوان
١. بحار، ملاح، نوتي

*a bad/good ~* ٢. تووش ئەبێ/ تووش نابێ بە گێژیی دەریایی
٢. يصاب / لا يصاب بدوار البحر

**saint** /seɪnt/ *n* [C] ١. لە پیاو چاکانی خوا ٢. پیرۆز
١. ولي من اولياء الله ٢. قديس

**saintly** *adj* پیرۆزی، وەك قەشە
قديسي، كالقديس

**sake** /seɪk/ *n* مەبەست، ئامانج لەبەر بەرژەوەندی
قصد، سبيل

*for the ~ of* لەپێناوی، لەبەر خاتری، بەمەبەستی
اكراماً ل، من اجل

*for my/your/the* لە پێناوی‌من/ لەپێناوتا/
من اجلي / اجلك /

*country's ~* لە پێناوی وولاتدا
اجل البلاد

*be patient for the ~ of peace* ئارامبگرە خۆت بۆ پاراستنی ئاشتی
كن صبوراً حفظاً للسلام

**salaam** /sə'lɑːm/ *n* [C] سڵاو، پشت چەماندنی گەورە (بۆ ڕێز لێنان)
السلام (عليكم) انحناءة منحنية (للتحية)

**sal(e)able** /'seɪləbl/ *adj* فرۆشتەنی، باو، فرۆشتنبار
للبيع، رائج

**salad** /'sæləd/ *n* [C,U] ١. زەڵاتە
١. سلطة

*~ -dressing* ساسی زەڵاتە ٢. تێکەڵەی هەمەجۆر لە خواردن لەگەڵ زەڵاتە
صلصة للسلطة ٢. خليط متنوع من الطعام البارد مع السلطة

*chicken ~* زەڵاتەی مریشك
سلطة دجاج

*fish ~* زەڵاتەی ماسی
سلطة سمك

*fruit ~* زەڵاتەی میوە
سلطة فواكه

**salami** /sə'lɑːmɪ/ *n* [U] گۆشتی بە بەهارات خۆشکراو
لحم محفوظ متبل

**salary** /'sælərɪ/ *n* [C] (*pl* -ries) مانگانە، موچە، دەرماڵە
راتب، مرتب، معاش

*a~ of £3,000 per annum* موچە بەبڕی ٣٠٠٠ جنیە ساڵانە (بەراووردبکە *aweekly-wage* لەگەڵ هەفتانە)
راتب قدره ٣٠٠٠ جنيهاً في العام (قارن *aweeklywage* اجرة اسبوعية)

**salaried** *adj* موچەخۆر، موچەدار
ذو راتب، بمرتب

**sale** /seɪl/ *n* [C,U] ١. فرۆشتن، فروتن
١. بيع

*on/for ~* بۆ فرۆشتن، دانراو بۆ فرۆشتن ٢. نرخ داشکاندن، تەنزیلات ٣. زیادکردنی ئاشکرا
للبيع، معروض للبيع ٢. اوكازيون، تنزيلات ٣. مزاد علني

**'salesman/-woman** *n* [C] فرۆشیار (ئافرەت، پیاو)
بائع، بائعة (في متجر)

**'salesmanship** *n* [U] فرۆشیاری
فن البيع، المهارة في البيع

**salient** /'seɪlɪənt/ *adj* دەرکەووتوو
بارز، ملحوظ

*the ~ points of a speech* خاڵە گرنگەکان لە وتارەکەدا
النقاط البارزة في خطبة

□ *n* [C] بەرزییەك لە هێڵی پێشەوەی جەنگ
منطقة بارزة في للخط العدو

**saline** /'seɪlaɪn/ *adj* سوێر، سوێراو بەخوێ
ملحي، مالح

**saliva** /sə'laɪvə/ *n* [U] تف، لیك، خوزاف
لعاب، ریق، رضاب

**sallow** /'sæləʊ/ *adj* سەلپ، پەریو، کاڵ (پێست)
(الجلد) شاحب

**sally** /'sælɪ/ *n* [C] (*pl* -lies) ١. هێرشی‌کتوپڕ کە هێزی گەمارۆدراو پێیهەڵدەستێ
١. هجمة مفاجئة تقوم بها قوات محاصرة
*make a successful* ~ هێرشی سەرکەووتوو ئەکات ٢. گاڵتە، قسەی خۆش
یقوم بهجمة ناجحة ٢. نکتة، اضحوکة
□ *vi* ~ *forth/out* ١. هێرشی ئەکاتە سەر ٢. سەیران ئەکات
١. یهجم علی ٢. یقوم بنزهة او رحلة

**salmon** /'sæmən/ *n* [C,U] (ناگۆڕێ لەشێوگی کۆدا) ماسی / ماسی‌سەلمۆن، رەنگی پرتەقاڵی پەمەیی
(لا تتغیر فی صیغة الجمع) سمکة / السلمون، لحمه، لون برتقالی وردی

**salon** /'sælɒn/ *n* [C] ١. ساڵۆن، دیدەنگە (بۆ پێشوازی لەمیوان پێشانگای هونەری
١. صالون، بهو (لاستقبال الزوار) ٢. معرض فنی

**saloon** /sə'lu:n/ *n* [C] ١. هۆڵ، ساڵۆن (لە شوێنی گشتیدا)
١. قاعة، بهو، صالة (فی مکان عام)
*the ship's dining-* ~ هۆڵی نانخواردن لەناو بەلەم
قاعة الطعام فی سفینة
*the* ~ *bar* هۆڵ بۆخواردنەوەوەك (لە مۆتێل)دا، مەیخانە ٢. (لە ئەمریکا) بار (ب *public house*) ٣. ساڵۆن، ئۆتۆمۆبیل ٤ تا ٧ کەسی
صالة للشرب (فی فندق مثلاً) ٢. (فی امریکا) حانة (قارن *public house*)، مشرب، بار ٣. الصالون: سیارة مقفلة تتسع من ٤ـ٧ رکاب

**salt** /sɔ:lt/ *n* [C,U] ١. خوێ
١. ملح
*take* (*a statement*) *with a grain/pinch of* ~ قایل ئەبێ (لێدوانێك) بە گومان و ووریایی
یقبل (تصریحاً) بشیء من التحفظ والشك
*the* ~ *of the earh* خوێی زەوی، هەڵبژاردەی خەڵك ٢. خوێی کیمیایی
ملح الارض، خیار الناس ٢. ملح کیمیائی
*an old* ~ ٣. دەریاوانی کارامە
٣. ملاح ماهر، بحار محترف
□ *vt* خوێی پێوە ئەکات
یملح

**'salt-cellar** *n* [C] خوێدان
السلحة، مملحة المائدة

**salty** *adj* (-ier, -iest) سوێر، شۆر
مالح، مملح

**salubrious** /sə'lu:brɪəs/ *adj* (کەش) تەندروستی، سوودمەندی، ساخدار
(بخاصة الطقس) صحی، نافع للصحة

***saluresis** میزی خوێندار
ادرار الملح

***salurated** تێر
مشبع

**salutary** /'sæljʊtrɪ/ *adj* سودبەخش، سودمەند (بۆ لەش و مێشك)
نافع، مفید (للجسم او العقل)
~ *exercise/advice* مەشقی سودمەند / ئامۆژگاری سودمەند
تدریب مفید / نصیحة مفیدة

**salutation** /ˌsælju:'teɪʃn/ *n* [C,U] سڵاو، درود، سلاف
سلام، تحیة
*raise one's hat in* ~ کڵاوەکەی بەرزدەکاتەوە بۆ سڵاوکردن
یرفع قبعته تحیة

**salute** /sə'lu:t/ *n* [C] سڵاو، سەلامکردن
تحیة، سلام
*military* ~ سڵاوی سەربازی
تحیة عسکریة
□ *vt, vi* ١. سڵاوئەکات، سەلامدەکات ٢. بەخێرهاتنی ئەکات، سڵاودەکات بە چەمانەوە یا کڵاوبەرزکردنەوە
١. یحیی، یؤدی التحیة ٢. یرحب ب، یحیی (بالانحناء او رفع القبعة)

**salvage** /'sælvɪdʒ/ *n* [U] ١. رزگارکردن (کەل

ویەل لە ئاگر) ۲. کرێی رزگارکردن ۳. کۆکردنەوەی شتی بێبایەخ (زبڵ) بۆ بەکارهێنانەوەیان

۱. انقاذ (الممتلكات من الحريق مثلاً) ۲. تعويض الانقاذ ۳. جمع المهملات لاعادة استخدامها

□ *vt* رزگاری دەکا (لەئاگر یان خنکان)

ينقذ، يخلص (من النار او الغرق)

**salvation** /sælˈveɪʃn/ *n* [U] ۱. رزگارکردن، ئازادکردن (لەگوناه) ۲. رزگارکەر، شێوازێکی رزگاربون

۱. انقاذ، خلاص، نجاة (من الاثم) ۲. منقذ، مخلص، وسيلة الخلاص

**salve** /sælv/ *n* [C,U] ۱. مەڵهەم، چەوری (پزیشکی) ۲. هێورکەرەوە، ئاسودەکەر

۱. مرهم، دهان (طبي) ۲. (مجاز) مريح للضمير، مهدىء للشاعر

□ *vt* ۱. مەڵهەمی لێئەدات ۲. چارەسەری ئەکات

۱. يضع مرهما على ۲. يداوي، يصلح، يريح

**salvo** /ˈsælvəʊ/ *n* [C] (*pl* ~ s, ~ es) تۆپ تەقاندن (بۆ سڵاو)

اطلاق المدافع (للتحية)

**same** /seɪm/ *adj, pron* (*with the*) ۱. هەمان شت، چوون یەك

۱. نفس، ذات، عين الشيء

*We have lived in the ~house for twenty years.*

لە هەمان خانووداماوەی بیست ساڵ ژیاوین

عشنا في نفس البيت عشرين عاماً

*come to the ~ thing* ۲. ئەنجام هەر یەکە، جیاوازنیەلە کۆتاییدا

۲. النتيجة واحدة، لا فرق هناك في النهاية

*be all (just) the ~ to* وەك یەکە لای من، هەر هەمان شت بەهەرحاڵ

الأمر سيان لدي، الشيء ذاته على أي حال

*all the ~* لەگەڵ ئەوەشدا

ومع ذلك، على أي حال

□ *adv the ~* بەهەمان رێگا، هەمان رێباز

بنفس الطريقة، على نفس النحو

*If you leave me I shall never feel the ~ again.*

**sample** /ˈsɑːmpl/ *n* [C] نموونە، شێوە

عينة، نموذج

□ *vt* نمونەیەك دەبات لە، تاقیدەکاتەوە

يأخذ عينة من، يختبر

**sanatorium** /ˌsænəˈtɔːrɪəm/ *n* [C] نەخۆشخانەبۆنەخۆشیە درێژخایەنەکان (ئەو نەخۆشانەی لێیپیربوون)

مستشفى او مصح للمصدودين

**sanctify** /ˈsæŋktɪfaɪ/ *vt* بەپیرۆزی دادەنێ، رەوادکت

يقدس، يكرم

**sanctimonious** /ˌsæŋktɪˈməʊnɪəs/ *adj*

دووروو، بەچاکسازو لەخواترس خۆی لەقەڵەمئەدا

منافق، يتظاهر بالتقوى والصلاح

**sanction** /ˈsæŋkʃn/ *n* [C,U]

۱. پسوڵەی رەزامەندی، پسوڵەی رێگەپێدان ۲. دانپیانان، مۆرکردن، پشتگیریکردن، رەزامەندی

۱. تصريح بالموافقة، اذن بالسماح ۲. اقرار، تصديق، موافقة

*~ s against aggressors* ۳. سزا، پاداشت، سزای دەستدرێژیکەران

۳. عقوبة، جزاء: العقوبات على المعتدين

□ *vt* دانی پیادەنی، رەوای دەکا، پشتگیری دەکا

يقر، يجيز، يصدق على

**sanctity** /ˈsæŋktətɪ/ *n* [U] پیرۆزی، رێز

قدسية، قداسة، حرمة

**sanctuary** /ˈsæŋktʃʊərɪ/ *n* (*pl* -ries) ۱. شوێنی پیرۆز (وەك مزگەوت و کەنیسە) ۲. (لە مێژووی کۆندا) مەزار، پەناگە، حەشارگە

۱. مكان مقدس (كالمسجد، كالكنيسة مثلاً) ۲. (في التاريخ القديم) ملاذ، حرمة

*a bird ~* ۳. ناوچەیەك راوکردنی پەلەوەر قەدەغەیە تێیدا

۳. منطقة يحظر صيد الطيور بها

**sand** /sænd/ *n* [U] ۱. لم، سیلك

۱. رمل، رمال

*the ~ s* ۲. کەنارئاوی لمین

۲. الشاطىء الرملي

ˈ**sandbag** *n* [C] توورەکە لم

كيس رمل

ˈ**sand dune** *n* [C] تەپۆڵکەی لم

مرتفع / تبه من الرمال

**'sandpaper** *n* [U] کاغەزیسمارتە، کاغەزی شووشە
ورق سنفرة او صنفرة، ورق زجاج

**'sand-stone** *n* [U] لمە بەرد
الحجر الرملي

**'sand-storm** *n* [U] زریانی لمین
عاصفة رملية

**sandy** *adj* (-ier, -iest) ١. پێکهاتوە یان داپۆشراوە بە لم ٢. (بەتایبەتی قژ) ڕەنگی لمی
١. يكون أو طوله مغطى بالرمال ٢. (بخاصة الشعر) رملي اللون

**sandal** /'sændl/ *n* [C] پاپوچ، نەعل، سەندەل، سۆل
صندل، خف

**sandwich** /'sænwɪdʒ/ *n* [C] سەندەویچ، بابۆڵە، لەفە
سندويتش، شطيرة
□ *vt* (شتێ یا کەسێك) دەهاوێتە نێوان دوانی تردا
يقحم (شيئاً او شخصاً) بين اثنين آخرين

**sane** /seɪn/ *adj* (-r, -st) ١. ژیر، عاقڵ، هۆشیار ٢. لەبار، ژیرانە، پەسەند:
١. سليم العقل ٢. معقول:
~ *view/policies* بۆچوون/سیاسیەتیژیرانە
آراء / سياسات معقولة

**sang** /sæŋ/ (بڕوانە *sing*)
(انظر *sing*)

**sang froid** /sɑ:ŋ 'frwɑ:/ *n* [U] (فەرەنسی) هێمنی، هەداری، خۆڕاگری
(الفرنسية) هدوء، رباطة الجأش

**sanguine** /'sæŋ:gwɪn/ *adj* ١. گەشبین، بەهیوا ٢. خۆشبین، ڕووگەش
١. متفائل، مؤمل ٢. متورد الوجه

**sanitary** /'sænɪtrɪ/ *adj* پاك، دروستانە
نظيف، صحي
~ *conditions* مەرجەتەندروستیەکان ٢. دروستیی، پەیوەندە بە خۆپاراستنی تەندروستی
الشروط الصحية ٢. صحي، متعلق بالوقاية الصحية

**sanitation** /sænɪ'teɪʃn/ *n* پتەوکردنی تەندروستی گشتی وەکو (ڕێکخستنی ئاووئاوەڕۆ)
تعزيز الصحة العامة (كتنظيم صرف مياه المجاري مثلا)

**sanity** /'sænətɪ/ *n* [U] هۆشمەندی، دروست مەندی، ژیر
سلامة العقل او صحته، رجاحة الرأي

**sank** /sæŋk/ (بڕوانە *sink*)
(انظر *sink*)

[1]**sap** /sæp/ *n* [U] ڕۆچوو، ئاڤدار، زیچکاوی ڕووەك
النسغ، عصارة النبات
□ *vt* (-pp-) چەپەری چێدکت، لاواز دکت، لاواز دەبێ
يستنزف نسغه، يضعف، يوهن
~ *ped by disease/an unhealthy climate* نەخۆشی لاوازی کردوە / کەشی ناهەموار بۆ تەندروستی
اوهنه المرض / طقس غير مناسب للصحة

**sapling** *n* [C] نەمام: درەخت لە سەرەتای گەشەکردنا
شجرة في اول مراحل النمو

[2]**sap** /sæp/ خەنەك بۆ نزیكبونەوە لە جێگەکانی دوژمن، بەخەنەك هەڵکەندن بۆ نزیك بوونەوە لە دوژمن
خندق للإقتراب من مواقع العدو. يحفر خندقاً للإقتراب من مواقع العدو
□ *vt*, *vi* (-pp-) لاوازدەکات، لایدەبا (دیوار)، وێرانیەکات، کۆتایی پێدێنێ (متمانەبەخۆبوونی کەسێك)
يوهن، يقوض (جداراً)، (مجاز) يدمر، يقضي على (ثقة المرء في نفسه مثلا)

**sapper** /'sæpə(r)/ *n* [C] سەرباز لەبەشی ئەندازیاری
جندي في سلاح المهندسين

**sapphire** /'sæfaɪə(r)/ *n* [C] یاقوتی شین، بەردی سەفیر
حجر الصفير، ياقوت ازرق

**sarcasm** /'sɑ:kæzəm/ *n* (بەکارهێنانی) گاڵتە پێکردن، گاڵتەجاڕی، قەشمەری، تەڤز
(استخدام) السخرية او التهكم

**sarcastic** /sɑ:'kæstɪk/ *adj* گاڵتەکەر، تەڤزکەر
ساخر، تهكمي، لاذع

**sarcastically** *adv* بە گاڵتەوە، تەڤزی
بسخرية، بتهكم

**sarcophagus** /sɑ:'kɒfəgəs/ *n* تابوتی بەردین
الناووس، تابوت حجري

**sardine** /sɑ:'di:n/ *n* ماسی (سەردین)، ماسی هورك،

ماسی بچووک له قتوو ئه‌نرێ له‌گه‌ڵ ڕۆن
السردین: سمك صغیر یعلب بالزیت

**sardonic** /sɑːˈdɒnɪk/ گاڵته‌چی
تهکمی، ساخر

**sardonically** *adv* به گاڵته‌وه
بتهکم، بسخریة

**sari** /ˈsɑːrɪ/ *n* [C] (*pl*. ~ *s*) که‌وا:کراسی ژنی هندستان
الساري: ثوب ترتدیه النسوة الهندوسیات

**sarong** /səˈrɒŋ/ *n* په‌شتماڵ، سارونگ، پارچه قوماشێك ئه‌ئاڵێنرێ به به‌شی خواره‌وه‌ی له‌ش، دانیشتوانی مه‌لایو به‌کاری ئه‌هێنن
السارونغ: قطعة من القماش تلف حول الجزء الأدنى من الجسم یستخدمها سكان الملایو

**sartorial** /sɑːˈtɔːrɪəl/ *adj* په‌یوه‌نده‌به‌پێویستیه‌كانی به‌رگدرووی پیاوان
متعلق بالخیاطة للرجال ولوازمها

**sash** /sæʃ/ *n* پشتێن، په‌چه، تولێكی په‌رۆینی پان بۆ که‌مه‌رو سنگ، تیلمه
نطاق، وشاح، شریط قماشی عریض للخصر او الصدر

*sash window n* چوارچێوه‌ی ته‌خته بۆ په‌نجه‌ره
إطار خشبی منزلق للنافذة

**sat** /sæt/ (بڕوانه *sit*)
(انظر *sit*)

**Satan** /ˈseɪtn/ *n* شه‌یتان
الشیطان، ابلیس

**Satanic** /səˈtænɪk/ *adj* شه‌یتانی، به‌دخو، خراپ
شیطانی، ابلیسی، شریر

**satchel** /ˈsætʃl/ *n* جانتا (به‌تایبه‌تی بۆ کتێبی قوتابی)
حقیبة (خصوصاً للكتب المدرسیة)

**sate** /seɪt/ *vt* = *satiate* تێر ده‌كات (ئاره‌زوو) تێرکردنی ته‌واو
یشبع (رغبة) اشباعاً تاماً

**satellite** /ˈsætəlaɪt/ *n* [C] ۱. مانگ ئه‌سوڕێته‌وه به ده‌وری ئه‌ستێره‌كاندا، سه‌ر به
۱. قمر یدور حول كوكب، تابع

*The moon is a ~ of the earth.* مانگ ڕه‌ده‌وی زه‌ویه ۲. مانگی ده‌ستکرد ۳. سه‌ر به‌و (فه‌رمان له که‌سی تره‌وه وه‌رده‌گرێ
القمر تابع للارض ۲. قمر صناعی ۳. (مجاز) تابع (یتلقی اوامره من آخر)

**satiate** /ˈseɪʃɪeɪt/ *vt* تێر ده‌بێ (ئاره‌زوو) تێربوونی ته‌واو
یشبع (رغبة مثلاً) اشباعاً تاماً

*~ d with food/pleasure* تێر ئه‌بێ له خواردن، خۆشی
متخم بالطعام باللذة

**satiety** /səˈtaɪətɪ/ *n* [U] تێربوون
اشباع، تخمة

**satin** /ˈsætɪn/ *n* سه‌ته‌ن، ئه‌تڵه‌س: ئه‌ته‌مین، ئاوریشم
اطلس، ساتان: نسیج حریری مصقول

□ *adj* ساتان، لووسکراو
ساتانی، صقیل

**satire** /ˈsætaɪə(r)/ *n* [C,U] جنێو، داشۆری، هه‌جو، په‌خشانێکی جنێوانه
قدح، هجاء، اهجوه، مقطوعة هجائیة

**satirical** /səˈtɪrɪkl/ *adj* جنێوانه، رووشكان رسوایی
هجائی، تقریعی

**satirically** *adv* به جنێوو ریسواگه‌ری
علی نحو هجائی، و تقریعی

**satirist** /ˈsætərɪst/ *n* نوسه‌رێکی جنێوفرۆش، گاڵته‌پێکه‌ر
کاتب هجائی او ساخر

**satirize** /ˈsætəraɪz/ *vt* رسوا ئه‌کا، پاشمله‌ی ده‌ڵێ
یهجو، یذم

**satisfaction** /ˌsætɪsˈfækʃn/ *n* [U] قایلی، حه‌وانه‌وه، دڵخۆشکه‌ر، هه‌ستکردن به ره‌زامه‌ندیو ئاسووده‌یی
رضی، ارتیاح، شعور بالرضی او الارتیاح

**satisfactory** /ˌsætɪsˈfæktərɪ/ *adj* قایلکه‌ر، حه‌وێنه‌ر، قایل، به‌هانا، له‌بار، دڵنیاکه‌ر، هاوده‌م
مرض، مریح، مقنع، ملب لحاجة او رغبة، مناسب لغرض ما، واف بالمطالب

**satisfactorily** *adv* قایلکه‌رانه
علی نحو مرض او مقنع

**satisfy** /ˈsætɪsfaɪ/ *vt* ۱. قایل ده‌بێ، تێر ئه‌بێ، ئه‌کات ۲. به‌شی ئه‌کا، ئه‌گونجێ بۆ ۳. خۆی رازیه‌کات قه‌ناعه‌ت
۱. یرضی، یشبع، یقنع ۲. یکفی ل، یناسب ۳. یقنع (نفسه، غیره)

بأن...

**saturate** /ˈsætʃəreɪt/ *vt* ۱. تێری دەکا، تەڕیدەکا

۱. يشبع ب، يبلل

~ *with learning/prejudice* تێرئەبێ لە زانین/ پێشبڕیارکردن

(مجاز) يشبع بالمعرفة/ بالتحامل

۲. (زانست) تێربوو، گیراوەی *a ~d solution of salt* تێر خەست، تێر خوێ

۲. (علوم) يشبع ب مشبع بالملح

**saturation** /ˌsætʃəˈreɪʃn/ *n* [U] تێربون، خوسان

تشبع، إشباع، نقع

**Saturday** /ˈsætədɪ/ *n* ڕۆژی شەممە

يوم السبت

**satyr** /ˈsætə(r)/ *n* (لە چیرۆکی یۆنانی و ڕۆمانی) بونەوەری ئەفسانەیی نیوەی سەرەوەی مرۆڤ و خوارەوەی ئاژەڵە

(في القصص اليونانية والرومانية) مخلوق خرافي نصفه الاعلى انسان والاسفل حيوان

**sauce** /sɔːs/ *n* [C,U] ساس، شلەبەهارات

صلصة، مرق التوابل

**saucily** *adv* بێ ئابڕوویی، بە هارو هاجی

(ل.د) وقاحة بوقاحة، بقلة حياء

**saucy** *adj* (-ier, -iest) بێ ئابروو، زمان تاڵ

وقح قليل الحياء

**saucepan** /ˈsɔːpən/ *n* [C] مەنجەڵۆك

قدر صغير للطبخ (كسرولة)

**saucer** /ˈsɔːsə/ *n* [C] ژێر پیاڵە، کاسکا فنجانی

صحن الفنجان

**sauna** /ˈsaʊnə/ *n* [C] ساونا، هەڵمە گەرماو (لە فنلندا) گەرماڤ یان سەرشۆرگەی هەڵمین

السونا: حمام بخار (في فنلندا)

**saunter** /ˈsɔːntə(r)/ *vi* گەڕان، دگەڕێت

يهيم، يتجول، يتلكأ

□ *n* [C] گەڕان

مشية متئدة

**sausage** /ˈsɒsɪdʒ/ *n* [U] گۆشتی سوسەج، باسترمە

نقانق، سجق، شريحة نقانق

**savage** /ˈsævɪdʒ/ *adj* ۱. دڕندە، بەربەری، ساوا، ساوێلکە

۱. همجي، بربري، بدائي

~ *tirbes/countries* هۆز/ وولاتی سەرەتایی دواکەوتوو

قبائل/ بلاد بدائية

۲. دڕندە، شەڕانی، شەڕکەر □ *n* [C]

۲. متوحش، شخص همجي او متوحش

**savagely** *adv* بەدڕندەیی، بە هۆڤی

بوحشية، بهمجية

**savagery** *n* [U] دڕەندەیی، ڕەوشتی دڕندانە، هوڤە بەری

وحشية، همجية، سلوك وحشي او بربري

**savanna(h)** /səˈvænə/ *n* سافانا: دەشت بێدار، لەوەڕگا (بەتایبەت لە ئەمریکای ناوەڕاست)

السفانه: سهل خال من الاشجار، منطقه المراعي (بخاصة في امريكا الوسطى)

**save** /seɪv/ *vt, vi* ۱. ڕزگاری دەکات

۱. ينقذ، ينجي:

~ *sb from drowning* کەسێ لە خنکان ڕزگار دەکات

ينقذ شخصا من الغرق

~ *sb's life* ژیانی کەسێك ڕزگار دەکات

ينقذ حياة شخص

~ *a person from himself* خۆی لێ ڕزگار ئەکات (لە ئەنجامی گەوجی و گێلی) ۲. پاشەکەوتی دەکا (بەتایبەتی پارەو پول)، کۆیدەکاتەوە

ينقذه من نفسه (ينقذه من عواقب حماقته) ۲. يوفر (خاصة المال)، يدخر:

~ *some of the meat for tomorrow* هەندێ گۆشت بۆ سبەینێ لائەبات ۳. دوور ئەکەوێتەوە

وفر بعض اللحم للغد ۳. يتجنب، يقتصد:

*If you walk, you'll ~ spending money on bus fares.* ئەگەر بە پێ بڕۆیت دوور ئەکەوێتەوە لە فیڕۆدانی پارە بۆ پاس ٤. دوری ئەخاتەوە پێداویستی (خەرج کردنی پارە)

اذا سرت على قدميك فانك ستجنب انفاق المال اجوراً للباصات ٤. يجنبه الحاجة الى (انفاق المال مثلاً)

*That will ~ me a lot of trouble.* ئەمە زۆر کێشەو تەنگ وچەڵەمەم لێ دوور ئەخاتەوە

هذا سيجنبني الكثير من المتاعب

~ (one's) face له ته‌نگه‌تاو دوور ئه‌كه‌وێته‌وه، ڕێزی ئه‌پارێزێ ناهێڵێ ئاره‌قی شه‌مه‌زاری ده‌ربكات ٥. (له ئایینی گاووردا) له گوناه پاك ئه‌بێته‌وه

يتجنب الحرج او فقد الاحترام ٥. (في الديانة المسيحية) يخلص من الخطيئة

□ prep, conj بێجگه له، به‌بێ

ماعدا، عدا، سوى

**saving** *adj* ڕزگاركردن، چاكه كردن

الفضيلة

*the ~ grace* ته‌نها چاكه‌یه‌ك كه بیپارێزێت ڕۆحسوكیی و سوعبه‌ته

الوحيدة التي تشفع له (هي خفة الظل)

*of (humour)* ١. ڕێگه پاشه‌كه‌وت كردن، بڕی پاشه‌كه‌وت

١. وسيلة الادخار، المقدار المدخر

*a ~ of time and money* پاشه‌كه‌وت كردنی وه‌خت و سامان

توفير للوقت والمال

□ *n*

*keep your ~ s in the bank* ٢. (له‌شێوه‌ی كۆدا) پاشه‌كه‌وته‌كان

٢. (في صيغة الجمع) مدخرات

**'savings-bank** *n* بانكی پاشه‌كه‌وت

مصرف او بنك الأدخار

**saviour** /ˈseɪvɪə(r)/ *n* ڕزگاركه‌ر، ڕزگاركار

منقذ، مخلص

*The S~ , Our S~* ڕۆحی مه‌سیحی دڵسۆز

المسيح، المخلص

**savour** /ˈseɪvə(r)/ *n* [C,U] چێژ، تامدار، بۆنخۆش

طعم، مذاق، نكهة

□ *vi ~ of* پێشیار پێشكه‌ش ئه‌كا

يوحي ب، يشتم منه (كذا)، ينم عن

**savoury** /ˈseɪvərɪ/ *adj, n* [C] (*pl* -ries) (خواردن) تامدار، خۆش

(الطعام) ذو طعم حريف او مثنه

**[1]saw** /sɔ:/ (بڕوانه *see*)

(انظر *see*)

**[2]saw** /sɔ:/ *n* [C] مشار

منشار

□ *vt, vi* (*pt* sawed, *pp* sawn) ده‌بڕێت به مشار

ينشر، يقطع بالمنشار:

*~ sth up* ورده‌ده‌كات به مشار

ينشره الى قطع (بالمنشار)

**'saw-dust** *n* [U] ئارده‌دار، كه‌په‌ك

نشارة الخشب

**'saw-mill** *n* كارگه‌ی وورده‌دار دروستكردن

منشر، مصنع لنشر الاخشاب

**sawyer** /ˈsɔ:jə(r)/ *n* [C] داربڕ، ورده‌دار چێكه‌ر

نشار الخشب

**saxo-phone** /ˈsæksəfəʊn/ *n* ساكسۆفۆن، ئامێری مۆسیقا

سكسية، ساكسفون (موسيقى): آلة نفخ نحاسية

**say** /seɪ/ *vt, vi* (*3rd pers, pres tense* says /sez/, *pt, pp* said /sed/) ١. ئه‌ڵێت، دیێژێت

١. يقول

*What do you ~ to...?* ٢. ڕات چی‌یه له، پێموایه، له‌ڕاستیدا وه‌ك وتراوه

٢. ما رأيك في، من البديهي ان، غني عن القول

*go without ~ ing* بڕێ ئه‌وه‌ی هیچ بڵێی

مفهوم بالبداهة

*that is to ~* به مانای، وایه، ڕاسته

أي ان، بمعنى ان

□ *n have/say one's ~* ده‌ری ئه‌بڕێ / ڕای خۆی ئه‌ڵێ

يعبر عن / يقول رأيه

*have a ~ in the matter* مافی ده‌ربڕینی ڕای خۆی هه‌یه سه‌باره‌ت به بابه‌ته‌كه

لديه حق ابداء الرأي في الموضوع

**saying** /ˈseɪɪŋ/ *n* ورته، قسه‌ی نه‌سته‌ق

مثل مأثور، قول مألوف

*It was a ~ of his that.* له ووته‌به‌نرخه‌كانی كه

كان من اقواله ان

**scab** /skæb/ *n* [C,U] ١. توێژاڵی برین ٢. خرووی وولاخ، گه‌ری ٣. ناپاك، به‌ده‌ر له كۆمه‌ڵ

١. جلبة او قشرة القرحة او الجرح ٢. جرب الماشية ٣. (ل.د)

خائن، خارج عن الأجماع (النقابي)

**scabby** *adj* گەری، گوری، برینداوی، کێماوی

اجرب، مصاب بالجرب او مغطى بالقروح

**scabbard** /skæbəd/ *n* [C] کیف (شمشێر)، کاڵاڵانی خەنجەری

غمد (الخنجر)، قراب (السيف)

**scabies** /ˈskeɪbi:z/ *n* [U] گەری (جۆرە نەخۆشی پەکە)

الجرب (مرض جلدي)

**scaffold** /ˈskæfəʊld/ *n* [C] ١. سێدار، قنارە ٢. هەرزاڵ، قەنارە

١. سقالة ٢. مشنقة

**scaffolding** *n* [U] کەرەستەی پێویست بۆ دروستکردنی سەقالە، چێویەس

(المواد اللازمة لصنع) السقالات

**scald** /skɔ:ld/ *vt* ١. داغەپلۆخێن، ئەسووتێ بە شلەمەنی، مادەی شلەمەنی یان ئاوی گەرم

١. يحرق (بسائل)، يسمط

*~ one's hand with hot fat* ١. دەستی بە رۆنی گەرم ئەسووتێ ٢. (قاپ) بە ئاوی گەرم یان هەڵم پاك دەکاتەوە ٣. (شیرەکە) گەرم ئەکات تا نزیك پلەی کوڵان

١. يحرق يده بالدهن الساخن ٢. ينظف (الصحون) بالماء المغلي او البخار ٣. يسخن (الحليب) قريباً من درجة الغليان

□ *n* [C] سووتانی پێست بە ئاوی گەرم یا هەڵمی گەرم

حرق بالجلد من الماء الحار او البخار

[1]**scale** /skeɪl/ *n* [C] ١. پێوانە، نیشانەی پێوانە وەك (لەسەر راستە) پێوەری پلەپلەکراو ٢. باسای پێوانە:

١. مقياس، علامات القياس (على مسطرة مثلاً) مقياس مدرج

٢. نظام لوحدات القياس:

*the decimal ~* یاسایی دەیی ٣. ئامێری پێوانە

٤. پلەی قادرمە

نظام القياس العشري ٣. اداة للقياس ٤. سلم الدرجات

*a ~ of wages* پلەی کرێ

سلم الاجور

*a person who is high on the social ~* کەسێکی پایەدار لە دەستەی کۆمەڵایەتیدا ٥. پێوەری وێنە:

شخص ذو مكانه عالية في الهيئة الاجتماعية ٥. مقياس الرسم:

*a map on the ~ of one inch to a mile* نەخشە بە پێوەری نەخشەکێشان یەك بۆسە وێنە ئەکێشرێ بۆ هەر میلێك

خريطة بمقياس رسم قدره بوصة واحدة لكل ميل

٦. بوار، سنوور، رادە □ *vt*

٦. نطاق، حد، مدى:

*making preparations on a large ~* خۆئامادەکردن زۆر بەفراوانی دەستی پێ کرد ٧. مۆسیقا

يجري الاستعدادات على نطاق واسع ٧. (موسيقى) السلم الموسيقي

□ *vt* ١. سەرئەکەوێ ٢. وێنەی (نەخشەیەك) دەکێشێ بەپێی پێوەرێکی دیاریکراو

١. يتسلق ٢. يرسم (الخرائط) حسب مقياس معين

*~ up/down* ٣. رێکی ئەخات، بەرزی ئەکاتەوە/ نزمی ئەکاتەوە بە رێژەی دیاری کراو

٣. يعدل، ينظم، يرفع / يخفض بنسب معينة

*All prices/wages were ~ d up ten per cent.*

نرخەکان/ کرێکان بەرزبونەوە بە رێژەی لە سەدا دە

جميع الاسعار / الاجور رفعت بنسبة عشرة بالمائة

[2]**scale** /skeɪl/ *n* [C] ١. تەرازوو، تای تەرازوو ٢. (لە شێوگی کۆ) بەزۆری (لەگەڵ *pair of ~ s*)، تەرازوو

١. كفة الميزان ٢. (في صيغة الجمع غالباً: *pair of ~s*) ميزان:

*turn the ~ s* قورسی ئەکات (لەبەرژەوندی ئەوە)

يرجع الكفة (في صالح كذا)

*hold the ~ s even* دادوەرانە فەرمانڕەوایی ئەکات

يحكم بالعدل والقسطاس

**scale** /skeɪl/ *n* [C,U] ١. توێژ، توێکڵ، پولەکەی ماسی ٢. نیشتوی کلسی (ناو کتری و بۆری ئاو یان کلسی دان

١. قشرة، حراشف، فلوس السمك ٢. رواسب جيرية (داخل السخانات، انابيب المياه او على الاسنان)

□ *vt, vi* ١. پولەکەی ماسی لا ئەبات ٢. توێخی لێ ئەکاتەوە

١. يزيل قشر السمكة او فلوسها ٢. يتقشر، ينفصل الى رقائق

*paint scaling off a wall* (بۆیاخی رۆن بۆ دیوار) لە دیوار جیادەبێتەوە وەك توێژ

دهان (طلاء) ينفصل عن جدار على شكل رقائق

**scalp** /skælp/ *n* [C] پێستی سەر

فروة الرأس

**scanty** *adj* (-ier, -iest) لاواز، کەمەك
هزيل، ضئيل، لايكاد يكفي
**scantily** *adv* بەکەمی، تۆزقاڵێ، نەختێ
بقلة، بضآلة، على نحو ضئيل او هزيل
**scapegoat** /ˈskeɪpgəʊt/ *n* قۆچی قوربانی
كبش الفداء
***scaphoid** *adj* بەلەمی
زورقي
***scapula** شەپیلك، دەفەیشان
لوح الكتف
**scar** /skɑː(r)/ *n* [C] پەڵە، جێگەبرینی چاکەوەبوو
ندبة، اثر الجرح المندمل
□ *vt* (-rr-) بریندار دکت، شوێنە برین بەجێ دەهێڵێ
يندب، يترك ندباً
*an arm ~ red by numerous vaccinations*
چەندجارەی کوتان لە سەرقۆڵ جێگەی بەجێ هێشتووە
ذراع ترك فيها التلقيح المتكرر ندوباً
**scarab** /ˈskærəb/ *n* [C] خاڵخاڵۆکەی رەش، هەڵکۆڵراو یا نەخش ونیگاری خاڵخاڵۆکەیی
الجعل: خنفسة سوداء، نحت او نقش على شكل خنفسة
**scarce** /skeəs/ *adj* (-r, -st) ١. دەگمەن، کەم
١. نادر، عزيز:
*Eggs were ~ here last winter.* زستانی پێشو هێلکە کەم بوو بە دەگمەن دەست ئەکەوت ٢. دەگمەن، کەم
كان البيض نادراً هنا في الشتاء الماضي ٢. غير متوفر، نادر الوجود
**scarcely** /ˈskeəslɪ/ *adv* زۆر کەم، ئەنجەخ
بالكاد، بمجرد ان
*S~ anyone knows what happened.* هیچ کەس نەیئەزانی چی ڕویداوە
لايكاد احد يعرف ما حدث
**scarcity** /ˈskeəsətɪ/ *n* کەم، دەگمەن
قلة، ندرة، نقص
**scare** /skeə(r)/ *vt, vi* دەترسێنێ، ئەتۆقێ
يخيف، يفزع، يرعب
□ *n* [C] تۆقین، مەترسی، ترس
فزع، رعب، خوف:
*The news caused a war ~.* هەواڵەکان مەترسی

□ *vt* پێستی سەر دائەماڵێ
يسلخ فروة الرأس
**scalpel** /ˈskælpəl/ *n* [C] چەقۆی نەشتەرگەر
مشرط، مبضع (الجراح)
**scamp** /skæmp/ *n* [C] کەسێکی دووڕوو
وغد، نذل (للدعابة عادة)
□ *vt* بەپەلەو بێئاگا کار ئەکات
يعمل بعجلة او اهمال
**scamper** /ˈskæmpə(r)/ *vi* دبەزێت، ڕەڤین، ئەڕوا
يعدو، يفر
□ *n* [C] ڕۆیشتنی کورت و خێرا
عدو سريع وقصير، جري
**scan** /skæn/ *vt, vi* ١. تێدەڕوانێت، دیڤت
١. ينعم النظر، يتفرس في
*~ the horizon/sb's proposals* دیقەت لە ئاسۆدەدا/ لە پێرورای کەسێك، دەگەرێ لە ٢. هۆنراوە دەهۆنێتەوە ٣. (دێرە هۆنراوەیەکی) کێش ڕێك
ينعم النظر في الافق / في مقترحات شخص ٢. يقطع بيتاً من الشعر ٣. (بيت الشعر) يكون صحيحا من ناحية الوزن
**scandal** /ˈskændl/ *n* [C,U] ١. ئابڕوچوون
٢. بڵاوکردنەوەی پرۆپاگەندەی زیانبەخش، پرۆپاگەندەی زیانبەخش بە ئابڕو (ڕیسوابوون)
١. فضيحة ٢. ترويج الشائعات المؤذية، شائعات مؤذية للسمعة
**scandalize** *vt* ١. توشیدەبێت، ٢. ئابڕوودەبات، ئەیوروژێنێ
١. يصدم ٢. يثير الاشمئزاز
**scandalous** *adj* ١. ئابڕووبەر، ڕیسوای، ڕووڕەشی ٢. (کەسێکی) ئابڕوو بەر
١. مشين، فاضح (الشائعات) ٢. (الشخص) مفتر، محب لنشر الفضائح
*~ neighbours* دراوسێی خراپ، بەد خوو، ئابڕووبەر
جيران محبون لنشر الفضائح
**scant** /skænt/ *adj* کەم، پارچەیەکی بچووك بەئاستەم بەش بکا
ضئيل، قليل، بالكاد يكفي
*pay ~ attention to what sb says* بایەخ نادات بەوەی پێی دەیێژرێ، گوێ پێ نادان
لايعير ما يقول له اهتماماً يذكر

شەڕی دروست کرد
اثارت الاخبار فزعاً من الحرب

**scarecrow** *n* [C] کالو، ترس، وەیشومە
الفزاعة، خيال المآتة

**'scaremonger** *n* بڵاوکەری پروپاگەندەی شێواندن وتۆقاندن
مروج الاشاعات المقلقة

**scarf** /ska:f/ *n* ملپێچ، ستوێچ
وشاح، تلفيعه

**scarlet** /'ska:lət/ *n* [U], *adj* سوور، جگەری
قرمزي، لون قرمزي

*~ fever* گرانەتا، سوورە تا
الحمى القرمزية

**scathing** /'skeɪðɪŋ/ *adj* (ووشە، گلەیی) ڕەق، گەزێن، جەرگ بڕ
(الكلمات، الانتقادات) جارحة، مريرة، لاذعة

**scatter** /'skætə(r)/ *vt, vi* ۱. بڵاویدەکاتەوە، دوەشێنێت، جیایدەکاتەوە، پەردەوازەدەبێ
۱. يشتت، يفرق، يتفرق

*~ seed* ۲. تۆو وەشاندن
۲. ينثر، يذر: ينثر البذور

**scattered** *adj* دابەشکراو، پەرت، بڵاو، بەلاڤ
متفرق، متناثر، مبعثر

*~ villages* گوندی پەرش وبڵاو
قرى متناثرة

**scavenger** /'skævɪndʒə(r)/ *n* [C] ۱. ئاژەڵ یا باڵندەی گۆشتخۆر ۲. گسك دەر، خوڵڕێژ، پاکەڤان
۱. حيوان او طائر يعيش على لحم الفطائس ۲. (أ.ق) كناس، زبال

**scenario** /sɪ'na:rɪəʊ/ *n* [C] سیناریۆ: دەقی سینەمایی
سيناريو: النص السينمائي

**scene** /si:n/ *n* [C] ۱. شوێنی ڕووداو
۱. مكان وقوع الحادثة

*the ~ of a famous battle* شوێنی ڕوداوێکی ناوبانگدار ۲. دیمەن، بینەك:
مسرح الحادثة او الاحداث مسرح واقعة شهيرة ۲. منظر، مشهد:

*boats in the harbour making a pretty ~* کەشتییەکان لەبەندەرەکەدا دیمەنێکی جوان دروستدەکەن
قوارب في الميناء تشكل منظراً بديعاً

*go abroad for a change of ~* ئەڕوات بۆ دەرەوەی وڵات بۆ دیمەن گۆڕین ۳. ڕوانگە: بەشێك لەبابەتی شانۆگەری
يسافر الى الخارج تغييراً للمناظر ۳. المشهد: جزء من فصل مسرحي

*Act I,S~ ii* دیمەنی دووەم لە بەشی یەکەم ٤. دوای پەردە، بە نهێنی
المشهد الثاني من الفصل الاول ٤. وراء الستار، سراً

*behind the ~ s* نهێنییەکان ٥. شالاوێك تورەبوون، هەڵچوونی سۆز
خلف الكواليس ٥. ثورة غضب، انفجار عاطفي:

*can't make a ~* مەیوروژێنە، پێویست بە هاوارناکات
لاثور، لا داعي للهياج

**scenery** /'si:nərɪ/ *n* ۱. دیمەن: پشتەوەی شانۆ ۲. دیمەن یان دیمەنی
۱. المشهد، خلفية المسرح ۲. مشهد او منظر طبيعي جميل:

*mountain ~* سروشتی جوان: دیمەنی شاخاوی
مناظر جبلية

**scenic** /si:nɪk/ *adj* دیمەنی سروشتی جوان
متعلق بالمشاهد الطبيعية

**scent** /sent/ *n* [C,U] ۱. بۆن
۱. رائحة (بخاصة عطرية)

*the ~ of roses* بۆنی گوڵ
عبير الأزهار

*a bottle of ~* ۲. بۆن، شوشەی گوڵاو
۲. عطر، طيب: زجاجة عطر

*She put some ~ on her hair.* بۆنی خۆشی دا لە قژی، قژی بۆندار کرد ۳. پاشماوە: بۆنێك ئاژەڵ دوای خۆی جێدێڵێ
وضعت بعض العطر على شعرها ۳. اثر: رائحة يخلفها الحيوان وراءه

*on/off the ~* بەدوایدا دەچێت/ ئاسەواری ون دەکا
يتبع / يفقد الاثر

*throw sb off the ~* هەوڵدەدات وێڵی بکات یان شوێنە ونەی پێدەکا ٤. هەستی بۆن:
يحاول ان يضلله او يموه عليه الامر ٤. حاسة الشم، الشم:

*hunt by ~* بەبۆنکردن راو ئەکات
یصطاد مستخدماً حاسة الشم

□ *vt* ١. بۆن ئەکات
١. یشم، یشتم:

*My dog ~ed a fox.* سەگەکەم بەبۆن هەستی بە بوونی ڕێوی کرد ٢. گومانی لێ‌دەکا، هەستی پێ‌ئەکات
احس کلبی بوجود الثعلب بواسطة الشم ٢. (مجاز) یشتبه، یحس ب

*~ a plot/ crime* بۆنی گۆیەنێك ئەکات ٣. بۆنی لێ‌ئەدات، خۆشی ئەکات ٤. بۆنی عەتری دەدا بە، بۆنداریدەکا
یشتم رائحة مكيدة / جريمة ٣. یعطر، یطیب ٤. یعطی رائحة عطرية ل، یعطر

**sceptic** /ˈskeptɪk/ *n* بەگومان، زەندیق
مرتاب، شکاك، ملحد

**sceptical** *adj* گوماناوی، کفرکەر
شکی، الحادی

**scepticism** /ˈskeptɪsɪzəm/ *n* [U] گومان کردن
ریبة، شك، مذهب الارتیابي

**sceptre** /ˈseptə(r)/ *n* قامچی، گۆچانی دەسەڵاتداری
صولجان، عصا السلطة

**schedule** /ˈʃedjuːl/ *n* [C] رونکردنەوە، خشتەی کات تەرخانکردن
بیان، جدول مواعید

*according to ~* بەپێی پیلان داڕێژراو
حسب الخطة الموضوعة

□ *vt* رونکردنەوە یاخود دەرخستەیەك دائەنێ، دەخاتە خشتەیەك
یضع بیانا او کشفاً، یضمن فی جدول

**scheme** /skiːm/ *n* [C] ١. سیستم، رژێم، گونجان
١. نظام، نسق

*a colour ~* سیستمی ڕەنگەکان (گونجاندن ڕەنگەکان بۆ پێکهاتەکانی ژوور) ٢. پلان، پرۆژە، داپین کردن، بەرنامە:
نظام الالوان (توافق الالوان لمحتویات حجرة مثلاً) ٢. خطة، مشروع، تدبیر، منهج:

*a ~ for the term's work* بەرنامەی کارکردن بۆ ماوەیەك ٣. پیلان
منهج لأعمال الفترة ٣. مكيدة

□ *vt, vi* پیلان دائەنێ، گۆیەنێك دەنێتەوە
یخطط، یدبر (بخاصة مكيدة)

**schemer** *n* [C] پیلانگێر
مخطط، مدبر المكيدة

**scheming** *adj* فێڵباز
(بخاصة) شخص ماکر، مولع بتدبیر المکائد

**schism** /ˈskɪzəm/ *n* [U] دووبەرەکی، جودایی بوون، دابەشبوون (ئاینی)
انشقاق، شقاق، انقسام (بخاصة الدینی)

**schismatic** /skɪzˈmætɪk/ *adj* جوداخواز، هۆکاری جودایی
انشقاقی، مسبب للانشقاق

***schizophrenia** خۆکەرتی، ترازان، شکستە خۆیی
**schizophrenia**
أنفصام الشخصية

**scholar** /ˈskɒlə(r)/ *n* [C] ١. خوێندکار، قوتابی، زانست، هۆزان ٢. قوتابی خوێندنی باڵا ٣. زانا، ئەدیب، توێژەر
١. (ا.ق) طالب او طالبة، علم، تلمیذ، تلمیذة ٢. طالب حاصل علی منحة دراسیة ٣. عالم، ادیب، ضلیع (فی علم ما)، باحث

**scholarly** *adj* توێژەرانە، ڕۆشنبیرانە، پسپۆرانە، زانایانە
دال علی اطلاع واسع، جدیر بعالم، محب للعلم

**scholarship** *n* [C,U] ١. زانست، زانین ٢. خوێندنە بەخش
١. علم، معرفة ٢. منحة دراسیة

**scholastic** /skəˈlæstɪk/ *adj* قوتابخانەیی، خوێندنی، زانستی، دەرماڵەی یارمەتی خوێندن
مدرسی، دراسی، علمی

[1]**school** /skuːl/ *n* [C] خوێندنگە، قوتابخانە، گشت خوێندکارانی قوتابخانە ٢. فێرگە، ڕێبازی بیرو هونەری، فێرخوازانی فێرگەکە
مدرسة، جمیع طلبة المدرسة ٢. مدرسة او مذهب فکری او فنی، اتباع هذه المدرسة

□ *vt* رایدەهێنێ، بەڕێوە دەبا، ڕێکی دەخات، فێری ئەکات
یدرب، یدیر، ینظم، یعلم

**schoolboy** *n* [C] خوێندکار، قوتابی، شاگرد
طالب، تلميذ

**'schoolgirl** *n* [C] قوتابی/کچ
طالبة، تلميذة

**'schoolmate** *n* [C] هاو پۆل
رفيق للمدرسة

**schooling** *n* [U] راهێنان، فێرکردن
تدريس، تثقيف، تعليم

**schoolmaster** *n* [C] مامۆستا، بەڕێوەبەر (پیاو)
مدرس، معلم

**schoolmistress** *n* [C] مامۆستا، بەڕێوەبەر (ژن)
مدرسة، معلمة

**²school** /sku:l/ *n* [C] جەلەبی ماسی یا پەلەوەری ئاوی
سرب من الاسماك، القطيع المائي

**schooner** /sku:nə(r)/ *n* کەشتی دوو چارۆکەر یا زیاتری هەیە
مركب ذو شراعين او اكثر

**sciatica** زانەرەد شادەمارەزان
عرق النساء

**science** /'saɪəns/ *n* [C,U] ١. زانین، زانست ٢. یەکێك لە لقەکانی زانیاری (فیزیا یا کیمیا) ٣. کارامەیی، زیری، لێهاتوویی (لە وەرزش)
١. علم، (بخاصة تجريبي) ٢. احد فروع العلم (كالفيزياء او الكيمياء مثلاً) ٣. مهارة، حذق، براعة (في الرياضة مثلاً)

**scientific** /,saɪən'tɪfɪk/ *adj* ١. زانستی، بەپێی ڕێبازی زانستی:
١. علمي، متبع للاصول العلمية:
*~ farming* کشتوکاڵ بەپێی ڕێبازی زانستی
٢. هونەری، کارامەیی، شارەزایی
الزراعة حسب الاصول العلمية ٢. فني، ذو مهارة او خبرة فنية:
*a ~ boxer* بۆکس وەشێنی شارەزاو زیرەك
ملاكم ماهر او خبير

**scientifically** *adv* زانستیانە، بەشێوەیەکی زانستی
علمياً، على نحو علمي

**scientist** /'saɪəntɪst/ *n* [C] زانا
عالم

**scimitar** /'sɪmɪtə(r)/ [C] شمشێری چەماوە
سيف معقوف

**scintillate** /'sɪntɪleɪt/ *vi* دەبریسکێتەوە، پرش ئەداتەوە
يطلق شرراً، يومض، يتألق

***sclera** سپێنەی چاو
الطبه

***sclerascopy** ناخ بین پشکنەر
ناظور

**scissors** /'sɪzəz/ *npl* مەقەست، بڕەر، بەزۆری لەگەڵ (*pair fo*)
(غالباً *pair of ~*) مقص

**scoff** /skɒf/ *vi* گاڵتەی پێ ئەکات
يهزأ، يسخر

□ *n* [C] گاڵتەجاری/گاڵتەپێکردن
سخرية / تهكم

**scoffer** *n* [C] ترانەکەر، گاڵتەکەر
متهكم، مستهزيء

**scold** /skəʊld/ *vt, vi* سەرزەنشتی ئەکات، لێ تووڕە ئەبێ، لێی ئەپرسێتەوە
يوبخ، يعنف، يزجر

□ *n* [C] ژنی زماندرێژو خراپ
إمرأة سليطة اللسان

**scone** /skɒn/ *n* [C] کولیچەی پان و خڕ
فطيرة مستديرة ومسطحة

**scoop** /sku:p/ *n* [C] ١. چەمچە، ئەسکوێ ٢. پێشبرکێی ڕۆژنامەگەری
١. جاروف، مغرفة كبيرة ٢. سبق صحفي

□ *vi* ١. ڕای دەماڵێ، دایئەماڵێ ٢. هەڵی ئەکۆڵێ و درزی تێ ئەکات
١. يجرف، يغرف ٢. يجوف، يقور

**scoot** /sku:t/ *vi* دەرئەپەڕێ، ڕائەکا
(ل.د) ينطلق هارباً

**scooter** /'sku:tə(r)/ *n* [C] پاسکیلی پێ، دووچەرخی هەڵمێنی نزم
دراجة الرجل، دراجة بخارية منخفضة

**scope** /skəʊp/ *n* [U] ١. بوار بینین، مەودا، فراوان ٢. بوار، هەل
١. مدى النظر، مجال، متسع ٢. فرصة، مجال:

*work that gives ~ for one's abilities* کارکردن
بواری دەرخستنی لێهاتووی کەسێك
عمل يفسح مجالاً لاظهار قدرات المرء

**scorch** /skɔːtʃ/ *vt, vi* ١. دەیسوتێنێ، گڕی تێبەردەدا
٢. (زاراوەی باوی ناو شوفێرەکان) بە خێرایی دەرئەپەرێ
١. يحرق، يشيط ٢. (ل.د) يستخدمها سائقو الدراجات والسيارات) ينطلق بسرعة كبيرة

**[1]score** /skɔː(r)/ *n* [C] ١. برین، رووشان، نیشانەی ژماردن و ئامار ٢. تۆمارگای ژماردن و ئامار، لیستی قەرز
١. جرح، حز، خدش، علامة للعد او الاحصاء ٢. سجل للعد او الاحصاء، سجل الديون

*run up a ~* ئەکەوێتە ژێر باری قەرزەوە
يغرق في الديون

*pay off/wipe off/settle/old ~ s* تۆڵەی کۆن دەسێنێ، تۆڵەی خۆی دەکاتەوە ٣. تۆمارگای گۆڵەکان (لە یاریدا)
(مجاز) يأخذ بثأر قديم، يثأر لنفسه ٣. سجل الاهداف (في مباراة)

*on that ~* لەم لایەوە، لەم بارەیەوە ٤. نیشانە دەپشکنێت، ناميلكە، نوتە
من هذه الناحية، بهذا الصدد ٤. كراسة النوتة

□ *vt, vi* ١. ئەیژمێرێ، راستیدەکاتەوە، نیشانەیەکی تایبەتی بۆ دائەنێ
١. يحسب او يصحح بوضع علامات خاصة

*a composition ~ d with corrections in red ink.*
دارشتنێك کە راستکراوەکانی بە مەرەکەبی سوور دیاریکرابێت ٢. گۆڵەکان تۆمار ئەکات (لەتوێین)
موضوع انشاء يمتلىء بعلامات التصحيح بالحبر الاحمر ٢. يسجل الاصابات او الاهداف (في مباراة)

*~ a goal* ٣. تۆماری ئەکات (گۆڵ)
٣. يسجل اصابة او هدفاً

*~ off sb* ٤. سەرکەوتن بەدەست دێنێ، زاڵدەبێ بەسەر نەیارەکەیدا ٥. نۆتەی مۆسیقی ئامادەدەکا
يحرز نجاحاً، يتفوق على منافس ٥. يعد النوتة الموسيقية

**scorer** *n* [C] خاڵ نووس، گۆڵنووس، تۆمارکەری پێکان (لە پێشبرکێ وەرزشییەکان)
(بخاصة) مسجل الاصابات (في مباراة رياضية)

**[2]score** /skɔː(r)/ *n* بیست، کۆمەڵێك لە بیست
عشرون، مجموعة من عشرين

**scorn** /skɔːn/ *n* [U] ١. ریسواکردن، ترۆکردن، قسەپێوتن ٢. تەڤز، جێگەی ریسواکردنو جنێوپێدان
١. إحتقار، ازدراء ٢. موضع الاحتقار او الازدراء

□ *vt* ١. گاڵتەی پێئەکات
١. يحتقر، يزدري:

*We ~ liars.* ئێمە درۆزن ریسوا ئەکەین ٢. خۆی ئەدۆزێنێ ئەگەر ئەوکارە بکا
اننا نحتقر الكذابين ٢. يربأ بنفسه (ان يفعل كذا)

**scornful** *adj* ترۆ، ریسوا، تەڤزدار
محتقر، مستخف، هازىء

**scornfully** *adv* بە ریسوایی
باحتقار، بازدراء

**scorpion** /ˈskɔːpɪən/ *n* [C] دووپشك، مێرووی ژەهراویە
العقرب، حشرة سامة

**Scotch** /skɒtʃ/ *n* [U] وسکی سکۆتلەندی
وسكي اسكتلندي

**scotfree** /ˌskɒt-ˈfriː/ *adj* دەربازئەبێ، بێئازار ئەروات
ينجو (يهرب) دون ان يصاب بأذى

*go/get off/escape ~*

**Scottish** /ˈskɒtɪʃ/ *adj* سکۆتلەندەیی
اسكتلندي (ا.ق. *Scotch* =)

**scoundrel** /ˈskaʊndrəl/ *n* [C] گاریس، روورەش، سووك، چەپەڵ، دز
وغد نذل، نصاب

**[1]scour** /ˈskaʊə(r)/ *vt, vi* ١. هەڵیئەگلۆفێ، پاکی دەکاتەوە، قەد مشت ٢. لای ئەبات (ژەنگ) بە کراندن
١. يفرك، يجلو، ينظف، يدعك ٢. يزيل، (الصدأ مثلاً) بالفرك

□ *n* هەڵگلۆفین، هەڵشێلان
فرك، جلي، دعك

**[2]scour** *vt, vi* دەسورێتەوە، ئەگەرێ بەدوای (شت یا مرۆڤ)
يرود، يطوف بحثاً عن (شيء، شخص)

*~ ing the woods for a lost child* ١. لەدارستانەکەدا بە شوێن منداڵە وون بووەکەدا ئەگەرێ
١. يطوف في الغابة بحثاً عن طفل مفقود

**scourge** /skɜːdʒ/ *n* قامچی، کارەسات، تاژانگ

(ا.ق) سوط، كرباج (مجاز) كارثة، نقمة، وباء

پێستی لێ‌ئەكاتەوە، سزای ئەدات، جەڵدەی لێ ئەدات □ *vt*

يجلد، يعذب

[1]**scout** /skaʊt/ *n* [C] ۱. دیدەوان، گەڕیدە، ووردبین، چوست، پێشڕەو، دیدەڤان، ڕێبەر (دیدەوانی جموجوڵی دوژمنان)

۱. رائد، مستكشف، مستطلع (لتحركات الأعداء)

*S~* ۲. دۆزەر، دیدەوان

۲. كشاف

□ *vi* دیدەوانی دەكا، تێی دەرزانێ گەشت دەكات

يستكشف، يستطلع، يقوم بجولة استكشافية

*~ about/round for* ئەگەڕێ بەدوایدا كەسانی (دواكراو، ئەكتەری نوێی سینەما)، زێرەڤانی دكت

يطوف باحثاً عن (المطلوبين، وجوه جديدة للسينما)

[2]**scout** /skaʊt/ *vt* بەكەمی دادەنێ، قسەی پێ ئەڵێ

يستخف بـ، يزدري

**scowl** /skaʊl/ *vi* ڕووگرژدەكات، مۆن دەبێ

يعبس، يكشر

*n* [C] مۆن، ڕووگرژی

عبوس، وجوم، تكشير

**scraggy** /ˈskrægɪ/ *adj* (-ier, -iest) لەش‌لاواز، ئێسك دەرپەڕیو

نحيف، ناتيء العظام

**scramble** /ˈskræmbl/ *vi, vt* ۱. پیاسەرئەكەوێ، سكەخشێ‌ئەكا

۱. يتسلق، يزحف

*~ (up, over, along, into)* سكەخشێ‌ئەكا

يزحف

*~ up a cliff* بەسەر بەردە لێژەكەداسەرئەكەوێ

۲. پاڵەپەستۆ(بەشان) ۳. هێلكەو ڕۆن ئەكات سپێنەو زەردێنە تێكەڵ ئەكات

يتسلق منحدراً صخرياً ۲. يتدافع بالمناكب ۳. يقلي البيض مازجاً الصفار بالبياض

□ *n* [C] ۱. سەركەوتن، هەڵبەزین، خلیسكان لە سەر زەوی خلیسك ۲. پاڵدان (بە ملان) كوم دكت یا بە دەست دكەڤت

۱. تسلق، زحف فوق ارض وعرة ۲. تدافع بالمناكب، تزاحم

**scrap** /skræp/ *n* [C] ۱. سەرە پارچە، پارچەی بچووك (شتێ كەبەكاربهێنرێتەوە) ۲. پاشماوە، سكراپ

۱. قصاصة، قطعة صغيرة ۲. فضلة، نفاية، خردة:

**scrap-iron** *n* [U] وورده ئاسن

حديد خردة

**scrap-book** *n* تۆمارگەی سەر هەواڵی گۆڤارەكان

دفتر او كشكول تلصق به قصاصات (الصحف مثلاً)، سجل القصاصات

**scrap-heap** *n* جێگای فڕێدانی پاشماوە كانزاییەكان، خاشاك

ركام من المعادن المهملة، مكان تلقى فيه الفضلات

**scrappy** *adj* ئاوێتە یاپێكهاتوو لەچەند پارچەی ناچونیەك، ناتەواو یان نەبەستراو

مركب او مكون من قطع (غيرمتجانسة، غير كامل او مترابط)

□ *vt* (-pp-) فڕێی ئەدات بۆ ڕزگاربوون لێی

يرمي او يلقي بشيء تخلصاً منه

**scrape** /skreɪp/ *vt, vi* ۱. دەخورێنێ، ئەڕوشێنێ

۱. يكشط، يحك

*~ paint off the door* بۆیاخی دەرگاكە لائەبا ۲. پیس ئەبێ یا تێك ئەچێ بە ڕووشاندن ۳. بە نارەحەت ڕەنگەی خۆی ئەكاتەوە

يكشط الطلاء عن الباب ۲. يفسد او يخرب بالكشط ۳. يشق طريقة بصعوبة

*~ through an examination* بە گرانی لە ئەزموندا دەرئەچێ ٤. كۆی ئەكاتەوە بە نارەحەتی

ينجح بالكاد ٤. يجمع، يلملم بصعوبة:

*~ up enough money to pay the rent* (دوای هیلاكی) ئەوەندەی پارە كۆدەكاتەوە كە بەشی كرێكەی بكات ٥. ئەیخورێنێ، هەڵی ئەگلۆفێ بەشتی زبر ٦. هەڵی ئەكەنێ، كونی ئەكا بەخوراندن

يجمع (بعد عناء) ما يكفي من المال لدفع الايجار ٥. يفرك او يحك بجبله ٦. يحفر، ينقب بواسطة الحك

*~ (out) a hole in the sand* لەناو خۆڵدا چاڵ هەڵئەكەنێ بە گەڕان

ينقب حفرة في الرمال

□ *n* [C] ۱. دەنگی ڕنین یان ڕووشاندن ۲. شوێنی كرێنراو ۳. تەنگانە، تێوەگلان

۱. صوت الكشط او الحك، صرير، صريف ۲. موضع مكشوط

۳. مأزق، ورطة

*a boy who is always getting into ~ s* لاو هەمیشە خۆی توشی گۆیەن ئەکا بەهۆی (ساویلکەیی)یەوە

صبي يورط نفسه دوما في المتاعب (بحماقته)

**scraper** *n* [C] رەنەك، رنە

مكشطة، مقشط

**scratch** /skrætʃ/ *vt, vi* ۱. ئەیروشێنێ، بەنینوك کیرەکیرەدەکا، ئەشکێنێ یا برینداری ئەکات بەروشاندن

۱. يخدش، يخمش (بالاظافر) يكسر او يجرح بالخدش:

*~ the paint on a door* روشاویەك لەبۆیەی دەرگاکە ئەکا

يحدث خدشاً في طلاء الباب

*~ out a word* ووشەیەك دەسرێتەوە یان لای ئەبات ۲. هەڵیئەکەنێ ۳. پێستی ئەروشێنێ

يكشط كلمة او يشطبها ۲. يحفر ۳. يهرش

*~ one's head* سەری ئەخورێنێ بە نینۆك ٤. بەپەلە وبێ ئاگا شت ئەنووسێ ٥. ئەیخورێنێ بە دەنگی زبر، خشەخش دروستدەکا

يحك رأسه بالاظافر ٤. يخربش، يكتب بعجلة واهمال ٥. يحك بصوت خشن، يصدر صريرا

*This pen ~ es.* ئەم قەڵەمە (لەنوسیندا) جیرەجیر ئەکات ٦. یاری‌کەرێك دەردێنێ / وازدێنێ لە پێشبرکێیەك

هذا القلم يصدر صريراً (عند الكتابة) ٦. يسحب متسابقاً / ينسحب من سباق

□ *n* [C] ۱. رووشان، چرنوك

۱. خدش، خمش:

*escape without a ~* دەرباز ئەبێ بێئەوەی زیانی پێبگات ۲. رووشان، نوسینی تێکەڵوپێکەڵ ۳. خاڵی دەربرین،دەرچوون

ينجو دون أن يصاب بأذى ۲. خدش، خربشة ۳. نقطة الانطلاق:

*start from ~* لە سفرەوە دەست پێ‌ئەکات

يبدأ من الصفر

*come up to ~* ئامادەیە بۆ ئەنجامدانی ئەوەی پێشبینی لێ‌ئەکرێ یا داوا ئەکرێ

مستعد للقيام بما هو متوقع او مطلوب منه

□ *adj* هەرچۆنێك بێ ئامادەو پێکهێنراوە، (هەرەمەکی)

معد او مكون كيفما اتفق (بصورة مرتجلة)

*a ~ team* تیپی خێرا دروست بوو بێ جیاوازی

فريق مكون بعجلة وبدون تمييز

*a ~ dinner* ژەمە نان خواردنێکی خێرا

وجبة عشاء مرتجلة

**scratchy** *adj* (-ier, -iest) (وێنەو نوسین) تێکەڵ پێکەڵ، ئەنجامدراو بەپەلەوبێ بایەخپێدان (پێنووس) جیرەجیردەکا

(الرسم، الكتابة) مخربش، منجز بعجلة واهمال، (القلم) يحدث صريراً

**scrawl** /skrɔːl/ *vi, vt* دەنوسێ یان وێنەدەکێشێ بەپەلە

يكتب او يرسم بعجلة وبدون عناية

□ *n* [C] نوسینی نارێك و بە پەلە

شخبطة، شيء مشخبط أو مخربش

**scream** /skriːm/ *vi, vt* ۱. هاوار دەکات، دەنەرێنێ، ئەقیرێنێ، بەشێوازی دەدوێ

۱. يصرخ، يصيح، يتكلم على نحو هستيري

*~ with laughter* بە دەنگی بەرز پێئەکەنێ ۲. با(ئەلورێنێ)، (ئامێر)، جیرەجیرئەکات

يضحك بصوت عال ۲. (الريح) تعول، (الآلات) تصدر ضجة حادة

□ *n* [C] دەنگ، هاوار، قیژە

صيحة، صرخة، زعقة

*~ of laughter/pain* قاقای پێکەنین / هاواری ئازار

قهقهة عالية / صيحة ألم

**screech** /skriːtʃ/ *vi, vt* ۱. هاوار دەکات، قیژە ۲. ئەنەرێنێ لەتورەیی یان لە ئازاردا

۱. يصرخ، يطلق صرخة عالية ۲. يصرخ غاضباً او متألماً

*monkeys ~ ing in the trees* مەیمونەکان لەنێوان دارەکاندا قاوقیژ ئەکەن

قرود تصرخ بين الاشجار

□ *n* [C] هەرای زۆر، لوراندن

صراخ حاد، عويل

**screed** /skriːd/ *n* [C] نامەی درێژ وبێزارکەر گوتارا درێژ

رسالة طويلة (ومملة غالباً)

**screen** /skriːn/ *n* [C] ۱. پەردە، بەربەست

۱. ستار، حاجز، وقاء

كفاح، نضال، جهاد، مجهود ضخم

**strum** /strʌm/ *vi, vt* (-mm-) بەهەرەمەکی و کەم‌تەرخەمی مۆسیقادەژەنێ (نەشەهرەزا) یاری دکت

یعزف على نحو مرتجل او باهمال

**strung** /strʌŋ/ (بڕوانە *string*)

(انظر *string*)

**¹strut** /strʌt/ *vi* (-tt-) لەنجەولار دەکات، پۆز لێدەدات، فورت دکت

يتبختر، يختال في مشيته، يخطر

□ *n* [C] لەنجەو لارکردن

تبختر، اختيال

**²strut** /strʌt/ *n* [C] کۆڵەکەی ئەستور

دعامة، قائم انضغاطي

**stub** /stʌb/ *n* [C] بنکی (جگەرە، پێنوس)، قورمێ داری بنک، بنکی پسولە

عقب (قلم الرصاص او السيجارة)

□ *vt* (-bb-) ~ *one's toe* قاچی هەڵئەکەوێ (لەبەرد)

تصطدم قدمه (بحجر مثلاً)

**stubble** /ˈstʌbl/ *n* [U] ١. پووش، شارۆ: پاشماوەی کشتوکاڵ ٢. تەنکە ریش، رەهێن کورت

١. قش، جذامة: ما يبقى من الزرع بعد حصده ٢. لحية قصيرة خشنة (لم تحلق من ايام)

**stubborn** /ˈstʌbən/ *adj* لاسار، رکگرتی، رکەبەر، رکدار، سەر رەق

عنيد، حرون (المرض) عضال

**stubby** /ˈstʌbɪ/ *adj* (-ier, -iest) کورتەو ئەستوور

قصير وغليظ

~ *fingers* پەنجەی کورت ئەستور

اصابع قصيرة وغليظة

**stuck** /stʌk/ (بڕوانە *stick*)

(انظر *stick*)

**¹stud** /stʌd/ *n* [C] ١. قۆپچەی ملیوانی کراس ٢. مێخ: بزماری سەرخڕ بۆ جوانکردنی دەرگاه یا سەر پێڵاو دائەنرێ بۆ پارێزگاری

١. زر ياقة القميص ٢. الجويط: مسمار كبير الرأس تزين به الأبواب او يوضع في نعل الحذاء للوقاية

□ *vt* (-dd-) ~ *ded with (jewels)* ئەیرازێنێتەوە، ئوورداني دکت، بە خشڵ رازاوە

يرصع مرصع بالجواهر

**²stud** /stʌd/ *n* [C] کۆمەڵە ئەسپێك بۆ مەبەستی تایبەت بەکار بێت (پێشبرکێ یا پەروین)

مجموعة من الخيول تتخذ لغرض معين (كالسباق او الاستيلاد)

**student** /ˈstju:dnt/ *n* (*pl* ~ s) شاگرد، قوتابی (زانکۆ یا پەیمانگا)

طالب (بخاصة في جامعة او معهد)

**studio** (pl-s) *n* ١. ستۆدیۆ، وێنەگرتنگە ٢. هۆڵ بۆ وێنەگرتنی فیلمی سینەما ٣. ژووری پەخشی ستودیوی تەلەفزیون

١. الاستديو، مرسم ٢. قاعة لتصوير أفلام السينما ٣. غرفة البث الأذاعي أو التلفزيوني

**studious** /ˈstju:dɪəs/ *adj* ١. کۆششکەر، بزاڵکار، خوێندکار

١. مجد، مجتهد، مولع بالدراسة

**study** /ˈstʌdɪ/ *vt, vi* (*pt, pp* -died) دەخوێنێ، فێردەبێ، دەپشکنێ

يدرس، يتعلم، يتفحص عن

~ *ing to be an engineer* ئەندازە ئەخوێنێ (بۆ ئەوەی ببێ بە ئەندازیار)

يدرس الهندسة (ليصبح مهندساً)

~ *a map* نەخشە، سەیری نەخشە ئەکات ٢. (لە شێوگی *pp*) پشکێنراو، بە باسکراو، ئەنقەست

خريطة، ينظر في خريطة ٢. (في صيغة *pp*) مدروس، متعمد

*a studied insult* سوکایەتی تیپکردنی ئەنقەست

اهانة متعمدة

□ *n* [C] (*pl* -dies) ١. بابەت، لێکۆڵینەوە، توێژینەوە، خوێندن

١. دراسة، بحث

*make a* ~ *of history* هەڵدەسێ بە لێکۆڵینەوەی مێژوو

يقوم بدراسة التاريخ

*begin one's studies* دەست بە خوێندن ئەکات

٢. ژووری خوێندنەوە ٣. وێنەی ئامادەکاری (بۆ مەشق و ئەزموون)

يبدأ دراسته ٢. حجرة المطالعة، غرفة المكتبة في المنزل ٣. رسم اعدادي (بهدف التجربة والتمرين)

**stuff** /stʌf/ *n* [C,U] ١. مادە، کەرەستە ٢. شت،

شتی خراپ ٣. ئەتەمی خوری

١. مادة ٢. شيء، شيء رديء، سقط المتاع ٣. (أ.ق) نسيج صوفي

□ *vt* ~ *into* ١. تێ ئەخنێ

١. يحشو

~ *with* پڕی ئەكات لە

يملأ او يسد ب

~ *feathers into/a bag with feathers* توورەكە پڕ ئەكات لە پەڕ ٢. وشك و بەپەیكەری ئەكا (ئاژەڵ، باڵندە)، پێش لێنان پڕیئەكا

يحشو الريش في كيس/كيساً بالريش ٢. يحنط (حيواناً او طيراً)، يحشوه قبل طهيه

**stuffing** *n* [U] ئاخنين، مادەی پڕكردن

حشو، مادة الحشو

**stuffy** /ˈstʌfɪ/ *adj* (-ier, -iest) ١. تورە، ڕووگرژ ٢. هەوای پیس ٣. گیراو ٤. بێزار ٥. بیر تەسك

١. عاصب، متجهم الوجه ٢. مسدد في الزكام ٤. ممل ٥. ضيق الافق

پیس

(الحجرة) فاسدة الهواء

**stultify** /ˈstʌltɪfaɪ/ *vt* خرپو دكت، گاڵتەی پێدەكات، سوكایەتی پێدەكات

يسفه، يسخف، يجعل الشيء يبدو مضحكاً او تافهاً

**stumble** /ˈstʌmbl/ *vi* ١. پێهەڵەكەوێ، دتەرشت

١. يتعثر، تزل به القدم

~ *upon* ٢. ئەیدۆزێتەوە بە ڕێكەوت، توشی دەبێ ٣. زمانی دەیگرێ، دوو دڵ دەبێ

٢. يعثر على شيء صدفةً، يصادف ٣. يتلعثم، يتردد

□ *n* [C] زمان گرتن، سەرسمدان

تعثر، تردد، عثرة، زلة

**ˈstumbling-block** *n* بەربەست، گیروگرفت، كۆسپ

حجر عثرة، عائق

**stump** /stʌmp/ *n* [C] ١. كۆتەرە، گوتارگە، قورم، بنكی درەخت ٢. كۆتەرە دار: ئەوبەشەی كەماوەدوای برین ٣. (لە یاری كریكیت) یەكێ لەسێ كۆڵەكەی گۆڵ

١. قرمة، جذل: اصل الشجرة الباقي بعد قطع جذعها ٢. الجزمة، الجزء الباقي من العضو بعد القطع ٣. (في لعبة الكريكيت) احدى دعائم الهدف الثلاث

□ *vt, vi* ١. بە قورسی ڕێ ئەكات ٢. شپرزە ئەكا، سەرسام ئەبێ

١. يمشي بتثاقل ٢. (ل.د) يربك، يحير

*The question ~ ed me.* پرسیارەكە تەنگەتاوی كردم (نەمتوانی وەڵام بدەمەوە)، پەشۆكانمی ٣. (لە یاری كریكیت) تۆپ هاوێژ ئەچێتە دەرەوە بە لێدانی یەكێك لە گۆڵەكان

ان السؤال قد اربكني (عجزت عن اجابته) ٣. (في لعبة الكريكيت) يخرج ضارب الكرة من اللعب باصابة (احدى) دعائم الهدف بالكرة

**stumpy** /ˈstʌmpɪ/ *adj* (-ier, -iest) كورتە بنە، كورت و قەڵەو دەست كورت

مربوع القامة، قصير وبدين

**stun** /stʌn/ *vt* (-nn-) ١. وڕ (دەبێ)، گێژبوون، گێژدكت ٢. سەری سوردەمێنێ، دهەژێنت، بێهوشێ ئەكا

١. يفقده الصواب بخاصة بضربه على رأسه ٢. يذهل، يدهش، يصعق

~ *ned by the bad news* هەواڵی ناخۆش وریكرد

صعقته الأخبار السيئة

**stung** /stʌŋ/ (بڕوانە *sting*)

(انظر *sting*)

**stunk** /stʌŋk/ (بڕوانە *stink*)

(انظر *stink*)

[1]**stunt** /stʌnt/ *vt* ناپەڵێ گەشە بكات، ریوەڵەی ئەكات، نەساخی یا وەراری گیرو دكت

يوقف او يعوق النمو الطبيعي، يقزم

[2]**stunt** /stʌnt/ *n* [C] كاری (هەستیار)، كاری شەهرەزا یا وێرا (وەك كاری پەهلەوانی)

عمل مثير يقصد به لفت الأنظار

**stupefaction** /ˌstjuːpɪˈfækʃn/ *n* بێهوش (كردن)، سڕكردن، بەنجكردن، سەنكردن

تخدير، تخبيل، خدر، ذهول

**stupefy** /ˈstjuːpɪfaɪ/ *vt* سڕیدەكات، سڕدكت

يخدر، يخبل

*stupified with drink/amazement* گێل بوە لەسەر

خۆشی سەرسامە/ واق ورمان
مذهول من السكر/ الدهشة
**stupendous** /stju:ˈpendəs/ *adj* مەزن، تەندار، سەرسوڕهێنەر
هائل، جسيم، مدهش
**stupid** /ˈstju:pɪd/ *adj* لاژگ، گەوج، گەمژە، گەلحۆ، خرپۆ، دەبەنگ، کەللەپوت
بليد، غبي، ابله، أحمق
**stupidity** /stju:ˈpɪdətɪ/ *n* [C,U] کەرێتی، گەوجی
بلادە، غباء، سخف، حماقة
**sturdy** /ˈstɜ:dɪ/ *adj* (-ier, -iest) قایم، پتەو، جێگیر، چالاك
قوي، مفتول العضلات، ثابت، نشيط
**stupor** /ˈstu:pə(r)/ *n* [C,U] ١. بێهۆشی ٢. گێژی ٣. کەم ئاگاه، وەك بوراوە
وهول، شبيه عيبوبه، حذر ما خبل
**sturdily** *adv* بە پتەوی، بەجێگیری، بەورە
بصلابة، بثبات، بهمة
**stutter** /ˈstʌtə(r)/ *vi, vt* زمانی تێکەڵە ئەکا، زمانی دەیگرێ
يتلعثم، يتهته
[1]**sty** /staɪ/ *n* [C] (*pl* sties) پاوانا بەرازان، تەویلەی بەراز
زريبة الخنازير
[2]**sty(e)** /staɪ/ *n* [C] (*pl* sties, styes)
قنچکەسڵاو، سیچکە سڵاو، دوومەڵێلە لە سەر پێڵوی چلو دەردێ
دمل الجفن، شحاذ العين، جنجل
**style** /staɪl/ *n* ١. شێواز، شێوە، ڕێباز، جۆر
١. اسلوب، نسق، نمط
*do things in ~* ٢. مەزنی، بەزم و ڕەزم
٢. فخامة، ترف
*the latest ~ s in dress* نوێترین مۆدیلی جل و بەرگ ٣. شێوە، جۆر:
احدث الأزياء في اللباس ٣. شكل، نوع:
*made in three ~ s* دروست کراوە بە سێ شێوە
٤. نازناوی ڕاست بۆ بانگ کردن (وەك گەورەم)
مصنوع على ثلاثة اشكال ٤. اللقب الصحيح المستخدم في مخاطبة (عظيم مثلاً)
□ *vt* بانگ ئەکرێ، وای پێئەوترێ
يلقب او يدعى بكذا
*He should be d ~ Right Honourable*
پێویستە ئەو نازناوەی هەبێ خاوەن شکۆ
يجب ان يلقب ب صاحب المعالي
**stylish** *adj* تازە بابەت
انيق، حديث الطراز
**stylist** /ˈstaɪlɪst/ *n* [C] شێوازی، مۆدەیی
شخص (بخاصة كاتب) يبالغ بالاهتمام بجمال الأسلوب
**stylistic** /staɪˈlɪstɪk/ *adj* شێوازناسی، ڕێبازی، شێوازی هونەری
اسلوبي، ما يتعلق بالأسلوب الفني
**stylus** /ˈstaɪləs/ *n* دەرزی فۆتۆگراف
(بخاصة) ابرة فوتوغراف
**suave** /swɑ:v/ *adj* چاك، نازك، تەرزمان، قەنج
رقيق، دمث، مهذب
**sub-** /sʌb/ *prefix* پێشگرێکە بە مانای: لاوەکی، جێگر
بادئة معناها: نائب، فرعي، ثان، دون
*sub-committee* لیژنەیەکی لقی
لجنة فرعية
**subarachnoid** ژێر جاڵجاڵۆکەی
تحت عنكبوتيه
**subcutaneous** ژێر پێستا
تحت جلد
**subaltern** /ˈsʌbltən/ *n* ئەفسەر لەپلەی ژێر سەرۆکدا، ئەفسەری دوو ستێر
(في الجيش) ضابط تحت رتبة رئيس
**subconscious** /ˌsʌbˈkɒnʃəs/ *adj, n* بێئاگا، بێهۆش
لا شعوري، اللاشعور
**subcontinent** /ˌsʌbˈkɒntɪnənt/ *n* [C] نیمچە کیشوەر (هند)
شبه قارة (كالهند مثلاً)
**subcontract** /ˌsʌbˈkɒntrækt/ *n* بەڵێنی

لاوەکی / ژێرەبەژێر

عقد فرعی / من الباطن

**ˌsubconˈtractor** *n* [C] بەڵێندەری ناوەنجی، ژێربەڵێنکار

المتاقد الفرعی

**subdivide** /ˌsʌbdɪˈvaɪd/ *vt, vi* دیسان دابەشتەکات، بەش بەشی ئەکات

یقسم او ینقسم الی اجزاء اصغر

**subdue** /səbˈdju:/ *vt* ١. دەسەپێنێت، خۆدەگرت، دادەمرکێنێتەوە

١. یخضع، یقهر، یغلب

*a ~d light* ٢. تەپەسەر دکت، هێوری ئەکات، سوکی ئەکات

٢. یهدیء، یخفف: ضوء خافت

**subheading** /ˈsʌbhedɪŋ/ *n* [C] ناونیشانی لاوەکی (وەك لەرۆژنامەدا)

عنوان فرعی (فی صحیفة مثلاً)

**subhuman** /ˌsʌbˈhju:mən/ *adj* خوار ئاستی مرۆڤ، نیف مرۆڤ

دون البشر، اقرب الی الحیوان منه الی الإنسان

[1]**subject** *n* ١. یەکێ لەدەست وپێوەند

١. احد افراد الرعیة

*British ~s* هاونیشتمانی بەریتانی

الرعایا البریطانیون

*the ~ of an essay* ٢. بابەت: کردار، کردە

٢. موضوع: موضوع مقال

*change the ~* بابەتی وتوێژەکە دەگۆرێ

یغیر موضوع الحدیث

□ *adj* ١. ملکەچ، لایەنگر

١. خاضع، تابع

*~ races/nations* رەگەز مرۆیەکان / نەتەوە ملکەچەکان

الاجناس البشریة / الأمم الخاضعة

*~ to* ٢. ملکەچە بۆ، رازی یە بۆ

٢. خاضع ل، قابل ل

*traffic ~ to delays in bad weather* هاتووچۆ لە کەشی ناخۆشدا دوائەکەوێ

مرور او حرکة سیر عرضة للتعویق فی الطقس السیء

*~ to* ٣. (هەروەها *adv*) سەربەو، مەرجی بەبەڵێن

٣. (ایضاً *adv*) تابع ل، مشروط ب، مرهون

*~ to your approval* (فرمانەکە) پابەندە بە قایل بوونی تۆ، رەزامەندی تۆ

(الأمر) مرهون بموافقتك

[2]**subject** /səbˈdʒekt/ *vt* ١. ملکەچدەکا، دەبەزێنێ تەپەسەر دکت (نەتەوە، گەل) ٢. ئەیکاتە بابەتێك بۆ

١. یخضع، یقهر (امة، شعباً) ٢. یجعله موضوعاً ل، یعرض ل

*~ oneself/one's friends to criticism* خۆی یا یەکێ لا هاورێکانی ئەخاتە ژێر باری رەخنەگرتنەوە

یعرض نفسه / اصدقاءه للنقد

**subjection** *n* [U] ١. بەزاندن، ملکەچ کردن

١. قهر، اخضاع

*the-of the rebels* ملکەچ کردنی یاخیبوان

أخضاع للمتمردین

**subjugate** *vt* ملکەچ دەکات، دەبەزێنی

یخضع، یقهر

**subjugation** ملکەچکردن، سەر چەماندن، سەرکوت کردن

اخضاع، قهر، قمع

**sublet** /ˌsʌbˈlet/ *vt, vi* لە ژێرەوە بەکرێ دەدا، خانوو بەکرێدەدا کە خۆی تیا کرێچیە

یؤجر من الباطن، یؤجر (عقاراً) هو مستأجر له

**sublieutenant** /ˌsʌbləˈtenənt/ *n* [C] ئەفسەری یەك ئەستێرە

ملازم ثان

**sublimate** /ˈsʌblɪmeɪt/ *vt* پلەی بەرزئەبێ، باڵادبت، بڵنددکت

یصعد، یحول الی ما هو اسمی، یتسامی

**sublime** /səˈblaɪm/ *adj* رەسەن، پایەبەرز، شکۆدار، پیرۆز، سالار

سام، رفیع، مهیب، جلیل

*~ scenery* دیمەنی پڕ لەجوانی

مشاهد غایة فی الجلال والروعة

**sublingual gland** ژێر زمانە گلاند

غدە تحت اللسان

**submandibular gland** ژێر کاکیلە گلاند، رژێنی

ژێر کاکیله

غدة تحت الفك

**submarine** /ˌsʌbməˈriːn/ *n, adj* کەشتی ژێرئاو، ژێراوە (رووەك) لەژێر ئاو دەروێ، قەوزە

غواصة، (النبات) ينمو تحت البحر

**submerge** /səbˈmɜːdʒ/ ١. نوقمدەبێت، نوقمدەکرێ لە ئاودا، قەد شێرت ٢. نوقمی دبت، لەچاو وون دەبێ، ددت ناڤ ئاڤێ

١. يغطس، يغطس، يغمر بالماء ٢. تغطس (الغواصة) تحت الماء يغيب عن النظر

**submission** /səbˈmɪʃn/ *n* [C,U] ملکەچکردن، خۆبەدەستەوەدان، ملدان، دانەواندن، ژێر دەستی

خضوع، اذعان، انقياد، (شيء) مقدم، معروض، مطروح (للمناقشة)

**submissive** /səbˈmɪsɪv/ *adj* گوێڕایەڵ، پابەند، ملدایی، ملکەچ

مطيع، مذعن، منقاد

**submit** /səbˈmɪt/ *vt, vi* ١. خۆدەدات بەدەستەوە، پێشکەش دەکات، چیزدبت، رادهێت ٢. نمایش دەکات

١. يذعن ل، يستسلم، يسلم نفسه ٢. يتقدم ب، يعرض:

~ *plans to sb* پلانی بۆ دادەنێ

يعرض خططاً عليه

~ *a report* راپۆرت پێشکەش ئەکات ٣. پێشنیار ئەکات

يقدم تقريراً ٣. يقترح ان

**subnormal** /ˌsʌbˈnɔːml/ *adj* ژێر ئاسایی، خوارئاسایی

دون السوي او العادي

**subordinate** /səˈbɔːdɪnət/ *adj* پاشکۆ، گزیر دواناوەندی، کەم بایەخ، دووەمی، پەیرەو

تابع ثانوي، اقل اهمية

□ *n* [C] سەر بە، ژێردەستە، فەرمانبەر

تابع، مرؤوس

□ /səˈbɔːdɪneɪt/ *vt* ملکەچی ئەکات، ئەیکاتە یاوەر

يخضعه، يجعله تابعاً ل...

**subscribe** /səbˈskraɪb/ *vi, vt* دەبەخشێ پشتگیری دەکا، بەشداری دەکات، تۆماردەکات

يتبرع، يكتتب

~ *£ 50 to a flood relief fund* ٥٠ جنیه لەبەخشێ بە سندوقی فریاگوزاری لافاو ٢. بەشداری ئەکات، ئابوونەدەدات (لە گۆڤار یا رۆژنامە)

يتبرع او يكتتب بخمسين جنيهاً لصندوق اغاثة المتضررين من الفيضان ٢. يشترك يدفع اشتراكاً (في مجلة او صحيفة)

٣. دانپیادەنێ، رەزامەند دەبێ لەسەر، لایەنی ئەگرێ ~ *to*

٣. يقر، يوافق على، يؤيد

**subscriber** *n* هاوبەش، لایەنگر، بەشدار، ئابونەدەر

مشترك مؤيد، مكتتب

**subscription** /səbˈskrɪpʃn/ *n* بەخشین، پاربو هاوبەشیکردن، باجی بەشداربوون، ئابوونە

(بخاصة) تبرع، اشتراك (في صحيفة)، رسم الاشتراك

**subsequent** /ˈsʌbsɪkwənt/ *adj* پاشکۆ، ئەنجامی، بەدوایدا، پەندەلەسەر، پاشی، دوایی

لاحق، تال، مترتب على

**subseqently** لەوەدوا، لە پاشدا، لەئەنجامی

فيما بعد، من ثم، بالتالي

**subservient** /səbˈsɜːvɪənt/ *adj* ریسوا، مل کەچ، سەرشۆڕ

متذلل، خاضع

**subside** /səbˈsaɪd/ *vi* ١. (ئاو، لافاو) کەم دەبێت، دەگەڕێتەوە، دادەبەزێ ٢. (زەوی) دادەتەپێ، ئەنیشێ ٣. (خانوو) نوقمدەبێ لەزەویدا ٤. (رەشەبا، هەڵچوون) هێمن دەبێتەوە، هێوردەبێت

١. (الماء، الفيضان) يتراجع، ينسحب، ينخفض ٢. (الأرض) يهبط سطحها ٣. (المباني) تغور في الأرض ٤. (الرياح، الانفعالات) تهدأ، تسكن

**subsidence** /səbˈsaɪdns/ *n* [C,U] هێمنی، کەمبون، هێوربوون، داکەوتن، روخان

هدوء، سكون، همود، هبوط، انهيار

**subsidiary** /səbˈsɪdɪərɪ/ *n* (*pl* -ries) *adj* لاوەکی، لایەنگر هاریکەر، لق، کۆمپانیا (سەر بە کۆمپانیای گەورە)

ثانوي، تابع شركة تابعة (لشركة كبرى)

**subsidize** /ˈsʌbsɪdaɪz/ *vt* هاریکاری دارایی پێشکەش ئەکات، بەرتیل دکت، ژیاندن دکت

یقدم اعانة مالیة، یعین بالمال

**subsidy** /ˈsʌbsədɪ/ *n* [C] — کۆمەك دان بەپارە، کۆمەك (بەتایبەتی میری)

اعانة مالیة (بخاصة حکومیة)

*food subsidies* — کۆمەك بۆبژێوی، خواردن

اعانات غذائیة

**subsist** /səbˈsɪst/ *vi* — هەیە، بەردەوامە، ئەژی لەسەر (جۆری خواردن)

یوجد، یستمر، یعیش علی (نوع من الطعام)

**subsistence** *n* [U] — ژیان، بوون، بژێوی

عیش، وجود، رزق

*my means of ~* — ڕێگای بژێویم، ژینکاری

وسیلة کسبی للعیش

**subspecies** *n* [C] — لقاله جۆرێك (له پۆلێنی زیندەوەرزا)

فرع من نوع (فی تصنیف الأحیاء)

**substance** /ˈsʌbstəns/ *n* — ١. مادە

١. مادة

*Iron is a hard ~.* — ئاسن مادەیەکی ڕەقەو سەختە ٢. پوختەی قسە، ناوەرۆکەکەی ٣. پتەوی، یەك بوونی، سەختی ٤. پارە، سامان، موڵك

الحدید مادة صلبة ٢. جوهر الکلام، فحواه ٣. صلابة، تماسك ٤. مال، ثروة، ممتلکات

*a man of ~* — پیاوی زۆر دەوڵەمەند

رجل واسع الثراء

**substantial** /səbˈstænʃl/ *adj* — ١. پتەو، بەهێز ٢. ڕاستی، گونجاو ٣. قەبە، مەزن، زۆر، بەکەم دانانرێ

١. متین، قوی ٢. حقیقی، واقعی ٣. ضخم، وافر، لا یستهان به

*a ~ meal/improvement* — ژەمی زۆر، ژەم فرە/ چاکبوونی زۆر، بەرەو باشچوون ٤. دەوڵەمەند، زەنگین

وجبة وافرة / تحسن کبیر ٤. غنی، ثری، موسر

*in ~ agreement* — ٥. لەبارەی ناوەرۆکەوە ڕێکەوتووە

٥. علی اتفاق فیما یختص بجوهر (الموضوع)

**substantiate** /səbˈstænʃɪeɪt/ *vt* — بەڵگەی لەسەر دەدات، ڕاستی شتەکە دەسەلمێنێ

یقیم الدلیل علی، یثبت صحة شیء بالوقائع

**substitute** /ˈsʌbstɪtjuːt/ *n* — شوێن گر، بریکار، لەجیاتی، کەسێك جێگەی کەسێکی کە دابنرێ

بدیل، عوض، شخص یحل مکان آخر

□ *vt, vi* — شوێنی گۆرکێ دەکا، لەبری دادەنێ، جێگەی کەسێك یان شتێك دەگرێتەوە

یستبدل، یستعیض عن، یقوم مقام (شخص او شیء)

**substitution** /ˌsʌbstɪˈtjuːʃn/ *n* — گۆڕین، جێگرتن، لەبری دانان

ابدال، احلال، استعاضة

**subterfuge** /ˈsʌbtəfjuːdʒ/ *n* [C] — بیانو، پۆزش، بیانویەکی بێ مانا، فێڵ، گزی، بەهانە

ذریعة، عذر باطل، حیلة

**subterranean** /ˌsʌbtəˈreɪnɪən/ *adj* — لە ژێر رووی زەوی، نهێنی، شاراوە

تحت سطح الأرض، سري، خفي

**subtitle** /ˈsʌbtaɪtl/ *n* — ١. ناونیشانی لاوەکی، ناڤیشانا لقی یا (کتێبێ) ٢. پەراوێزا سینەمایی، وەرگێرانی چاپکراوی سیناریۆی فلیمێکی بیانی

١. عنوان فرعي (الكتاب) ٢. الترجمة المطبوعة لحوار فیلم اجنبي

**subtle** /ˈsʌtl/ *adj* — ١. وورد، تەنك، (کارێك) لەبەر وردی دیاریکردنی گرانبێت، شەهرەزا، کارێکی وورده، ئاڵۆز

١. دقیق، رقیق (امر) صعب التحدید لدقته، غامض

*a ~ charm/flavour* — جادووی ئاڵۆز/ تامی نەزانراو

سحر غامض / طعم یصعب تحدیده

*~ humour/smiles* — گاڵتە/ زەردەخەنەی فروفێڵ

٢. زیرەك، هەستیار، ئاقڵ، بیر تیژ

دعابة / ابتسامات ماکرة ٢. فطن، حاد الذهن، حساس، مرهف

*~ observer/critic* — چاودێر/ ڕەخنەگر هەستیار

٣. زیرەك، کارامە، روکەش کراو، ئاڵۆز:

مراقب / ناقد مرهف الحس ٣. حاذق، بارع، منمق، مصقول، معقد:

*a ~ argument* — بەڵگەی بەهێز

حجة بارعة

*a ~ design* — نەخشەی زیرەکانە، (ئاڵۆز)

تصمیم حاذق (او معقد)

**subtlety** *n* — بیر تیژی، ووردی، نازکی، لێهاتن

حدة ذهن، رقة، مراوغة، حذق

**subtract** /səbˈtrækt/ *vt* لێدەردەکات، کەم ئەکاتەوە، ژمارەیەك لەژمارەیەکی کەدەرئەکات
يطرح عدداً من آخر

**subtraction** *n* لێدەرکردن
الطرح، عملية طرح

**subtropical** /ˌsʌbˈtrɒpɪkl/ *adj* (هەرێم) نیمچە خولگەیی، ڕۆخەکی یا دەرڤەرێن
(اقليم) شبه مداري

**suburb** /ˈsʌbɜːb/ *n* [C] قەراغ، دەوروبەر، دورەبازار
ضاحية

**suburban** /səˈbɜːbən/ *adj* پەیوەندە بە دەوروبەری شارەوە
متصل او متعلق بالضواحي

**suburbia** /səˈbɜːbɪə/ *n* کەنار، قەراغ، دەوورووبەر
الضواحي

**subversive** /səbˈvɜːsɪv/ *adj* کاولکەر، تێکدەر
هدام، مخرب

**subvert** /sʌbˈvɜːt/ *vt* وێرانی دەکات، پیسی ئەکات، لەناوی ئەبا، خراپ دکت، کاڤل دکت، لادەدات
يدمر، يفسد، يطيح (بالحكومة مثلاً)

**subway** /ˈsʌbweɪ/ *n* [C] ١. ڕارەوی ژێر ڕێگا بۆ پەڕینەوەی پیادە ٢. (لە ئەمریکا) هێڵی شەمەندەفەر لەژێر زەویدا
١. ممر تحت الطريق لعبور المشاة ٢. (في امريكا) سكة حديدية / خط ترام تحت الأرض

**succeed** /səkˈsiːd/ *vi, vt* ١. سەردەکەوێ، دەباتەوە
١. ينجح، يفوز
~ *in (passing) an examination* لە ئەزموونذا دەرئەچێ ٢. ئەنجام بەدەست دێنێ، سەردەکەوێ
ينجح في امتحان ٢. يوفق، يفلح، يحقق نتيجة جيدة
*The plan ~ ed.* پلانەکە سەرکەوت
٣. پشتاوپشت دێت، بەدوایدا دێت
افلحت الخطة ٣. يخلف، يتبع
*Who ~ ed him as Prime Minister?* کێ لە دوای خۆی دێ بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران؟
من الذي خلفه في رئاسة الوزراة؟
~ *to* ٤. بۆی ئەمێنێتەوە (نازناو، سامان، موڵك)
٤. يرث (اللقب، الممتلكات)
~ *to the throne* ئەبێتە پاشا
يعتلي العرش

**success** /səkˈses/ *n* [C,U] ١. سەرکەوتن، بردنەوە هەڵکەوتن، سەرفرازی ٢. شتێك یا کەسێکی سەرکەوتوو
١. نجاح، فوز، توفيق، فلاح ٢. شيء او شخص ناجح

**successful** *adj* سەرکەوتوو، براوە
ناجح، مفلح، فائز

**succession** /səkˈseʃn/ *n* [C,U] ١. بەدوای یەکدا هاتن
١. تعاقب، تسلسل، تتابع
*the ~ of seasons* وەرز یەك بەدوای یەکدا هاتن
تعاقب الفصول
*in ~* یەك لە دوای یەك ٢. زنجیرەیەکی نەپچڕاو، شتی یەك لەدوای یەك هاتوو
بالتتابع، بالتسلسل ٢. سلسلة متوالية، اشياء متعاقبة
*a ~ of wet days* چەند ڕۆژێکی باراناوی یەك لەدوای یەك ٣. مافی فەرمانڕەوایی یان میرنشینی، مافی میراتی، ئەو کەسانەی ئەو مافەیان هەیە، میراتگر
ايام متتابعة من المطر ٣. حق الولاية او الخلافة، حق الوراثة، الاشخاص الذين يتمتعون بهذا الحق الورثة
*first in ~ to the throne* ئەو کەسەی بۆی هەیە فەرمانڕەوایی بکات دوای مردنی پاشا
ولي العهد، اول من يحق له اعتلاء العرش بعد وفاة الملك

**successive** /səkˈsesɪv/ *win five ~ games adj* بە دوای یەك هاتوو
متتالي، متتابع

**successor** /səksesə(r)/ *n* [C] بەدوایدا هاتوو، دوای ئەو، میراتگیر
خلف، وريث

**succinct** /səkˈsɪŋkt/ *adj* کورتە، کورت، کورت و پڕمانا
موجز، وجيز، مختصر ووافٍ

**succulence** /ˈsʌkjʊləns/ *n* (میوە) تەڕ، تێر

دەناسن

انه رجل اعمال ممتاز والناس ينظرون اليه على انه كذلك

**suck** /sʌk/ vt, vi ١. هەڵدەمژێ، دەمژێ، دمێژت

١. يمتص، يمص

~ the juice from an orange شەربەتی پرتەقاڵەکە ئەمژێ

يمص عصير برتقالة

~ an orange dry هەموو گوشراوی پرتەقاڵەکە هەڵمژی ٢. شیری دەداتێ، ئەیمژی

امتص كل ما في البرتقالة من عصير ٢. يرضع، يمص:

~ one's thumb/a toffee پەنجەی ئەمژێ/ حەڵوا ٣. ئاو لە زەوی هەڵئەمژێ

يمص ابهامه/ قطعة من الحلوى ٣. يمتص (الماء) من الأرض، يتشرب

plants ~ ing up moisture from the soil

رووەك شێ لە زەوی هەڵئەمژێ

نباتات تمتص الرطوبة من التربة

□ n مژین، هەڵمژین، شیردان، شیرخواردن

مص، امتصاص، رضاعة

**sucker** n ١. رەگیلە، گۆپك، نەمام لە رەگی رووەکەکەوە دەرهاتبێ ٢. مژك: کۆئەندامی مژین لەهەندێ گیانەوەردا

١. الجُذير: فرخ منبثق من جذور النبتة اومن ادنى ساقها ٢. ممص: عضو المص لدى بعض الحيوانات

**suckle** /sʌkl/ vt شوری دەداتێ

يرضع

**suckling** n [C] شیرەخۆرە، بەرشیر، (مرۆڤ یان ئاژەڵ) بەر سنگی

رضيع (انسان او حيوان)

**suction** /sʌkʃn/ n ١. هەڵمژین، مژین

١. امتصاص، مص

Some pumps and all vacuum cleaners work by ~

هەندێ پەستێنەرو هەموو گسکە کارەباییەکان بەهەڵمژین کاردەکەن ٢. پیانوسان بە خاڵیکردنی هەوا

بعض المضخات وجميع المكانس الكهربائية تعمل بالامتصاص

٢. التصاق بتفريغ الهواء (بواسطة قرص مقعر من المطاط)

□ n all of a ~ کتوپڕ، لەناکاو، لەپڕ

**sudden** /sʌdn/ adj هەندێ پەستێنەرو ... ئاو، تازە، تێر ئاڵی، تەڕوبڕ

(الفاكهة) ريانة، غضة، نضرة

**succulent** /'sʌkjulənt/ adj درەختی چرووپڕ، درەختی تێر ئاو، تەڕ، ئاڵدار

نبات لحمي (ثخين الاوراق)، نبات ريان

**succumb** /sə'kʌm/ vi سەر دائەنەوێنێ، دوای ئارەزووەکان دەکەوێ، دەمرێ

يخضع، يستسلم للأغراء، يموت، يقضي نحبه

**such** /sʌtʃ/ adj یەکەم: ١. ئاوا، وەك ئەمە، ئولو، ئەڤ، وەها، وەسا

أولاً: ١. كهذا، مثل هذا:

I havt never seen ~ heavy rain as this.

بارانی وابەهێزم نەدیوە لە ژیانما

لم ارقى حياتي مطراً شديداً كهذا

You can borrow my bicycle ~ as it is.

٢. هەرچۆنێك بێ دەتوانێ پاسکیلەکەم بخوازێت

٢. يمنك ان تستعير دراجتي على ما بها (من عيوب)

His illness is not ~ as to cause anxiety.

نەخۆشییەکەی ئەوەندە ترسناك نییە تا تووشی دڵە ڕاوکێی بکات

ليس في مرضه ما يدعو الى القلق

His rudeness was ~ that his parents were ashamed. لاساریيەکەی ئەوەندە زۆرە تا ڕادەیەك دایك و باوکی شەرمەزارن

لقد بلغت وقاحته حداً جعل ابويه يشعر ان بالخجل

Don't be in ~ a hurry! ٤. لەسەرخۆبە، پەلەمەکە!

٤. تمهل! لا تتعجل!

□ pron دووەم هەروەها، وەکو، هەروا، ئەم هتد

ثانياً كذلك، مثل، امثال، هذا، هذه، تلك... الخ

I haven't many books on that subj but I will lend you ~ as I have. ئەوەندە کتێبم نیە لەسەرئەو بابەتە بەڵام ئەوەی هەمە ئەتدەمێ بەڵام دوای بۆم بگەڕێنەرەوە

ليس لدي الكثير من الكتب التي تعالج ذلك الموضوع، ولكني سأعيرك ما لدي منها

He's a good businessman and is recognized as ~

پیاوێکی کاسبی سەرکەوتووە خەڵکی وای

فجأة، بغتة، على حين غرة

**suddenly** *adv* لە پڕ، بە کتوپڕی

فجأةً على حين غرة، بغتةً

**suds** /sʌdz/ *npl* کەفی سابون

رغوة الصابون

**sue** /sju:/ *vt, vi* (*pres part* suing, *pt, pp* sued)
شکاتی لێ ئەکات، دەیداتە دادگا

يرفع دعوى على، يقاضي:

*~ one's employer for unpaid wages* سکاڵا تۆمارئەکا دژی خاوەن کار لەبەر نەدانی موچە

يرفع دعوى على صاحب العمل لعدم دفع الأجور

*~ the enemy for peace* هیواخوازە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی، تکا ئەکات، دەپارێتەوە لە دوژمن بۆ ئاشتی

يرجو، يتوصل، يلتمس: يتوسل الى الأعداء طلباً للسلام

**suede** /sweɪd/ *n* [U] چەرمی نەرم، چەرمی لەپك تۆجزمە یان بەز، شامواپی

جلد ناعم مزابر، شمواه

**suet** /ˈsu:ɪt/ *n* [U] چەوری، پیوو

دهن، شحم

**suffer** /ˈsʌfə(r)/ *vi*, ١، دەچێژێ، هەموار دەکات، ئازاری دیت، ئازار ئەچێژێ

١. يقاسي، يعاني، يتألم

*~ from headaches* توشی سەرئێشە بووە

يعاني من الصداع

*His business ~ ed during the war.* ئیشەکەی توشی زیان بوە لەکاتی جەنگدا، زیانی لێ کەوتووە ٢. ڕێگەی ئەدات، لێیدەبورێ، بەرگەی دەگرێ

تضرر عمله اثناء الحرب ٢. يسمح، يسامح، يتحمل

*can't ~ such insolence* ناتوانێ چاو پۆشی بکات لەلاساری‌وا

لا يستطيع ان يتغاضى عن وقاحة كهذه

**sufferance** *n* [U] ڕەزامەندیەکی نابەدڵ

موافقة سلبية

*He's here on ~.* بەناچاری لێرە پێی رازیبون

قبلناه هنا على مضض

**suffering** *n* ئازار، ژانگرتن، ئێش، دەرد، ئازار، ژان تاقیکردنەوەیەکی ئازاردار

الم، (في صيغة الجمع) اوجاع، الام، تجربة مؤلمة

**suffice** *vi, vt* بەشی دەکات، دڵنیا دکت، بەس دکت

يكفي، يفي بالغرض

*Will that ~ for your needs?* ئایا ئەمە سودمەندە بۆ پێداویستی‌یەکانی تۆ؟

هل يفي هذا بحاجاتك؟

**sufficient** /səˈfɪʃnt/ *adj* بەس، تەواو، هەو، بەشکردوو

كاف، واف

**sufficiency** *n* [U] بەشکردن، بڕی تەواو

كفاية، مقدار كاف

**suffix** /ˈsʌfɪks/ *n* پاشگر، پاشبەند، پاشکۆ: پیت یان پارچەیەك زیاد بکرێت بۆ وشەیەك بەمەبەستی گۆڕینی مانا

اللاحقة: حرف او مقطع يضاف الى آخر الكلمة لتغيير معناها

**suffocate** /ˈsʌfəkeɪt/ *vt, vi* دەیخنکێنێت، بەخنکاندن ئەکوژرێ، هەست بە تەنگەنەفەسیدەکا

يخنق، يقتل خنقاً، يختنق، يشعر بالاختناق

**suffocation** /ˌsʌfəˈkeɪʃn/ *n* خنکان، خەنقین

اختناق، خنق

**suffrage** /ˈsʌfrɪdʒ/ *n* مافی دەنگدان لە هەڵبژاردندا، دەنگدان

حق الاقتراع او الانتخاب، صوت

**suffuse** /səˈfju:z/ *vt* (بە تایبەتی ڕەنگ، فرمێسك) لەسەر خۆ بڵاو دەبێ

(بخاصة الألوان، الدموع) تنتشر ببطء، تغمر، تخضب

*the evening sky ~ d with crimson* کاتێ خۆرئاوابوون ئاسمان ڕەنگی قرمزی زەردی سورباوە

السماء عند المغيب وقد تخضبت باللون القرمزي

**sugar** /ˈʃʊgə(r)/ *n* [U] شەکر، قەند

سكر

□ *vt* شەکری تێ ئەکات

يحلي، يمزج بالسكر

ˈ**sugar-beet** *n* [U] چەوەندەری شەکر

شمندر او بنجر السكر

ˈ**sugarcane** *n* [U] قامیشی شەکر

قصب السكر

**sugary** *adj* شەکری، قەندی (مۆسیقا)

هەمان نەخش بن
حلة نسائية ٢. التماس، شكوى ترفع الى حاكم او مسؤول ٣. (ايضاً ~ law) قضية، دعوى ٤. مجموعة اوراق اللعب من ذات النقش

follow ~ بۆی ئەبێ، بە قەدی ئەبێ
يحذو حذوه

□ vt ١. ئەگونجێ لە گەڵیا
١. يتلاءم، يتناسب مع

Does the climate ~ you? ئایا ئەم کەشە بۆ تۆ باشە؟ ٢. (بە تایبەتی جل وبەرگ)، لێی دێ، ئەگونجێ، بۆی ئەبێ
هل يلائمك الطقس؟ ٢. (بخاصة الملابس) تليق ب، تناسب:

That hat doesn't ~ you. ئەو شەبقەیەت لێ نایەت، بۆتنایێ
ان تلك القبعة لا تناسبك

~ sth to ٣. ئەیگونجێنێ
٣. يكيف، يجعله متلائماً مع

~ the punishment to the crime وا لە سزاکە ئەکات بگونجێ لەگەڵ تاوانەکەدا
يجعل العقوبة تتناسب مع الجريمة

be ~ ed for/to ٤. (pp) گونجاو، لەبارە، ئەبێ بۆ
٤. (pp) مناسب او ملائم ل، يصلح ل

Is he ~ ed for teaching/ to be a teacher? ئایا بۆ وانە ووتنەوە لەبارە/ ببێتە مامۆستا؟
هل يصلح للتدريس/ ان يكون مدرساً؟

**'suitcase** *n* جانتای گەشت
حقيبة سفر، شنطة سفر

**suitability** /ˌsuːtəˈbɪlətɪ/ *n* گونجاندن، لەباربوون، شتێك گونجێنێ
ملائمة، صلاحية، كون الشيء ملائماً او لائقاً

**suitable** /ˈsuːtəbl/ *adj* گونجاو، لەبار، هنکوف
مناسب، ملائم

**suitably** ساز، بەجێ، بە شێوەیەکی گونجاو
لائق على نحو مناسب او لائق

**suite** /swiːt/ *n* ١. پەراوێز، ناوئاخن ٢. دەستە، کۆمەڵێك ژوور، تاقمی ناوماڵ
١. حاشية، بطانة (الحاكم) ٢. جناح، مجموعة غرف، طقم اثاث او مفروشات:

سۆزیاری، (ووشە) هەنگوینی
سكري، شديد الحلاوة (مجاز: الموسيقى مثلاً) عاطفية، حلوة (الكلمات) معسولة

**suggest** /səˈdʒest/ *vt* ١. پێشنیار دەکات، نیشان دکت، پێشنیار دکت
١. يقترح، يعرض او يقدم للمناقشة

~ a visit to the theatre/that we should go to the theatre پێشنیاری سەردانی شانۆ ئەکات/ پێویستە سەردانی شانۆ بکەی ٢. بریتی یە لە، ئەوە ئەگەیەنێ:
يقترح زيارة للمسرح/ان نقوم بزيارة المسرح ٢. يوحي، يدل على:

The look on his face ~ ed fear. بە رواڵەتی دەم وچاوی لە ترساو ئەچێ
كانت النظرة المرتسمة على وجهه توحي بالخوف

**suggestion** *n* [C,U] ١. پێشنیار، پێشنیاز ٢. ئاماژەکردن، پاشماوەیەکی کەم
١. اقتراح ٢. ايحاء، اثر ضئيل

speaking with a ~ of a foreign accent وەك شێوازێکی بیانی دەدوێ
يتحدث بشيء من اللكنة الأجنبية

**suggestive** *adj* پێشنیازانە، بەردایی، کاریگەرە بۆ بیرکردنەوە
موحٍ مذكر ب، مثير للتفكير

a ~ remark پێشناردار، تێبینییەکی وورد
ملاحظة مثيرة للتفكير

**suicidal** /ˌsjuːɪˈsaɪdl/ *adj* خۆکوشتەنی، زیانبەخش بە بەرژەوەندی کەسێك
انتحاري، ضار بمصالح المرء

**suicide** /ˈsjuːɪsaɪd/ *n* [C,U] خۆکوشتن
انتحار

**suit** /suːt/ *n* [C] ١. قات، جل، بەدلە
١. بذلة، حلة

a ~ of armour دۆزنامە، جلی گولەبەند
درع، مجموعة الدروع

a man's ~ قاتی پیاوانە، قات، دەستە
طقم رجالي، بذلة

a woman's ~ جلی ژنانە ٢. تکا، داوا، خۆزگە، سکالا ٣. (هەروەها ~ law) کێشە ٤. کۆمەڵە کاغەزێکی یاری

| | |
|---|---|
| *a bedroom ~* | تاقمی ژووری نووستن |
| | طقم غرفة نوم |
| **suitor** *n* [C] | ١. داواکەر، داواکار ٢. خوازێنیکەر، گلیدار |
| | ١. المدعي، المتقدم بدعوى ٢. الخاطب، طالب يد المرأة |
| **suik** /sʌlk/ *vi* | دتورە دەبێ، خۆمۆر ئەکاتەوە، گرژ |
| | يعبس يظهر الأستياء بالصحت |
| **sulcus** | درز |
| | شق |
| ~~suik~~ sulk | |
| *the ~ s npl* | گرژو مۆن، گرژ کردن |
| | عبوس، تقطيب، تبويز |
| **sulky** *adj* | تۆراو، زیزبوو، مرومۆچ |
| | واجم، عابس، مبوز، ميال للعبوس، سريع الاستياء |
| **sulkily** *adv* | بە تورەیی، ب زیزی |
| | بعبوس، بتجهم، باستياء |
| **sullen** /ˈsʌlən/ *adj* | ١. تورە، رووتاڵ ٢. ئاسمانی تاریك‌و تەماوی |
| | ١. غاضب، نكد ٢. (السماء) مظلمة، قاتمة وكئيبة |
| **sully** /ˈsʌlɪ/ *vt* | لەکەدارئەبێ، تێکی دەدات، پیسینەکات |
| | يلطخ، يشوه (السمعة) |
| **sulphur** /ˈsʌlfə(r)/ *n* [U] | گۆگرد، تفتەك |
| | الكبريت |
| **sultan** /ˈsʌltən/ *n* [C] | سوڵتان، قراڵ، پادشا |
| | سلطان |
| **sultry** /ˈsʌltrɪ/ *adj* | هەوای پەنگ خواردوو |
| | (الطقس) خانق مع احتباس الهواء |
| **sum** /sʌm/ *n* | ١. کۆ، مایە، سەرجەم ٢. مایە، کۆ ٣. کێشەیەکی حسابی، حسێب کردن |
| | ١. مجموع، جملة، حاصل الجمع ٢. مبلغ من المال ٣. مسألة حسابية، حسبة |
| *in ~* | ٤. بە کورتی، کورتەی باس |
| | ٤. باختصار، خلاصة القول |
| □ *vt, vi* (-mm-) *~ up* | ١. کۆیدەکاتەوە ٢. کورتە |
| | ١. يجمع الأعداد ٢. يلخص، يجمل |
| **summarize** /ˈsʌməraɪz/ *vt* | کورتی دەکاتەوە، کورت دکت، پوختەی دەکات |
| | يلخص، يختصر، يجمل |
| **summary** /ˈsʌmərɪ/ *n* [C] | کورتی، پوختە، لەبرین |
| | ملخص، خلاصة، موجز |
| □ *adj* | کورتکراوە، خێرایێ بایەخدان بە گرنگی‌یەکان |
| | وجيز، سريع، عاجل وبدون الاهتمام بالشكليات: |
| *~ justice* | دادگای کردنی خێرا |
| | محاكمة مستعجلة |
| **summer** /ˈsʌmə(r)/ *n* [C,U] | هاوین، هاڤین |
| | الصيف |
| □ *vi ~ in, at* | هاوین بەسەر ئەبات |
| | يصطاف، يقضي الصيف (في) |
| **'summer-house** | هاوینە ماڵ کەپر، سێبەرگەیا هاڤینی لە باخچە |
| | كشك خشبي في الحديقة للاستظلال من الشمس |
| **'summertime** *n* | هاوین، وەرزی هاوین |
| | الصيف، فصل الصيف |
| **'summertime** *n* | کاتی هاوینە (بروانە *day-light saving*) |
| | نظام التوقيت الصيفي (انظر *day-light saving*) |
| **summit** /ˈsʌmɪt/ *n* [C] | لوتکە، پۆپە، تەپەل، راسەر، ناقسەر، دوچك، ئەوج |
| | ذروة، اوج، قمة |
| *the ~ of his ambition* | پۆپە یا لوتکەی ئارەزووەکانی |
| | (مجاز) ذروة طموحه |
| *summit conference/meeting n* | کۆبونەوەیەك لەسەر ئاستی باڵا، کۆنگرەی باڵای نێوان حکومەتەکان |
| | اجتماع على مستوى القمة، مؤتمر قمة أي بين رؤساء الحكومات |
| **summon** /ˈsʌmən/ *vt* | بانگیدەکات، ئەدخوازت، داوای ئامادەبوون ئەکات (بۆ دادگا بۆ نموونە)، داوای کۆبونەوە ئەکات |
| | يستدعي، يطلب الحضور (الى المحكمة مثلاً)، يدعو الى اجتماع |
| *~ Parliament* | پەرلەمان داوای کۆبونەوە ئەکات |

يدعو البرلمان الى الاتحاد

~ *up (one's courage)* غیرەت ئەیگرێ، هێز کۆئەکاتەوە

يلم (اطراف شجاعته)، يستجمع (قواه مثلاً)

**sump** /sʌmp/ *n* [C] ١. پورك، ئەستێلی زەیت لە بنکی بزوێنەری ئۆتۆمبیل، کارتیر (وەك فیتەرەکان ناوی دەبەن) ٢. زێراب، ئاوەرۆ

١. حوض الزيت فى قاع محرك السيارة، كارتير (كما يسميه الميكانيكيون) ٢. بالوعة، مصرف

**sumptuous** /ˈsʌmptʃʊəs/ *adj* گرانبەها، دەوڵەمەند، دڵفراوان

فاخر، ثمين، نفيس

*a ~ feast* بانگێشەی گرانبەها

وليمة فاخرة

**sun** /sʌn/ *n* [C] ١. خۆر، رۆژ، هەتاو ٢. تیشکی رۆژ

١. الشمس ٢. اشعة الشمس:

*have the ~ in one's eyes* تیشکی خۆر لە چاوی ئەدات

تضرب اشعة الشمس عينيه

*sitting in the ~* لە هەتاو دائەنیشێ (لە ژێر تیشکی خۆر)

يجلس في الشمس (تحت اشعة الشمس)

□ *vt* (-nn-) خۆرلێدان، خۆربردن

يتشمس، يشمس

*The cat was ~ ning itself on the path.*

پشیلەکە لە رارەوەکەدا خۆی دەدایە بەر هەتاوەکەدا

كانت القطة تتشمس فى الممر

**ˈsunblind** *n* [C] کەپر، سەر پەنجەرە، بۆسێبەر

الظلة، ما يظل النافذة من الشمس

**ˈsunburn** *n* [C,U] خۆربردن

حرق او لفحة الشمس

**ˈsundial** *n* [C] سەعاتی هەتاوی

مزولة، ساعة شمسية

**ˈsundown** *n* [U] خۆرئاوابوون

الغروب، المغيب

**ˈsunflower** *n* گوڵە بەرۆژە

(زهرة) عباد اودوار الشمس

**ˈsunlit** *adj* خۆرتیکەوتوو

مضاء بأشعة الشمس

**sunny** *adj* رۆژێکی خۆرین، هەتاوی هەڵهاتوو، شاد:

(يوم) مشمس، مشرق (مجاز) مشرق، مرح:

*her ~ smiles* زەردەخەنەی شەوقدار

ابتساماتها المشرقة

**ˈsunrise** *n* [U] رۆژ دەرکەوتن، رۆژهەڵاتن، خۆرهەڵاتن

شرق الشمس، الشروق

**ˈsunset** *n* خۆر ئاوابوون، رۆژئاوا، زەرکە تاف

غروب الشمس، المغيب، الشفق

**ˈsunshade** *n* [C] چەتر، سێبەر

شمسية، مظلة

**ˈsunshine** *n* [U] تیشکی خۆر، هەتاو

اشعة الشمس

*six hours ~* شەش کاتژمێر لە خۆری روناك

ست ساعات من الشمس المشرقة

**ˈsunspot** *n* [C] خۆرە پەڵە

بقعة شمسية، كلف الشمس

**ˈsunstroke** *n* [U] خۆربردن، گرەبردن

ضربة شمس

**sundae** /ˈsʌndeɪ/ *n* [C] مۆتا، چلورەی میوە

طبق من البوظة / الجليلاتي مع الفواكه

**Sunday** /ˈsʌndeɪ/ *n* یەکشەممە

الأحد

*~ school* قوتابخانەی یەك شەممان بۆ فێرکردنی ئایینی

مدرسة الأحد، مدرسة للتعليم الديني تفتح ابوابها يوم الأحد

**sundry** /ˈsʌndrɪ/ *adj* هەمەجۆر، تێکەڵ، چەندین

متنوع، متعدد، مختلف

*all and ~* هەمەجۆر، بێ جیاوازی

قاطبة، بلا استثناء

**sundries** *npl* هەمەجورەکان

نثريات، متفرقات

**sung** /sʌŋ/ بروانە *sing*

انظر *sing*

**sunk** /sʌŋk/ بروانە *sink*

انظر *sink*

**sunken** /'sʌŋkən/ (بەتایبەتی چاوەکان) ئەبڵەق

(بخاصة العينين) غائرتان

**super-** /'su:pə(r)/ *prefix* پێشگرێکە بە مانای:، سەربار، زۆر، لە سەرو

بادئة معناها: زائد، وافر، فوق

*~ -abundant* زۆر، زیادەڕەوی، لە حەد بەدەر

وافر، زائد، مفرط

**superannuate** /ˌsu:pər'ænjueɪt/ *vt*

خانەنشین دەکرێ

يحيل الى التقاعد او المعاش

**superannuation** *n* [U] خانەنشینکردن، موچەی خانەنشینی

احالة على التقاعد او المعاش، معاش التقاعد

**superb** /su:'bɜ:b/ *adj* گەورە، نایاب، شکۆدار

فائق، رائع، ممتاز

**supercilious** /ˌsu:pə'sɪlɪəs/ *adj* رق لێبوونەوە، سوکایەتی پێکردن و گوێنەدان بە شتێك

دال على الاحتقار او اللامبالاة، متشامخ، متعجرف

**superficial** *adj* ١. روکەش، رووی دەرەوە

١. سطحي، خارجي

*a ~ wound* سوکە برینداری ٢. بە رواڵەت

جرح سطحي ٢. ظاهري

**superficially** *adv* رووکەشیانە، بە رواڵەت

سطحياً، ظاهرياً

**superfluous** /su:'pɜ:flʊəs/ *adj* زیاد لە پێویست، سەر رێژ، سەر پلکی

زائد عن الحاجة

**superfluity** /ˌsu:pə'flʊətɪ/ *n* [C,U] (*pl* -ties) زیاد لە پێویست، سەربار

زيادة عن اللازم، فائض

**superhuman** /ˌsu:pə'hju:mən/ *adj* زوور، وزەی لەسەرو وزەی مروڤ، مرۆڤ، زەبەلاح

فوق طاقة البشر

**superimpose** /ˌsu:pərɪm'pəʊz/ *vt* وێنەی لەسەر ئەشوانەوە، لەسەر هەڤ دادنت

(يطبع) صورة فوق اخرى، (يسجل) صوتاً فوق آخر، يبسط شيئا فوق آخر

**superintend** /ˌsu:pərɪn'tend/ *vt, vi* دەگێڕێ، سەرکاری ئەکات، سەرپەرشتی ئەکات

يدير، يشرف على

**superintendent** چاودێر، سەر پەرشتیار

مراقب، مشرف، ناظر

**superior** /su:'pɪərɪə(r)/ *adj* ١. بەرز، بڵند، پایەبەرز

١. فائق، متفوق، فاخر

*~ cloth* کوتاڵ لە جۆری نایاب

قماش من نوع فاخر

*~ grades of coffee* باشترین جۆری قاوە

٢. زۆرترین ژمارە

انواع فاخرة من القهوة ٢. اكثر عدداً

*The enemy attacked with ~ forces were in ~ numbers* دوژمن هێرشی کردە سەرمان بە ژمارەیەکی زۆر زیاتر لە ئێمە

هاجمنا الأعداء بقوات تفوقنا عددا

*~ to* ٣. باشتر / نوێتر لە، ناودارتر لەوەی کاری تێ کرد

٣. افضل / ارقى من، اسمى من ان يتأثر ب

□ *n* کەسێکی ناودار لە یەکێکی تر

شخص ارفع مقاماً او اعلى سلطة من آخر

*Father S ~* ٢. گەورەی کڵێسە

٢. رئيس رهبنة او دير

**superiority** /su:ˌpɪərɪ'ɒrətɪ/ *n* [U] سەرکەوتن، بڵندی

تفوق، ترفع

**superlative** /su:'pɜ:lətɪv/ *adj* ١. لەوانی تر باشترە، باشترین، باڵاترین

١. متفوق على من سواه، الأسمى، الأفضل:

*a man of ~ wisdom* پیاوێکی سەرکەوتو بەسەر هەموو ئەیارەکانیدا لە دادگا

رجل متفوق على كل من عداه في الحكمة

*the ~ degree* ٢. لەرێزمانَدا شێوازی باڵاترین

٢. (في النحو) صيغة التفضيل العليا (مثل الأفضل والأحسن، *most foolishly* الاكثر حماقة)

**super** زوورو، باڵا، گەورە

العليا

**supermarket** /'su:pəma:kɪt/ *n* [C] گەورە
بازار، سوپەرمارکێت
السوق المركزي

**supernatural** /ˌsu:pə'næt∫rəl/ *adj* نادیاری، لەسەرو
دیاردەی سروشتی، سەرسروشت
خارق للطبيعة، ما وراء الطبيعة

**supersede** /ˌsu:pə'si:d/ *vt* شوێن دەگرێ،
جێدگرت، هەڵدەوەشێنێت
يخلف، يحل محل
*Electric light has ~ d gaslight in most towns.*
تەزوی کارەبا جێی غازی گرتۆتەوە لەزۆربەی وڵاتان
لقد حلت الكهرباء محل الغاز في معظم البلدان

**supersonic** /ˌsu:pə'sɒnɪk/ *adj* لەدەنگ خێراتر
(فرۆکە) ئەفرێت بە خێرایی دەنگ خێراتر
(السرعة) اسرع من الصوت (الطائرة) تطير بسرعة تفوق سرعة الصوت

**superstition** /ˌsu:pə'stɪ∫n/ *n* ١. پروپوچ،
ئەفسانە ٢. پێش بینی یان هەڵس و کەوت سەرئەفسانە دامەزرابێ
١. خرافة، اعتقاد بالخرافات بخاصة السحر ٢. اعتقاد او تصرف مبني على الخرافات

**superstitious** پروپوچانە، ئەفسانەیی
خرافي، مؤمن بالخرافات

**superstructure** *n* [C] قاتی سەرەوە، ژووری سەرەوە
بەشەکانی پاپۆر لەسەرەوەی رووە سەرەکییەکەی
البناء الفوقي، اجزاء السفينة فوق سطحها الرئيسي
□ /'su:pəstrʌkt∫ə(r)/

**supervise** /'su:pəvaɪz/ *vt, vi* چاودێریەکات،
سەرپەرشتیدەکا
يراقب، يشرف على، يناظر

**supervisor** *n* [C] چاودێر، سەرپەرشتیار
مراقب، مشرف

**supervision** /ˌsu:pə'vɪʒn/ *n* [U] چاودێریکردن،
سەرپەرشتیاری کردن
مراقبة، اشراف

**supper** /'sʌpə(r)/ *n* [C,U] شیو، نانی ئێوارە،
شیف، شێو
عشاء، طعام العشاء

**supplant** /sə'pla:nt/ *vt* ١. شوێنی دەگرێتەوە
١. يخلف، يحل محل
*Trams are being ~ ed by buses.* پاس شوێنی ترامی گرتۆتەوە
تحل الباصات (الآن) محل الترام
*~ a rival* ٢. شوێنی کەسێکی تر ئەگرێتەوە (بە زەبرو گزی)، شوێنی نەیارەکەی ئەگرێتەوە
٢. يحل محل شخص آخر (بالقوة او الغدر)، يحل محل خصمه

**supple** /'sʌpl/ *adj* گونجاو، نەرم، ناسك
مرن، لين، رشيق
*the ~ limbs of a child* پەلی نەرمی منداڵ
الاطراف اللينة لطفل
*a ~ mind* هۆشی تیژ بۆ بیری نوێ
(مجاز) عقل يقظ سريع الاستجابة للأفكار الجديدة

**supplement** /'sʌplɪmənt/ *n* [C] ١. سەربار، پاشکۆ، زایەدە ٢. پاشکۆی جیاواز بۆ لاپەرەیەك یان بڵاوکراوەیەك
١. ملحق، ذيل (المعجم)، اضافة ٢. ملحق منفصل لصحيفة او نشرة دورية

**supplementary** /ˌsʌplɪ'mentrɪ/ *adj* سەرباری، پاشکۆیتی، تەواوکەری
اضافي، تكميلي
*~ estimates* خەمڵاندنی تەواوکاری بۆ لەناوبردنی کەم وکوری لە خەرجی میری دا
تقديرات تكميلية لسد العجز في المصروفات الحكومية

**supply** /sə'plaɪ/ *vt* ١. دەیداتێ، ئازوقەی دەداتێ، ئازوقە دکت
١. يزود، يمون
*~ customers with food/food for the children*
پیتاك، بەکریارەکان/ منداڵەکان خواردن دەدات ٢. بەشی پێداویستی ئەکا
يزود الزبائن بالأغذية/ الأطفال بالطعام ٢. يسد حاجة، يفي بغرض:
*~ the need for more houses* پێداویستی دانیشتوان جێبەجێ ئەکا
يلبي الحاجة المتزايدة الى المساكن
□ *n* (*pl* -lies) ١. ئازوخە، پیتاك، دەستەبەرکردن،

لماذا لا تحاول مرة ثانية

٥. گریمان کەوا، پێویستە کەوا *be ~ d to*

٥. یفترض ان، من المفروض ان

تۆ یاساکان *You are ~ d to know the rules.*

دەبزانیت، وایێویستە تۆ یاساکان بزانیت

من المفروض انك تعرف القوانین

**supposing** *conj* ئەگەر، گریمان کردن

هب ان، علی فرض ان

**sopposed** *adj* گریمانی، گریمانکری

المزعوم، المتصور

*his ~ d generosity* ئەو بەخشندەییەی کە گریمانە بیێ

کرمه المزعوم

**supposedly** /sə'pəʊzɪdlɪ/ *adv* لەوانەیە، یان

گریمان

(کان) یتوقع او یفترض

**supposition** /ˌsʌpə'zɪʃn/ *n* ١. وا دانان، گریمان

١. فرض، افتراض

٢. مەزەنەکردن، گومان *based on ~*

مبنی علی الافتراض ٢. تخمین، ظن

**suppress** /sə'pres/ *vt* ١. دادەمرکێنەوە

١. یقمع، یخمد

سەرکوتی ئەکا/گیرو دکت، کپی *~ a rising*

ئەکاتەوە

یخمد/یقمع تمرداً او عصیاناً

قەدەغەی ئەکات/بازرگانی *~ the slave-trade*

کـوێلە فـرۆشتن نـاهێلێ ٢. دەیشـارێتەوە، نـهێنی دکت،

ئەدشێرت، سەرنگومی ئەکا

یمنع/یحظر تجارة العبید ٢. یخفی، یطمس، یکتم:

باوێشك/هەواڵ ئەشارێتەوە *~ a yawn/the news*

یکتم تثاؤبە/الأخبار

**suppression** /sə'preʃn/ *n* دامرکاندن،

تەپەسەرکردن

قمع، اخاد، حظر، اخفاء

**suppurate** /'sʌpjʊreɪt/ *vi* کێم دەرئەکات،

هەوڵ دیت، چڵك دەرئەدات

یتقیح، یفرز صدیداً

**supremacy** /sʊ'preməsɪ/ *n* شکۆدار،

سەرکەوتن، زاڵبوون

پێدان ٢. (لە شێوگی کۆدا) ئازوقە (سەربازی)، شت‌ومەك

١. تـموین، تـزوید، مـؤونة ٢. (فـی صـیغة الجـمع) المـؤن

(العسکریة)، ذخیرة

**support** /sə'pɔːt/ *vt* ١. پشتگیری دەکات

٢. هاوکاری ئەکات، پشت دگرت، ئاریکاری

١. یدعم، یسند ٢. یعین، یناصر، یؤید:

پشتگیری داواکاریەك دەکات، *~ a claim*

پشتیڤان

یؤید مطلباً

لایەنگیری پارتێکی *~ a political party*

رامیاری ئەکا

یناصر حزباً سیاسیاً

بەپارە هاوکاری دەستەیەکی *~ a charity*

خێرخواز ئەکات ٣. خەرجیان دەدات، خەرجی ئـەکـێشێ

(خێزان) ٤. خۆرادەگرێ، بەرگەدەگرێ

یدعم هیئة خیریة بـالمال ٣. یـعیل، یـقوم بـنفقة (الاسـرة) ٤.

یتحمل، یحتمل

لایەنگری، یارمەتی، کۆمەککردن، □ *n*

خەرجیدان، بەخێوکردن، هاریکاری، پشتڤان، پاڵپشت

تأیید، مساعدة، دعم، اعالة، معیل، مؤید، دعامة، سناد

پشتگیری، ئاریکردن، هاریکردن *in ~ of*

تأییداً او دعماً ل

**suppose** /sə'pəʊz/ *vt* ١. گریمان، وادادەنێ

١. نفترض، یفترض، یقدر

هەڵدەسەنگێنێ، *S ~ the world were flat.*

گریمان زەوی رووتەختە ٢. مەزەنەی ئەکات: واهەست ئەکا

لنفتر ان الأرض منبسطة ٢. یخمن، یظن:

تۆ بڵێی ئەو چی *What do you ~ he wanted?*

دەویست؟ ٣. وا پێویست دەکات، پێویستی پێیەتی

ماذا تظنه کان یرید؟ ٣. یستلزم، یستدعی:

دروست بوون *The creation ~ s a creator.*

پێویستی بە دروستکارە

الخلق یستلزم وجود خالق

٤. پێشنیار ئەکەم، با *S ~ we go for a swim.*

بچین بۆ مەلەکردن

٤. للاقتراح، فلنذهب للسباحة

بۆچی دووبارە *S ~ you have another try.*

هەوڵ نادەیْ

سمو، تفوق

**supreme** /su:'pri:m/ *adj* بەرز، پیرۆز، باڵا، مەزن
فائق، عال، اسمى، اعظم

*the S ~ Being* خواوەندی پیرۆز، خودا
الكائن الأسمى، الله

**supremely** *adv* بەپیرۆزانە، باڵا
على نحو سام او فائق

**surcharge** /'sɜ:tʃɑ:dʒ/ *n* سەر باج، سەرکرێ، باری گران
ضريبة اضافية

**sure** /ʃʊə(r)/ *adj* (-r, st)

*~ of ~ that* ١. دڵنیا، بێگومان
١. واثق، متأكد

*feel ~ of oneself* هەست بە دڵنیایی ئەکات لە خۆی
يشعر بالثقة في نفسه

*be ~ to come* ٢. دڵنیایە لەهاتنی
٢. آت لا محالة، آت بالتأكيد

*make ~* دڵنیا دەبێ ٣. پێگەیشتوو، باوەرپێکراو، پشتی پێ دەبەسترێ
يتأكد ٣. ناجع، موثوق، يعتمد عليه:

*a ~ remedy* چارەسەری سەرکەوتوو
علاج ناجع

*a ~ messenger* نێراوی بروا پێ کراو
رسول موثوق او معتمد

□ *adv ~ enough* بە راستی، بێ گومان
حقاً، من غير ريب

**surely** *adv* ١. بە دڵنیایی، بێ گومان ٢. بە جێگیری، بروای تەواو
١. بالتأكيد، بدون ريب ٢. بثبات، بثقة

**surety** /'ʃʊərətɪ/ *n* [C,U] دەستەبەری، باوەری، کریف دەستەبەر
كفالة، ضمانة كفيل، ضامن

*stand ~ for sb* دەستەبەری ئەکات لە بانکدا
يضمنه او يكفله (لدى البنك مثلاً)

**surf** /sɜ:f/ *n* [U] شەپۆلی دەریایی لەسەر کەنار کوژاوە
(زبد) الأمواج المتكسرة على الشاطىء

**surface** /'sɜ:fɪs/ *n* ١. روو، سەر ناف دکەفت ٢. رواڵەت، رووی دەرەوە
١. سطح، وجه، سطح السائل او اعلاه ٢. مظهر، المظهر الخارجي

□ *vi* سەر ئاو دەکەوێ
(الغواصة) تصعد الى السطح

**surfeit** /'sɜ:fɪt/ *n* زۆر خۆری، تێرخواردن
افراط، اشباع، تخمة

□ *vt ~ (oneself on)* زۆرخۆری دەکات، تێری، زۆر خواردن تا ئێتەڵا کردن
يتخم، يشبع حتى التخمة (من)

**surge** /sɜ:dʒ/ *vi* دەردەپەرێ، دشلقت
يندفع او يندفق كالسيل

*The floods ~ d over the valley.* شەپۆلی ئاو بەسەر دۆڵەکەدا هەڵئەقوڵێ
تدفقت السيول فوق الوادي

*The crowds ~ d out of the railway station.* قەرەباڵغی یەکە لەویستگەی رێگای ئاسن هاتەدەرەوە
اندفعت الجموع خارجة من محطة السكة الحديد

□ *n* [C] هەڵچوونی دەریا، شەپۆل لێدان
جيشان (البحر)، تلاطم (الأمواج)

*the ~ of the ocean* هەڵچوونی (زەویا) ئۆقیانووس
جيشان المحيط

*a ~ of onger* ئەوپەری تووڕە بوون
(مجاز) فورة غضب

**surgeon** /'sɜ:dʒən/ پزیشکی نەشتەرگەر، برینکار، برین ساز
طبيب جراح، الجراح

**surgery** /'sɜ:dʒərɪ/ *n* ١. برینکاری، نۆژداری، نەشتەرگەری، نوژداری ٢. ژووری نەشتەرگەری برینکاری
١. جراحة، عملية جراحية ٢. حجرة العمليات الجراحية، عيادة الجراحة

**surgical** /'sɜ:dʒɪkl/ *adj* نەشتەری، نوژداری
جراحي

**surly** /'sɜ:lɪ/ *adj* (-ier, -iest) ووشك، مۆن، گرژ
فظ، سيء الخلق

**surliness** *n* [U] ووشکی، مۆن، خراپ
فظاظة، سوء خلق

**surmise** /sə'maɪz/ *vt, vi, n* وادەزانێ، مەزەنەدەکا، دەیخەمڵێنێ، گومان، مەزەنەکردن، خەملاندن
يظن، يحدس، يخمن، ظن، حدس، تخمين

**surmount** /sə'maʊnt/ *vt* ١. زاڵدەبێ بەسەر (گیروگرفت)، (کۆسپ) لادەدات، سەردکەفت
١. يتغلب على (المصاعب)، يزيل (العراقيل)
*be ~ ed by/with* ٢. لەو بەرزتردەبێت، لەسەرویەوە
٢. يعلوه

**surname** /'sɜːneɪm/ *n* ناوی خێزان، نازناو، سەرناف، بەرناف
كنية، لقب، اسم الأسرة

**surpass** /sə'pɑːs/ *vt* دەبیەزێنێ، سەردەکەوێ، سەر دکەفت
يبز، يتفوق على، يتجاوز، يفوق

**surplice** /'sɜːplɪs/ *n* زریپۆش، کراسەك ئولداری سپی جل و بەرگی زەیوانی
المدرعة، رداء كهنوتي ابيض اللون

**surplus** /'sɜːpləs/ *n* زیاد لە سامان یا شتی تر (بەراورد لەگەڵ *deficit* پەك کەوتن
الفائض (من المال مثلاً) (قارن *deficit* عجز)

**surprise** /sə'praɪz/ *n* [C,U] ١. سەرسامبون، حەپەسان، کتوپر، کرپ، کتوپری
١. مفاجأة مباغتة
□ *vt* تووشبوونی لەپڕ، سەرسامی دەکات
٢. لەپڕ هەڵئەکوتێتە سەر دوژمن
يفاجيء، يدهش، يذهل ٢. يباغت، يأخذ (العدو) على حين غرة

**surprising** *adj* سەرسورهێنەر، سەرسام سەرداگرتی، راهێژاندی
مدهش، مذهل

**surrender** /sə'rendə(r)/ *vt, vi* ١. خۆبەدەستەوەدەدا بۆ (دوژمن، پۆلیس) ٢. بۆی بەجێ دێڵێ، وازی لێدێنێ
١. يستسلم (للعدو، للبوليس) ٢. يتنازل او يتخلى عن
*~ oneself to* ٣. ملکەچدەبێ، خۆی دەدات بە دەست، سەرکردەیی دەدات بە
٣. يخضع، يستسلم ل، يسلم قيادة ل
□ *n* [C] دەستی لێهەڵگرتن، بەدەستەوەدان، مڵ کەچ کردن، کرنوش بردن
تنازل عن، استسلام، خضوع

**surreptitious** /ˌsʌrəp'tɪʃəs/ *adj* نهێنی، ئەشارتی، تەلینی
سري، مختلس
*a ~ glance/smile* تێڕوانین / پێکەنینی لەژێر لێوەوە
نظرة / ابتسامة مختلسة

**surround** *vt* دەورەی دەدات، دوورگرتن، دەورەدان
يحيط او يحف ب، يطوق

**surroundings** *npl* ژینگەی دەوروبەر دەورەدان، ژینگە
البيئة المحيطة محيط، بيئة
*living in pleasant ~ s* لە ژینگەیەکی خۆش ئەژی
يعيش في بيئة ممتعة / سارة

**surtax** /'sɜːtæks/ *n* باجی زیادە بۆ موڵکی زۆر
ضريبة اضافية على الايرادات العالية

**survey**[1] /sə'veɪ/ *vt* ١. دەپشکنێ، چاو پیانەخشێنێ ٢. مەزەنەی ئەکات
١. يعاين، يلقي نظرة عامة ٢. يقدر، يقيم، يقوم
*~ the international situation* باروودۆخی دەوڵەتان ئەخاتە روو ٣. زەوی ئەپێوێ
يستعرض الاوضاع الدولية ٣. يمسح (الأراضي)

**surveyor** *n* [C] زەوی پێو
المساح، مساح الأراضي

**survey**[2] /'sɜːveɪ/ *n* [C] ١. تێروانینی گشتی
٢. رووپێوانی زەوی، نەخشەی پێوانەکردن
١. نظرة عامة ٢. مسح الأراضي، مخطط او خريطة المسح

**survive** /sə'vaɪv/ *vt, vi* بە زیندووی ئەمێنێ پاش کۆستکەوتن یا مردنی کەسێك، بەزیندوی ئەمێنێ دوای روودانی کارەسات رزگاری ئەبێ لە
يبقى حياً بعد زوال شيء او وفاة شخص يبقى حياً بعد (حصول شيء)، ينجو من
*those who ~ d the earthquake* رزگاربوانی

بومەلەرزە

التاجون من الزلزال

**survival** /sə'vaɪvl/ *n* ١. مانەوە، مانەوەی مرۆڤێك یا شتێك پاش لەناوچوونی ئەوانیتر ٢. (كەسێك، خورەوشت، بیرو را) پاشماوەی كۆن

١. البقاء، بقاء المرء او الشيء بعد زوال غيره ٢. (شخص، عادة، اعتقاد) من رواسب الماضي

**survivor** *n* ئەوەی بەزیندویی دەمێنێ پاش كارەساتێك، رزگاربوو

من يبقى حياً بعد كارثة، ناج

*the ~ s of a shipwreck* ئەوانەی لە ژیاندا ماون دوای نقوم بوونی كەشتی

الباقون على قيد الحياة بعد غرق السفينة

**susceptible** /sə'septəbl/ *adj* زوو كارتێكراو بە، شایستەیێ بە

سريع التأثر ب، قابل ل

*a girl with a ~ nature* كچێكی هەستیار

فتاة حساسة

*~ to* زوو كارتێكراو

سريع التأثر ب

*~ to flattery/pain* زوو كارتێكراو بەپیاهەڵدان، رۆپایی/ئازار

(عرضة ل) سريع التأثر بالإطراء/بالألم

*~ of (proof)* ٢. لەباره بۆ لە (سەلماندن)

٣. قابل ل (الإثبات)

**susceptibility** /səˌseptə'bɪlətɪ/ *n* هەستیاری، كارتێكران، هۆكاری هەستیاری

حساسية، في (صيغة الجمع) حساسيات، امور مثيرة للحساسيات

[1]**suspect** /sə'pekt/ *vt* ١. وادادەنێ، هزر دكت، وای حسێدەكا

١. يتوقع، يحسب

*He ~ ed that the enemy were hiding among the tress.* وادادەنێ دوژمن خۆی شاردبێتەوە لە پشت درەختەكانەوە

يتوقع ان يكون الأعداء مختبئين وراء الأشجار

*He ~ ed an ambush* گومانئەكات كە كەمێنی هەبێ ٢. گومانئەكات

يرتاب في وجود كمين ٢. يشك، يرتاب:

*~ the truth of an account* گومانی هەیە لە راستی قسەكە ٣. گومان لێكراو لە:

يشك في صحة الرواية ٣. يشتبه في:

*~ ed of telling lies* گومانی لێئەكرێ كە درۆ بكات

مشتبه في انه يكذب

[2]**suspect** *n* [C] گومان لێكراو

مشبوه، مشتبه في امره

□ *adj* بەرگومان، گومانكری گومانلێكراو

(خبرية) مرتاب او مشتبه في امره، مشكوك فيه

**suspend** /sə'spend/ *vt* ١. هەڵدەواسرێ، شۆردەبێتەوە، یا گیرو دكت

١. يعلق، يدلي

*a lamp ~ ed from the ceiling* چرای هەڵواسراو بە بنمیچدا

مصباح متدل من السقف

*be ~ ed* ٢. هەڵواسراو (لە هەوا، لە شلە)

٢. معلق (في الهواء، في سائل)

*dust/smoke ~ ed in the still air* تۆز/دوكەڵ لە هەوای وەستاودایە ٣. دەوەستێنێ

غبار/دخان معلق في الهواء الساكن ٣. يوقف

*~ payment* بەخشین رادەگرێت ٤. رادەگرێ، گیرودكت، گیرۆدەئەبێ، بەهەڵواسراوی ئەمێنێتەوە، لەكار ئەوەستێ یا پێیەش ئەبێ لە كاركردن ماوەیەك ٥. دوائەخا

يوقف الدفع ٤. يعلق، يوقف عن العمل او يحرم من التمتع بالامتيازات مؤقتاً ٥. يرجيء، يؤجل:

*~ judgement* بریاردان یان جێبەجێ كردنی سزایەك دوادەخا

يرجيء اصدار الحكم او تنفيذة

**suspender** *n* هەڵگرەی گۆرەوی یا شەرواڵ، هەڵۆستۆك

حمالة الجوراب او البنطال

**suspense** /sə'spens/ *n* سەرسامی، شپرزەیی

حيرة قلق

*keep sb in ~* بەسەرسامی بەجێی دێڵێت

يتركه في حيرة من امره

**suspension** /sə'spenʃn/ *n* هەڵواسین،

هەڵواسراو، دالقاندن، داهێلان
تعليق، معلق
~ bridge پردی هەڵواسراو
جسر معلق
**suspicion** /sə'spɪʃn/ *n* ١. گومان، گومانکردن
١. شك، اشتباه، شبه، ريبة
*above ~* کەس گومانی لێ ناکا ٢. تۆسقاڵێك، پاشماوە
فوق الشبهات ٢. مسحة، اثر ضئيل من
**suspicious** /sə'spɪʃəs/ *adj* گوماناوی، گومانخواز، گوماندار
مريب، مثير للشك
**sustain** /sə'steɪn/ *vt* ١. بەهێزدەکات، پشت دگرت ٢. ژیاندن دکت، دەیهێڵێتەوە
١. يحمل، يتحمل ٢. يقيم الأود، يقوى:
*~ ing food* باربۆینەکات
طعام يقيم اود الحياة
*~ an argument/an attempt* یارمەتیدەدات بەڵگە/ هەوڵ ٣. تووشی ئەبێ بە
يدعم، يسند: يدعم حجة / محاولة ٣. يتكبد، يصاب ب:
*~ a loss/defeat* تووشی زیان ئەبێ / شکستی
٤. (لە یاسا) دانپیادەنێ، پشتگیری ئەکا، رەزامەند دەبێ لەسەر
يتكبد خسارة / هزيمة ٤. (في القانون) يقر، يؤيد، يوافق على
**sustained** *adj* بەدوای یەك، بەردەوام، یەکبین، دەریاڵە
متواصل، مستمر
**sustenance** /'sʌstɪnəns/ *n* نمەك، نانداری، خواردن، بژێو، پشتگیری، بژێوی
قوت، رزق، معيشة
**swab** /swɒb/ *n* زەوی سر، پارچە نیسفەنج یا لۆکە بەکاردێ بۆ مەبەستی پزیشکی
مسحة للأرض، قطعة من الاسفنج او القطن تستخدم في الأغراض الطبية
□ *vt* (-bb-) پاکی ئەکاتەوە بە زەوی‌سر
ينظف بمسحة، يمتص (السائل) بالمسحة
**swagger** /'swægə(r)/ *vi* لەنجە دەکات، فیز دکت، خۆی دەردەخات
يخطر في مشيته، يتبختر
[1]**swallow** /'swɒləʊ/ *vt, vi* ١. قوتیدەدا، قوتدەدرێ
١. يبلع، يبتلع، يزدرد
*~ one's lunch* خواردن بەهەڵپە دەخوات
يلتهم غداءه
*earnings that were ~ ed up by doctor's bills* دەخوات، ٢. بەهەڵپە بەکاریدێنێ، داهاتێك کەهەمووی بدرێ بەدەرمان و پزیشك
٢. يلتهم، يستهلك: ايرادات التهمتها فواتير الطبيب
*~ a story* ٣. چیرۆکێك پەسەندەکا بێ بەرهەڵستی یان لەنەزانی
٣. يقبل قصة دون اعتراض او بسذاجة
*~ an insult* لە سووکایەتی چاوپۆشی ئەکات
يبتلع الاهانة
*~ one's anger* توورەیەکەی ئەشارێتەوە
يكتم غيظه
*~ one's words* پاشگەز ئەبێتەوە لە قسەکەی
يتراجع عن قوله، يسحب كلامه (معتذراً)
□ *n* [C] قوتدان، پشت گوێ خستن
ابتلاع، ازدراد، بلع
[2]**swallow** *n* [C] پەرەسێلکە، زیقاوە
طائر الخطاف، السنونو
**swam** /swæm/ (بروانە *swim*)
(انظر *swim*)
**swamp** /swɒmp/ *n* [C,U] زۆلکاو، زەوی بێ‌کەڵك
مستنقع، ارض سبخة
□ *vt* ١. نقوم دەکا بەئاو، ئەخنکێ ٢. دەخنکێ، نقوم دەبێ
١. يغمر بالماء، يغرق ٢. (مجاز) يغرق
*~ with work* سەرقاڵی ئیش وکارە
ينهال: يغرق في العمل
*~ with orders for goods* داواکاری بۆ کڕینی دەبارێتە سەری
(المؤسسة التجارية) تنهال عليها طلبات الشراء
**swampy** *adj* زەلکاوی، بێ‌کەڵك
مستنقعي، سبخ
**swan** /swɒn/ *n* [C] قازی عێراقی، وەردەك

سەقاکری
(في التعبيرات المركبة) ذو خلق او مزاج معين:
a bad - ~ / good - ~ / sweet - ~ child منالێکی خراپ / باش / خۆشدو / ڕۆخۆش
طفل سيء / حسن الطبع / لطيف المعشر

**temperament** /temprəmənt/ *n* [C,U] هەوەس، هەڵس وکەوت خو، ڕەوشت، ماد، چوله
مزاج، طبع / سجية
*a girl with a nervous / an artistic ~* کچێکی توڕەوودەمارگیر / هونەرمەند، ئارتیستیك
فتاة عصبية الطبع / ذات ميول فنية

**temperamental** /ˌtemprəˈmentl/ *adj* ١. زوو توڕە، حولحولی، ناجێگیر، مادتوڵ، ئەنرۆك
١. مزاجي، متعلق بالمزاج:
*a boy with a ~ dislike of study* کوڕێك بە تەبیعەت ڕقی لەخوێندن بێت ٢. نالەبار، زووهەڵچوو، ئەنەرۆك
ولد كاره للدراسة بطبعه ٢. متقلب، سريع الاهتياج

**temperance** /tempərəns/ *n* [U] مام ناوەندی، هیوادارین خۆراگرتن، خۆگرتن، دانبە خۆداگرتن
اعتدال، عفة، ضبط النفس (بخاصة عن تعاطي الخمر)

**temperate** /tempərət/ *adj* ١. مام ناوەندی، نائین، هەڤسان، هەدار ٢. (کەش) خۆش (وولاتی فێنك)
١. معتدل، عفيف ٢. (المناخ) معتدل، (البلاد معتدلة المناخ)

**temperature** /temprətʃə(r)/ *n* [C,U] پلەی گەرمی
پلەی گەرمی ئەپێوێ (بەگەرمی پێو)
درجة الحرارة يقيس درجة حرارته (بالترمومتر)
*have a ~* پلەی گەرمی نەخۆشەکە بەرزە
(المريض) عنده درجة حرارة عالية

**tempest** /tempɪst/ *n* [C] ڕەشەبا، بۆران، شلێوە، باروف، باهوز، بازور، باگەر، گەردەلوول
عاصفة

**tempestuous** /temˈpestʃʊəs/ *adj* (کەش) ڕەشەبا، باهۆز، هەڵچو، ورووژاو، سەخت
(الطقس) عاصف، (مجاز) ثائر، هائج، عنيف

[1]**temple** /templ/ *n* [C] پەرستگا، پەیکەر
معبد، هيكل

[2]**temple** /templ/ *n* [C] ڕومەت، ئەم لاوئەولای ناوچەوان

صدغ، فود

**tempo** /tempəʊ/ *n* موسیقا (کێش) دەم، لەزالفینی (مەزیقە)
(موسيقى) سرعة الايقاع

**temporal** /tempərəl/ *adj* ١. کاتی
٢. دنیایی، مێژکی، دەمکی، دەمدار
١. زمني ٢. دنيوي (نقيض روحي)

**temporary** /temprərɪ/ *adj* دەمدار، کاتی، سەردەمی، چاخی
مؤقت، وقتي
*~ employment* کار یا ئیشی کاتی
وظيفة او عمل مؤقت

**temporarily** /temprərəlɪ/ *adv* بەکاتی، دەمدارەکی
مؤقتا، وقتياً على نحو مؤقت

**tempt** /tempt/ *vt* ١. فریولەدا، قایل دەکات، هەڵیە خەڵەتێنێ ٢. هەڵی ئەفریوێنێ
١. يغوي ٢. يغري:
*The weather ~ ed him to go for a swim* کەشەکە هەڵیفریواند بچێ بۆ مەلە
اغراء الطقس بالسباحة

**tempter** *n The Tempter* شەیتان، فریودەر، فێتنکار
(بخاصة) الشيطان، ابليس

**tempting** *adj* فیتنکاری، فریوین
مغر، مغو

**temptation** /tempˈteɪʃn/ *n* [C,U] فریودان، وەسوەسە دروستکردن بۆ کردنی کارێك، فریودان، ئاران، گالدان
اغراء، غواية، شيء مغر او مغو

**ten** /ten/ *adj, n* [C] دە، دەھ
عشر، عشرة (١٠)

**tenth** *adj, n* [C] دەیەم، یەك لەدە
العاشر، العشر

**tenable** /tenəbl/ *adj* ١. پتەو، پارێزراو، ئەتوانرێ بەرگری لێبکرێ، پارێزبار، سەخت، پارێزباری، بەرەڤانبار
١. حصين، منيع، يمكن الدفاع عنه
*a fortres / position / argument that is ~* قەڵا / شوێن / بەڵگەی پتەو پارێزراوە ٢. (پیشە، پایە) کەسێك ئەتوانێ وەریبگرێ و کاری تیا بکا
قلعة / موقع / حجة منيعة، حصينة ٢. (الوظيفة، المنصب) يمكن

لشخص ان يشغله لمدة معينة

**tenacious** /tɪˈneɪʃəs/ *adj* پێداگر، ركداڕلە سەر كردنی كارێك، خوازەلۆك، قایم، پتەو

متشبث ب، متمسك

*~ of our rights* پێداگرین لە سەرمافی خۆمان

متشبثين بحقوقنا

**tenacity** /tɪˈnæsətɪ/ *n* [U] دەستپێگرتن، توانای وەبیرهاتنەوە

تمسك، تشبث، قدرة على التذكر

**tenancy** /ˈtenənsɪ/ *n* بەكرێ گرتن، كرێكرن، دەمی كرێكرن

استجار، حيازة عقد، مدة الايجار

**tenant** /ˈtenənt/ *n* [C] كرێچی، نیشتەجێ

مستأجر، ساكن

□ *vt* دادەنیشێ (لە خانوو) وەك كرێچی

يقيم (في منزل مثلاً) كمستاجر

[1]**tend** /tend/ *vt* بایەخی پێدەدات، ئاگاداری ئەكا ـ، گوهـ ددت، خودان دكت

يعتني ب، يرعى

[2]**tend** /tend/ *vi* ۱. گوهددت، مەیل دەكابۆ، حەز دەكات، ئاراستە دیت، دگە هینیت

۱. يميل الى، يجنح نحو

*Prices are ~ ing upwards* نرخەكان لەبەرز بونەوەدان

الاسعار تميل الى الارتفاع

*Their steps ~ ed towards the bridge* ۲. هەنگاودەنێ بەرەو

۲. يتجه نحو:

**tendency** /ˈtendənsɪ/ *n* [C] (*pl* -cies) مەیل و ئارەزوو، خواست، مەبەست، حەز كردن، مەرام ئارەزوو، لادان، پێچدانەوە

ميل، انعطاف:

*Your work shows a ~ to improve* كارەكەت بەرەو چاكی ئەچێ

ان عملك يميل الى التحسن

[1]**tender** /ˈtendə(r)/ *n* ۱. هەرەبانەی سوتەمەنی (لەپاش ترومبێلی بار) ۲. بەلەمی پچوك بۆ كارئاسانی گەورەتر لەخۆی، باهەلگرێك بۆ گواستنەوەی پێداویستی و ئازوقە ۳. سەرپەرشتیار، حەزكەر، دلوڤان، یەكێ سەرپەرشتی شتێك بكات

۱. مقطورة الوقود (خلف القاطرة مباشرة) ۲. سفينة صغيرة تخدم واحدة اكبر منها، مركب لنقل المؤن ۳. شخص يرعى او يشرف على شيء:

*bar - ~* كارمەند لەبار

نادل (في حان)، ساقي

[2]**tender** /ˈtendə(r)/ *vt, vi* ۱. نمایشتی ئەكا، قەبالەدكت، پێشكەشی ئەكات (رەسمی)

۱. يعرض، يقدم

*~ payment (of a debt)* بەڵێن ئەدا ئەمەكدار بێت بۆ (قەرز)

يعرض القيام بوفاء (دين)

*~ one's services / resignation* تواناو كاری خۆی دەخاتە روو / دەست لەكار بەرئەد ۲. زۆربەپێنەدا (لەكەم كردنەوە)

يعرض خدماته / يقدم استقالته ۲. يتقدم بعطاء (في مناقصة)

*~ for the construction of a bridge* دراڤ پێشكشیكرنا بەهایی، بۆ دروستكردنی پرد

يتقدم بعطاء لاقامة جسر

□ *n* [C] ۱. بەخشین، لێبوردە (لەكەمكردن و پێداشكان)

۱. عطاء (في مناقصة)

*legal ~* ۲. خستنە بازاڕی ملك و سامان لەبری دانەوەی قەرز، دراوی یاسایی، پابەندبوون

۲. عرض مال او خدمات وفاء لدين او التزام: عملة قانونية

[3]**tender** /ˈtendə(r)/ *adj* ۱. نەرم، ناسك، شكە ستوك، تورە، هەستیار ۲. (گۆشت) ناسك، تەڕوبڕ ۳. ناسك، سۆزیار، خوێن گەرم

۱. رقيق، ناعم، سريع العطب، حساس ۲. (اللحم) سهل المضغ، طري ۳. رقيق، عطوف، محب:

*~ looks* سەیر كردنی لاوەكی

نظرات حانية

**tenderly** *adv* ب نازكی، بەسۆزی، بەنیانی

برقة، بحنان، بلطف

ˌ**tender** ˈ**hearted** *adj* بە بەزەیی، دلْناز

شفوق، حنون

**tenderness** *n* نەرمی، نەرمێتی، دلْنازی، دلوڤانی

رقة، حنان، غضاضة، طراوة

**tendon** /ˈtendən/ *n* [C] ژێی ماسولكە، دەمار، ژێ

وتر العضلة، عصب

**tendril** /tendrəl/ *n* [C] تەرزی رووەك، تاڵی رووەکی خۆهەڵواسراو، هلاویستك
سلك النبات، خیوط النبات المتسلق

**tenement** /tenəmənt/ *n* (بەتایبەتی) بینا کە چەند خانۆچکەی بچوکی تێدابێ بۆ خێزانە هەژارەکان، ناڤاهی یی، ئاوایی
(بخاصة) مبنی یشتمل علی عدة شقق تسکنه العائلات الفقیرة

**tenet** /tenɪt/ *n* [C] بنەما، باوەر، بۆچوون
مبدأ، اعتقاد، مذهب

**tennis** /tenɪs/ *n* [U] گەمەی تێنس، بەلێدانی سوك چەند جارێك
لعبة التنس او کرة المضرب

**tenniscourt** *n* [C] گۆرەپانی تێنس، مەیدانکا تەنس
ملعب تنس

**tenor** /tenə(r)/ *n* بەرزترین دەنگی پیاو (بروانە *alto*)، ناوەرۆك، دەنگی بڵند
(موسیقی) الصادح: اعلی اصوات الرجال (انظر *alto*)

[1]**tense** /tens/ *n* [C] شێوکی فرمان کە بریتی یە لە دەمی فرمان، هەڤوك
صیغة الفعل الدالة علی زمانه

[2]**tense** /tens/ *adj* ١. تنگزی، پەشێو، پەشێوی: تنگژت، پەیوەندی بەگرژبونە وەهەیە، دتنگژینت
١. مشدود، متوتر: ٢. دال علی التوتر:

*faces ~ with anxiety* دەم وچاو نیشانەی شڵەژانی پێوە دیارە
وجوه علیها علامات التوتر من القلق

**tensely** *adv* بە توندی، پەشۆکاوی، ب تنگژینی
علی نحو مشدود او متوتر

**tenseness** *n* [C] تنگژینی، گرژی
توتر

**tensile** /tensaɪl/ *adj* ١. تنگژینی، کشانی، گرژبوو ٢. رادەکێشرێت
١. شدی توتری ٢. قابل للشد

**tension** /tenʃn/ *n* ١. توند کردن، پەشۆکان، گرژی، گرژ، کشان، تنگژین
١. توتر، شد، مط

*the ~ of a violin string political ~* گرژی، تنگژین، گرژبونی ژێی کەمانچە ٢. ئاڵۆز، گرژ، پەیوەندی ئاڵۆز، گرژ بوون (سیاسەت، پەیوەندی رامیاری)
توتر وتر الکمان ٢. توتر، علاقات متوترة: توتر سیاسي، علاقات سیاسیة متوترة

**tent** /tent/ *n* [C] رەشماڵ، خیڤەت، کۆن، چادر، دەوار
خیمة، فسطاط

**tentacle** /tentəkl/ *n* قۆچی هەستیار، ئەندامی هەستەوەر لەهەندێ گیانەوەردا، (وەك لە ماری هەشت سەر)
مجس، عضو الحس في الحشرات و بعض الحیوانات (الاخطبوط مثلاً)

**tentative** /tentətɪv/ *adj* ئەزمونی، کاتی، دەمی
تجریبي، مؤقت، غیر نهائي

*only a ~ suggestion* تەنها پێشنیارێکی سەرەتاییە
ما هو الا إقتراح مبدئي

**tentatively** کاتیانە، دەمداری
علی سبیل التجربة، مؤقتاً

**tenterhooks** /tentəhʊks/ چنگالی کشاندنێ (تەنها بۆدەربرین) لەوپەری شپرزەیی و شڵەژاندا
(فقط في التعبیر) علی احر من الجمر، في قلق او توتر

**tenth** /tenθ/ *adj*, *n* [C] دەیەم، دەهەمین (بروانە *ten*)
(انظر *ten*)

**tenuous** /tenjʊəs/ *adj* ورد، تەنك، لاواز، زراڤ، بچوك
دقیق، رقیق، ضئیل

**tenure** /tenjʊə(r)/ *n* [C,U] خاوەندارێتی، ماوەی فەرمانرەوایی، دابینکرن، دامەزرێن
حیازة (الارض مثلاً)، فترة تولي (منصب مثلاً):

*~ of office* ماوەی پۆست وەرگرتن
فترة تولي المنصب

*security of ~* دابینکردن
ضمان حیازة ملکیه

**tepid** /tepɪd/ *adj* شلەتێن، شیرتین
فاتر

**term** /tɜ:m/ *n* ١. ماوە، دەم، پێکهاتن
١. مدة، فترة، اجل، أمد

*a ~ of imprisonment* ماوەی سزادان لەبەندیخانە، وەرزی خوێندن، ماوەیدادوەری کردن یان خوێندن ٢. (لە

شێوگی کۆدا) بەند، مەرج:

مدة الحكم بالسجن: فصل قضائي او دراسي، فترة انعقاد المحاكم او افتتاح المدارس ٢. (في صيغة الجمع) شروط:

~ *s of surrender* مەرجی خۆبەدەستەوەدان

شروط الاستسلام

*come to / make ~ s (with sb)* رێك ئەکەوێ لەگەڵ، راز و نیاز دەکات لەگەڵی ٣. (لە شێوگی کۆدا) هاوپەیمان ٤. دەستە واژە:

*on good ~ s with sb*

يتفق او يتراضى معه ٣. (في صيغة الجمع) على وفاق معه ٤. مصطلح، عبارة

*scientific ~ s* دەستەواژەزانیاریەکان ٥. (لە شێوگی کۆدا) وشەکان، دەستەواژەکان

مصطلحات علمية ٥. (في صيغة الجمع) كلمات، عبارات:

*in ~ s of high praise* بە ستایشکردنی زۆر

بعبارات المديح البالغ

*in abusive ~ s* قسەوتن، جنێودان

بعبارات الذم او السباب

□ *vt* ناوی لێئەنێ

يسمي، يطلق اسماً على

**terminable** /ˈtɜːmɪnəbl/ *adj* دەتوانرێ کۆتایی پێهێنرێ، دوماهیار، دەمدار

قابل للانتهاء، يمكن فسخه او انهاؤه (العقد مثلاً)

**terminal** /ˈtɜːmɪnl/ *adj* ١. وەرزی کاتی، دوماهی

١. فصلي، فتري

~ *examinations* ئەزمونی کۆتایی سالی خوێندن

٢. کۆتایی، وویستگەی دوماهی لە هێڵی ئاسنین

امتحانات نهائية الفصل الدراسي ٢. طرف، نهاية، بهائي، محطة نهائية في خط سكة الحديد

□ *n* یەکێ لەلاگەیەنەرەکان (کارەبا)

احد اطراف التوصيل (كهرباء)

*air ~* ویستگەیەك لەشارەکەدا بۆ گەشتیاران بەفرۆکە

محطة في المدينة للمسافرين جواً

**terminate** /ˈtɜːmɪneɪt/ *vt, vi* کۆتایی پێدێت، سنوری بۆ دادەنێ، بەتالی دەکاتەوە (بەڵێن، رێکەوتننامە)

ينتهي، يضع حداً ل، ينهي، يبطل (معاهدة مثلاً)

~ *in* تەواودەبێ بە

ينتهي ب

**termination** /ˌtɜːmɪˈneɪʃn/ *n* [C,U] کۆتایی، هێڤشین، دماهیکرن، سەرەنجام، دوماهی، دوایی

نهاية، لاحقة في نهاية الكلمة

**terminology** /ˌtɜːmɪˈnɒlədʒɪ/ *n* [C,U] زاراوەو دەستەواژەی هونەری یان کرداری، زاراوزانی

مصطلحات فنية او علمية

*grammatical ~* دەستەواژەی رێزمانی

مصطلحات نحوية

**terminus** /ˈtɜːmɪnəs/ *n* [C] کۆتایی رێگا، دواهێڵ، وێستگەی کۆتای بۆ (شەمەندەفەر وپارەهەڵگر) ئێزگە یادوماهی

نهاية الطريق، اخر الخط، محطة نهائية (لقطار او حافلة)

**termite** /ˈtɜːmaɪt/ *n* [C] مۆرانە، مێرولەی سپی، مۆرەفە، دارسم

الارضة، النمل الابيض (حشرة مدمرة)

**terrace** /ˈterəs/ *n* ١. هەیوان، داڵان ٢. تەلان، سەربانك ریزە خانوو (بەلاپاڵەوە یابەرزایی یان لێژایی)

١. شرفة واسعة، مصطبة ٢. صف منازل (على ارض مرتفعة او موقع منحدر)

**terraced** *adj* پلیکان کراو، جێگە دانیشتن، پلەپلە کراو بۆ جێگە دانیشتن

مدرجة او مقسمة الى مصاطب

~ *d houses* چەند خانەویەك بەتەنیشت یەکەوە

صف من المنازل المتصل بعضها ببعض

**terrain** /teˈreɪn/ *n* ناوچە، دەڤەر، ئەرد

منطقة، تضاريس طبيعية

**terrestrial** /tɪˈrestrɪəl/ *adj* زەوی کەندو کوك، ئەرزی نیشتەجێ، دونیایی، گەردونی

ارضي، دنيوي

**terrible** /ˈterəbl/ *adj* ترسناك، ترسین، ناخۆش، بەرباد، ترسدار، سامناك

رهيب، فضيع، بغيض، كريه

**terribly** *adv* سامناکی و بەسام

(ل . د) بهول، بفظاعة

**terrier** /ˈterɪə(r)/ *n* تانجی، سەگی پچوك و زیرەك بۆ راو

كلب صيد صغير و ذكي

**terrific** /təˈrɪfɪk/ *adj* ١. ترسناك، تۆقێنەر ٢. بژدهێن، ترسین، زۆر خۆش، ئاوارتە، خۆش، نایاب

۱. رهيب، مروع ۲. (ل . د) هائل، رائع، استثنائي

**terrify** /ˈterɪfaɪ/ دەترسێ، دەتۆقێ

يرهب، يروع

**territorial** /ˌterɪˈtɔːrɪəl/ *adj* ۱. هەرێمی، ناوچەیی

۱. اقليمي، محلي

*~ waters* ئاوی هەرێمی

مياه اقليمية

*the T ~ Army* ۲. سوپای هەرێمی لەشکەری (یەکەی بەرگری میللی بۆبەرگری بەریتانیا)

۲. الجيش الاقليمي (وحدات اهلية للدفاع في بريطانيا)

**territory** /ˈterɪtrɪ/ *n* [C,U] ۱. هەرێم، ناوچە، دەڤەری سەر بە میری:

۱. اقليم، مقاطعة تابعة لحاكم او حكومة ما:

*a former Portuguese ~ in Africa* ناوچەیەك لەئەفەریقا کاتی خۆی سەر بەپەرتوگال بوو ۲. ناوچە، دەڤەر، ئەردی

منطقة كانت تابعة للبرتغال في افريقيا ۲. منطقة، مساحة

**terror** /ˈterə(r)/ *n*، تیرۆر (کەس یا شتێك) ترسناك، ترس، تۆقین

(شخص او شيء) مرعب، رهيب، رعب، ذعر

**terrorism** *n* [U] تیرۆریزم، تۆقاندن بەتایبەتی ترساندن سیاسی، ترساندن

إرهاب بخاصة ارهاب سياسي

**terrorist** *n* [C] تیرۆریست، بکوژ، تۆقێنەر، ترسکار

ارهابي

**terse** /tɜːs/ *adj* (ئاخافتن، رێباز، رەوشتی قسەکەر) رەق، چروپر، کورت، پوخت، / پتەو، قەمشتی

(الحديث، الاسلوب المتحدث) موجز، جامع / محكم

**tersely** *adv* بەکورتی، بە توندوتۆڵی

بايجاز، باحكام

**test** /test/ *n* [C] ئەزموون، تاقیکردنەوە، پشکنین

اختبار، فحص

*put sth to the ~* تاقیدەکاتەوە، دەیخانە ژێر تاقیکردنەوە

يختبر، يخضع للاختبار

□ *vt* ۱. تاقی ئەکاتەوە، دەپشکنێ

۱. يختبر، يفحص

*~ ore for gold* کەرەسەی خاو ئەپشکنێ بۆگەڕان بەدوای ئاڵتون ۲. تاقی دەکاتەوە، ئەزموندکت

يفحص المعدن الخام بحثاً عن الذهب ۲. يمتحن، يجرب:

*The long climb ~ ed our powers of endurance* سەرکەوتنە دوورودرێژەکەمان تاقی کردنەوەی توانامان بوو بۆ بەرگەگرتن

كان التسلق الطويل اختباراً لقدرتنا على الأحتمال

**test pilot** *n* [C] فڕۆکەوانی تاقی کردنەوە

طيار اختبار

**test-tube** *n* [C] بۆری تاقی کردنەوە

انبوبة اختبار

**testament** /ˈtestəmənt/ *n* [C] ۱. زۆرجا (*last will and ~*) وەسیەت، راسپێری دوایی دوو بەشە سەرەکیەکەی ئینجیل

۱. غالباً (*last will and ~*) الوصية الأخيرة

*Old T ~* ۲. راسپێری کون

۲. العهد القديم

*New T ~* راسپێری نوێ

العهد الجديد

**testify** /ˈtestɪfaɪ/ *vt, vi* ۱. گەواهیدەدا لەدژی

۱. يشهد ضد، يدلي

*~ against* شایەتی لێدەدا

بشهادة ضد

*~ on behalf of* گەواهیدەدا بۆ بەرژەوەندی

يشهد لصالح

*~ that* شایەتی ئەدا کە ۲. ئاشکرایدەکا، رونیدەکاتەوە

يشهد ان ۲. يعلن، يبين

*~ to* ۳. گەواهی ئەدا

۳. يشهد او يكون دليلاً

*Your work testifies to your ability* کارەکەت توانات دەردەخا

على عملك يشهد على مقدرتك

**testimonial** /ˌtestɪˈməʊnɪəl/ *n* ۱. گەواهی لێهاتوویی و رەوشت باشی ۲. بەڵگە نامە، ستوف، گواهنامە، خەلاتی سوپاس، خەلاتی مەزەنەیی

۱. شهادة أهلية او حسن سلوك ۲. هدية شكر، هدية تقديرية

**testimony** /ˈtestɪmənɪ/ *n* [U] گەواهی، شایەتی، بەڵگە، دانپیانان بە بیروباوەڕێکی (ئاینیدا) بەڵگەنامە

شهادة، بينة، دليل، برهان، اقرار بالعقيدة (الدينية)

**testy** /ˈtestɪ/ *adj* ئەنروك، هول، تورە

نزق، نكد، سريع الغضب

**tether** /teðə(r)/ *n* گوریسی ئاژەڵ بەستنەوە
حبل تربط به الدابة
*at the end of one's ~* ئارامی نامێنێ، لە ووزەیدا نەما
(مجاز) ينفذ صبره، غاية ما في طاقته
□ *vt* جێگیر یا بە پەتێك دەبەسترێ
يثبت او يقيد بحبل

**text** /tekst/ *n* [C,U] ١. دەقی پەڕاو، سایە ٢. ئایەتێك لە کتێبی پیرۆز بۆلێکۆڵینەوە
١. نص الكتاب، متنه ٢. آية من الكتاب المقدس تتخذ موضوعاً لعظة أو مناقشة

**textbook** *n* کتێبی دانراو، کتێبا، دبستانی
كتاب مدرسي، كتاب مقرر

**textile** /tekstaɪl/ *adj* تەونی، پەیوەندی بە تەونکردنەوە هەیە، پەنك یان ریس پۆتەونی، تەفنی
نسيجي، ذو علاقة بالنسيج
□ *n* [C] چنراو، ئەتەم
نسيج، خيط او غزل صالح للنسج

**texture** /tekstʃə(r)/ *n* ١. تەون، ئەتەم، تەفن
١. نسيج
*cloth with a loose ~* کوتاڵی نەرموشل ٢. پێکهاتە
شێوەوجۆری ئەومادەیەی کەشتێك پێك دەهێنێ
قماش في نسيجة رخاوة ٢. بنية او تركيب الشيء

**than** /ðən; ðæn/ *conj* ١. (بۆ بەکارهێنانی بەشی دووەم لە بەراوردەکە) لە، تاکو، ژ، مەگەر
١. (لاستهلال الجزء الثاني من المقارنة)
*John is taller than Jack* (جون) درێژترە لەجاك
جون اطول من جاك
*no (ne) other ~* ٢. نەك تەنها
٢. ليس الا، ليس غير
*I met no (ne) other ~ my old friend, Philip, today*
ئەو کەسەی کەچاوم پێکەوت ئەمرۆ فیلیپی هاوڕێم بوو
لم يكن الذي قابلته اليوم سوى صديقي فيليب
*nothing else ~* تەنها، بەتەواوی
فقط، مجرد، كلية
*It was nothing else ~ bad luck that they lost the game* دۆڕاندنیان لەیاریەکەدا تەنها لەبەر بەدبەختی بوو
لم تكن خسارتهم للمباراة الامجرد سوء حظ

**thank** /θæŋk/ *vt* سوپاسدەکات، مال ئاڤادکت
يشكر، يعرب عن الامتنان

**thanks** *npl* ١. سوپاس، مالاڤا، دەستەواژەی سوپاس ٢. سوپاس، (بۆیەزدان)، سوپاس بۆ تۆ
١. شكر، عبارات الشكر ٢. (ل . د) شكراً، شكراً لله
*~ s to* لەبەرچاکی، بەهۆی
بفضل، بسبب، نتيجة ل
*Give ~ s* (بەتایبەتی) سوپاسی یەزدان ئەکات، نوێژ نانخواردن ئەکات
(بخاصة) يشكر الله على نعمه، يتلو صلاة المائدة

**thanks 'giving** *n* نوێژی سوپاس
صلاة الشكر

**thankful** *adj* سوپاسدار، منیکار
شاكر، معبر عن الشكر

**thankfully** *adv* بەسوپاسداری
بامتنان، شاكراً

**thankless** *adj* (بەتایبەتی ئیش) سوپاسی بۆناکرێ
(بخاصة العمل) لايشكر
*a ~ task* (ئەرکێك) بەخراپی پاداشتی دەدرێ
(مهمة) يكافأ عنها بشر الجزاء

**thanklessly** *adv* بێ سوپاسکردن یان پاداشت، بێ پاداشت
بدون شكر او جزاء

**that** /ðæt/ (*pl* those /ðəʊz/) *adj, prom* ڕاناوێکە بەمانای (ئەوە) لەوەی، ئەوەی کە، ئا ئەوەندە، داکو، کو، داها، جا، ئەوی، وێ، یاکو
(*this. these*) تقابل
*Look at ~ man / those men over there* ١. سەیری ئەو پیاوە بکە / ئەو پیاوانە لەوێن
١. انظر الى ذلك الرجل / اولئك الرجال هناك
*This photograph is much clearer than ~ (one)*
ئەم وێنەیە زۆر ڕونترە لەوی تر
ان هذه الصورة اوضح بكثير من تلك
*My new car is of a different make from ~ which I had before* ٢. ئەم ئوتومبیلە نوێیەم لەدروستکردندا جیاوازە لەوەی پێشوترم
٢. ان سيارتي الجديدة من صنع مختلف عن تلك التي كنت املكها قبلها:

زەل، بە پوش یا بەزەل سەربانی بۆ دروستەکا □ *vt*
يغمو: يسقف كوخاً بالقش

**thaw** /θɔ:/ *vi, vt It is ~ ing* ١. پلەی گەرما ئەوەندە بەرز بویەوە بەجۆرێك سەهۆڵەکی توانەوە ٢. دەتوێتەوە (بەفر)، دەتوێتەوە ٣. (مرۆڤ) واز لەپابەندبون دێنێ
١. لقد ارتفعت درجة الحرارة بحيث بدأ الجليد بالذوبان ٢. يذيب (الثلج)، يذوب ٣. (الشخص) يتخلى عن تحفظه

□ *n* [C] توانەوە، فێنکی لە کەشدا
ذوبان، دفء في الجو

**the** /ðə/ ئامرازی ناساندن بە (زی) دە خوێنرێتەوە ئامرازی پێناسین شێوگێکە دیاریکردنی کەمترە لە
ولكنها تلفظ / ذي / قبل الاصوات اللينة اداة التعريف *defind article* وهي صيغة اقل تحديداً من *this, that, these, those*

*play ~ guitar / piano (but cf play tennis, football etc)*

*The car does thirty miles to ~ gallon* ئوتومبیلەکە گالۆنێك بەکاردێنێ بۆ هەر سی میلێك
تستهلك السيارة جالوناً واحداً كل ثلاثين ميلا

□ *adv* بەهەمان پلە
بنفس الدرجة، بذات المقدار

*The more he has the more he wants* تا زۆری هەبێ داوای زیاتر ئەکا
كلما زاد ما عنده كلما طلب المزيد

**theatre** /ˈθɪətə(r)/ *n* ١. شانۆ، نمایشگا ٢. هۆلی وانەووتنەوە، شوێنی وانەکان، پلە پلە ٣. ژووری نەشتەرگەری
١. مسرح ٢. قاعة محاضرات، مدرج ٣. غرفة العمليات (الجراحية)

*the ~* شانۆ، نوسین ونواندنی شانۆگەری
المسرح، كتابة و تمثيل المسرحيات

**theatrical** /θɪˈætrɪkl/ *adj* ١. شانۆیی
١. مسرحي

*~ scenery* دیمەنی شانۆی ٢. (رەوشتی) ناسروشتی لەرادەبەدەر
المناظر المسرحية ٢. (السلوك) متكلف، زائف، غير طبيعي مبالغ فيه

**thee** /ði:/ *pron* راناوی کەسی دووەم، تۆ

*Those who want to go swimming must put their names down on the list* پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی ئارەزووی چوون بۆ مەلە دەکەن ناویان لە لیستە کە تۆماربکەن
على الذين يرغبون بالذهاب للسباحة ان يسجلوا اسماءهم في القائمة

□ *adv I couldn't walk ~ far* ناتوانم ئەو هەموو ڕێگایە بیرم
(ل. د) لم استطيع المشي كل تلك المسافة

□ *rel prom* (بەبێ گۆڕان لە شێوگی کۆدا)
(بدون تغيير في صيغ الجمع)

*The letter ~ came this morning is from my father* ئەو نامەیەی ئەم بەیانی یەگەیشت لە باوکمەوەبوو
ان الرسالة التي وصلت هذا الصباح (هي) من والدي

*Give help to any one ~ needs it* دەستی یارمەتی درێژ بکە بۆ هەر کەسێك پێویستی پێیەتی (بەراورد بکە بە (which who
قدم يد المساعدة الى كل من يحتاجها

□ *conj I will see ~ your car is ready tomorrow* ١. هەوڵدەدەم سبەینێ ئوتومبیلەکەت بۆ ئامادە بکەم
١. سأعمل على ان تكون سيارتك جاهزة غداً

*Bring it to the light so ~ I can see it better* ٢. نزیکی ڕوناکییەکەی بخەرەوە تابەباشی ببینیم
٢. قربها من النور كي اتمكن من رؤيتها بشكل افضل

*His manners are so bad ~ nobody invites him to a party* ٣. ئەوەندە ڕەوشتی خراپە هیچ کەس بانگی ناکات بۆ ئاهەنگ
٣. ان اخلاقه من السوء بحيث لايجرؤ احد ان يدعوه الى حفلة

*You may go on condition ~ you will not come home alone* ٤. ئەتوانی بڕۆی بەمەرجێ بەتەنها نەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ
٤. يمكنك ان تذهب شريطة ان لا تعود الى المنزل بمفردك...

*Oh, ~ I could see you again!* ٥. (بۆسەرسورمان) خۆزگە ئەمتوانی جارێکی تر بتبینمەوە!
٥. (للتعجب) ياليتني استطيع ان اراك ثانيةً!

**thatch** /θætʃ/ *n* [U] زەل یا پووش، بۆ بانی خانوو، کوختە یان کەپر (بانێ پێشی یان زەلکان)
غماء، قش يسقف به كوخ

*T ~ ther'es James, oughtn't he to come too?*
٤. ئینجاکو، سەرەرای ئەوە ئەوە جیمس لەوێیە ئەی ناتوانی بانگی بکەین؟ ٥. (بۆئاگادار کردنەوە، سەرنجلێدان)
٤. ثم ان، وفوق ذلك: ثم ان هناك جيمس، ألا يجدر ان ندعوه أيضاً؟ ٥. (للتحذير، الاحتجاج، لفت الانتباه)

*Now Heve*

**thence** /ðens/ *adv* لەویوە، لەپاشدا (وێ ذریێ، پاشی، ژهینگی وەرە)
من هناك، من ثم

**theologian** /ˌθɪəˈləudʒən/ *n* [C] ئاینزانی، ئولَداَر، ئانیڤان، فەقێ
اللاهوتي، عالم اللاهوت

**theological** /ˌθɪəˈlɒdʒɪkl/ *adj* ئۆلداری ئاینی، پەیوەندە بە زانستی، سیۆلۆجی، تیۆریانە، بیردۆزی نەك کردار، فەقێتی
لاهوتي، متعلق بالعلوم اللاهوتية

**theology** /θɪˈɒlədʒɪ/ *n* یەك خودازانی، ئاینزانی، دینزانی، ئولزانی
اللاهوت، فلسفة الالهيات

**theorem** /ˈθɪərəm/ *n* [C] ١. بیردۆز ٢. بیردۆزێکە پێویستی بەسەلماندن هەیە (لە زانستیە بیرکاریەکاندا)
١. نظرية ٢. نظرية بحاجة الى برهان (في العلوم الرياضية)

**theorist** /ˈθɪərɪst/ *n* بیردۆزیار، دیتانەڤان، بیدۆزان
صاحب النظرية، مشتغل بالعلوم النظرية

**theorize** /ˈθɪəraɪz/ *vi* بیردۆزدادەنێ، دیتا نەدکت
يضع النظريات، ينظر

**theoretic(al)** /θɪəˈretɪk(l)/ *adj* بیردۆزی (نەك کرداری) دیتانەیی
نظري

**theory** /ˈθɪərɪ/ *n* [C,U] بیردۆز، تێروانی، تیۆری، دیتانە (پێچەوانەی کرداری ٢. بیرۆکە، را، تیۆر بیردۆزی داروین
نظرية، شرح او تفسير نظري (نقيض عملي أو تطبيقي) ٢. فكرة، رأي، نظرية: نظرية داروين في التطور
*Darwin's ~ of evolution* (لەگەشەسەندندا)
(النشوء و الارتقاء)

***therapeutic; theraputical** *adj* چارەسەریيانە
علاجي

ضمير المخاطب *thou* في حالتي النصب و الجر

**theft** /θeft/ *n* [C,U] دزین، دزی
سرقة

**their** /ðeə(r)/ *adj* (موڵك) ئەوان
(ملك) هم / هن
*They have lost ~ dog* ونیانکرد سەگەکەیان ونکرد
فقدوا / فقدن كلبهم / كلبهن

**theirs** /ðeəz/ *pron* هی ئەوان، تایبەتە بەوان، هی خۆیانە
خاصتهم، ملكهم / خاصتهن، ملكهن
*That dog is not ~ it's ours* ئەو سەگەهی ئەوان نییە ئەوە سەگی خۆمانە
ان ذلك الكلب ليس كلبهم / كلبهن، انه كلبنا

**them** /ðəm; ðem/ *pron* ئەوان (بڕوانە *they*)
(انظر *they*)

**theme** /θi:m/ *n* [C] ١. بابەت، باس، نوسین
١. موضوع (الحديث او الكتابة)
٢. (مۆسیقا) ئاوازی سەرەکی دووبارەلە ئۆپەرێت *song ~* یا سەمفۆنیا
٢. (موسيقي) اللحن الرئيسي المتكرر في اوبريت او سمفونية

**then** /ðen/ *adv* ١. لەوەدوا، ئینجا، ئەخو، هینگێ، پاشی، ئیدی، خونە، ئاخەر، پا، ڤێجا
١. عندئذ، آنئذ، آنذاك
*We were living in Scotland ~* پێشتر ئێمە لە ئەسکتلەندا ئەژیاین
لقد كنا آنئذ نعيش في اسكتلندا
*Will you still be here ~ ?* ئایا هەرلێرە ئەمێنی؟
استبقى هنا عندئذ
*from ~* دوای ئەوە
فيما بعد لك
*since ~* لەوکاتەوە ٢. لەدوای، ئینجا
منذ ذلك الحين ٢. ثم، بعد ذلك: سنذهب
*We'll go to Paris first, ~ to Rome* ئەچین بۆ باریس ئینجا بۆ رۆما ٣. کەواتە، مادام وایە
الى باريس اولاً ثم الىٰ روما ٣. اذن، مادام الامر كذلك
*You say you feel ill; ~ why don't you call the doctor?* تۆ ئەڵێیت نەخۆشم کەواتە بۆچی پزیشك داوا ناکەیت؟
إنك تقول بأنك مريض، اذن لماذا لاتستدعي الطبيب؟

***therapy** چارەسەری دەروونی

مداواة، العلاج، الطب النفسي

**there** /ðeə(r)/ *adv* (بەراورد لەگەڵ *here*)

(بالمقارنة مع *here*)

*Put my box down ~* ١. لەوێ، لەوشوێنەدا

١. هناك، في ذلك المكان:

*T ~ goes the fox. T ~ it goes* ٢. ئا ئەوە ڕێویەکەیە

٣. (بۆ سەرنج ڕاکێشان) ئەوە کونێك لەپێڵاوەکەتدایە

٢.ها هو الثعلب ٣. (للفت الانتباه) هناك ثقب في حذائك

*T ~ 's a hole in your shoe*

*Look out, ~ !* ئاگاداربە (چی لەبەردەمتە)

(لەگەڵ *seem, appear ...*)

انتبه، احذر (ما امامك)! (مع *seem, appear* و اضرابهما)

*T ~ seems to be no escape* وادیارە قوتاربوون و دەربازبون نییە لەوێ

يبدو ان لا يوجد مهرب هناك

*T ~ appears to be nobody here* وادیارەکەس لێرە نیە

يبدو انه لا يوجد احد هنا

□ *int T ~ , ~ , dry your tears* (بۆدڵدانەوە)

بەسیەتی، پیویست بەگریان ناکات، بەسە، بەسە فرمێسکەکانت بسڕە

(للمواساة) كفى، كفى، جفف دموعك (لاداعي للبكاء)

*T ~ now, I was right!* (دەربڕینێك بۆ سەرکەوتن)

ئێستا بۆت دەرکەوت من لەسەر ڕاستی بوم (دەربڕینی بێهیوایی سەرزەنشتکردن)

(تعبيراً عن الانتصار) انت ترى الان انني كنت على حق! (تعبيراً عن اليأس أو التأنيب)

*T ~ ! You've upset the ink!* وریابە مەرەکەبەکەت قلْپ کردەوە!

و يحك، لقد دلقت الحبر!

**thereabout(s)** /ðeərəbaʊt(s)/ *adv* لەو نزیکانە، شوێنێك لەو ناوە (ئەوشوێنە یا ژمارە یا بڕ)

قريباً من (ذلك المكان او العدد او المقدار)

**thereafter** /ðeər'ɑ:ftə(r)/ *adv* لەپاش ئەوە، لەو کاتە بەولاوە، ژهینگێ وەرە، پشتی هینگی

بعد ذلك، من ذلك الوقت فصاعداً

**thereby** /ðeə'baɪ/ *adv* بەمەش، ب وێ ئاوایی، ڤێجا لەئەنجامی ئەوەوە

و بذلك، و نتيجة لذلك

**therefore** /'ðeəfɔ:(r)/ *adv* بۆ ئەوە، لەبەرئەوە، لەورا، لەوما، ئیدی

و لذلك، و لهذا السبب

***therein** ١. لەو شوێنە یا ئەو شتە (هۆیەك لە پێشتر باسکرابێ) ٢. لەو باسەدا، لەو کێشەیەدا

١. في ذلك المكان أو الشيء ٢. في تلك المسألة

**thereupon** /,deərə'pɒn/ *adv* بەوپێیە، ژبەرهندێ، جهدا، ل بەر هەندێ

و عليه، و بناء على ذلك

**therm** /θɜ:m/ *n* یەکەی پێوانی گەرمی

الثرم: وحدة قياس الحرارة

**thermal** /'θɜ:ml/ *adj* گەرمیانە، گەردەکی، تین

حراري

*~ springs* کانیاوی گەرم

ينابيع حارة

**thermo** /,θɜ:məʊ/ *prefix* پێش گرێکە بەمانای گەرمی، گەرمدار، تین، گەرم

بادئة معناها: حراري

**thermodynamics** *npl* گەرمە جوڵە، دینامیکی گەرمی

الديناميكا الحرارية

**thermometer** /θə'mɒmɪtə(r)/ *n* گەرمیپێو، گەرمی پێڤ، گەرمپێڤ

ميزان حرارة

**thermostat** *n* [C] گەرمی ڕێکخەر

منظم الحرارة

**these** /ði:z/ ئەمانە (بڕوانە *this*) ئەڤ، ئەڤە، ئەڤان

(انظر *this*)

**theses** /'θi:si:z/ *npl* زانستە ووتار (بڕوانە *thesis*)

(انظر *this*)

**thesis** /'θi:sɪs/ *n* زانستەووتار، هەڵێژەك، بیردۆز، نامە بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی زانستی، پێشخستەك

الفرضية، الأطروحة رسالة تقدم لنيل شهادة علمية

**they** /ðeɪ/ *pers* شێوگی کۆ بۆ (*it, he, she*) ئەوان، بۆ (بکەر)

(صيغة الجمع *it, he, she* في حالة الرفع)

**them** ئەوان، وان، (تەواوکەر)

هم، هن، هما صيغة النصب و الجر

**thick** /θɪk/ *adj* ١. (پێچەوانەی *thin*) قەڵەو، ئەستور، ستور، چڕ، تێر، خەست

١. (نقيض *thin*) سميك، ثخين

*three inches ~* بەئەستوری ٣ ئينچ

بثخانة او سماكة ثلاث بوصات

*~ hair* ٢. زۆر، تێر، چڕ

٢. وافر، كثيف

*a ~ forest* دارستانێکی چڕوپڕ ٣. (شلە، کەش) چڕ، سەخت، هەواوی

غابة كثيفة (متلاصقة الاشجار) ٣. (السائل، الجو) غليظ القوام، مُلَبد

*~ with* ٤. هەڵگرتووە، قورس بووە

٤. محمل، مثقل

*air ~ with dust / snow* کەش پڕبوە لە تۆز / بەفر ٥. (دەنگ) گڕ، زبر، (بەهۆی هەڵامەتەوە)

هواء مثقل بالغبار / بالثلج ٥. (الصوت) أجش، خشن (بسب الزكام مثلا)

□ *n* [U] بەشی زۆرچڕ، سەخت

الجزء الأكثف، معمعان، و طيس

*in the ~ of the fight* لەگەرمەی شەڕدا

في وطيس القتال

*through ~ and thin* لە خۆشی و ناخۆشی دا لە هەموو بارودۆخێکدا

في السراء و الضراء، في جميع الظروف

□ *adv* بەزۆری، بەچڕی

بوفرة، بكثافة

*come ~ and fast* بەزۆردێت وەبەخێرای، بەخێرای وبەژمارەی زۆر

(اللطمات) تتوالي بسرعة: ياتي بسرعة و باعداد ضخمة

**ˌthickˈheaded** *adj* گەوج، گێل

غبي، مغفل

**thickly** *adv* بە خەستی، بەچڕی، بەزۆری

بكثافة، بوفرة

**thickness** *n* بە زۆری، بەئەستوری، چڕی، خەستی، تێری (بەتایبەتی) چین

وفرة، كثافة، غلاظة، (بخاصة) طبقة

**ˌthickˈset** ١. (کەس) کورت و گۆشتن و پڕ ٢. خەست و چڕوپڕ

١. (الشخص) قصير و بدين، مكتنز ٢. كثيف، كث، كثيف الزرع

**thickˈskinned** *adj* ڕووقایم، کەم هەست

صفيق الوجه، قليل الاحساس

**thicken** /ˈθɪkən/ *vt, vi* تۆخئەکا، ئەستوریئەکا، خەستی ئەکا تێریدەکا، ئەستوردەبێت

يغلظ، يسمك، يغلظ يصبح سميكاً

**thicket** /ˈθɪkɪt/ *n* [C] بێشە، دەحل، دارستان، بێشەلان، مێرگ، دەوەن

اجمه، دغل، أيكه غابة

**thief** /θi:f/ *n* (*pl* thieves) دەستبڕ، ڕێگر، دز، (ب *robber burglar*)

لص، سارق (قارن *robber, burglar*)

**thieve** /θi:v/ *vi, vt* ددزێت، دزیدکت، دەدزێ

يسرق

**thigh** /θaɪ/ *n* [C] ڕان، تەشك، هێت، ڕەهن، کەماخ

فخذ، ورك

**thimble** /ˈθɪmbl/ *n* موستیلەی دروومان، هونگستر، گوزڤان، کشتبان

قمع الخياطة، كشتبان

**thin** /θɪn/ *adj* ١. (*-nn*- پێچەوانەی *thick*) ورد، باریك، تەنك لەڕ رون باریك، تەنك، نارین، مەلەس، زراف

١. (*-nn*-، نقيض *thick*) رفيع، رقيق، ضئيل السمك:

*a ~ sheet of paper* پارچەیەکی تەنك لەکاغەز

صفحة رقيقة من الورق

*a ~ piece of string* پارچەیەك دەزوی باریك

قطعة رفيعة من الخيط

*~ in the face* ٢. لاواز، باریك، داکەوتوو، دم وچاو باریك ٣. (شلە) ڕوون، شل

٢. نحيل، نحيف، هزيل: نحيل الوجه ٣. (السائل) خفيف، رقيق القوام

*a ~ excuse* ٤. پۆزشتی سوك

٤. (ل. د) عذر واه

*have a ~ time* کاتێکی سەخت بەسەر ئەبا

يقضي وقتاً عصيباً

□ *vt, vi* (-nn-) سوكیئەکا، کەمی ئەکاتەوە، لاوازی ئەکا

يخفف، يقلل، يضعف

*~ the plants out* ژمارەی ڕووەکەکان کەم ئەکا بۆنەوەی

ئەوانی تر بەباشی پێبگەن
يخفف من عدد النباتات ليتيح للباقي نمواً افضل
□ *adv* بەکەمی، بەدووری، بەجیاجیا
بقلة، بتباعد، على نحو متفرق
□ *n through thick and ~* لەخۆشی وناخۆشیدا
في السراء و الضراء

**thinly** *adv* بەکەمی، بەتەنکی، جیاجیا، بەدووری
على نحو متباعد او متفرق، بقلة

**thinness** *n* [U] باریکی، لاوازی، تەنکێتی، نارینی
رقة، نحافة، رفع

**ˌthinˈskinned** *adj* هەستیار، زووکارتێکەر، ڕووقایم
حساس، سريع التأثر

**thing** /θɪŋ/ *n* [C] ١. شت
١. شيء
*a rose is a lovely ~* گوڵ شتێکی جوانە
الوردة شيء جميل
*T ~ s are getting better every day* ٢. (لەشێوگی کۆدا) باری گشتی: بارودۆخ /کاروبار ڕۆژ لەدوای ڕۆژ باشتر ئەبێ
٢. (في صيغة الجمع) أحوال عامة ان الأحوال / الأمور تتحسن يوماً عن يوم
*your / his ~ s* / ٣. (لەشێوگی کۆدا) پێداویستیە کانت / پێداویستیەکانی
٣. (في صيغة الجمع عامية): حاجاتك / حاجاته
*Have you packed your ~ s yet?* بەتایبەتی پۆشاك: ئایا تەواوبویت لە بەستنی کەل و پەلەکەت؟ ٤. ویستراو، پەسەند:
بخاصة الملابس: هل انتهيت من حزم أمتعتك؟ ٤. المراد، المرغوب:
*the (very) ~* داواکراو (خودی)
المطلوب (بعينه)
*not at all the ~ to do* زۆر دوورە لەشتی داواکراو
(انه) بعيد جداً عن الشيء المطلوب
*This is the very ~ I wanted* ئەمە (خودی) ئەو شتەیە کە داوام کرد
هذا هو الشيء الذي طلبته بعينه

**think** /θɪŋk/ *vi, vt* (*pt, pp* thought /θɔːt/)
١. بیردەکاتەوە، دێتەوەبیری ٢. وادادەنێ، پێشبینی دەکا، رادەمێنێ، وا هەست دەکا
١. يفكر، يتفكر ٢. يعتبر، يقدر، يرى:
*~ highly / well / little / nothing of sb or sth* مەزەنەی ئەکا / مەزەنەی ناکا
يقدره / لا يقدره
*~ nothing of (doing sth)* وای دادەنێ کارێکی بێبایەخە
يعتبره امراً غير ذي بال
*~ better of (doing sth)* چاوی پیاە خشێنێتەوە، رائە رای گۆڕێ
يعيد فيه النظر، يغير رأيه
*~ sth out* بیری لێ ئەکاتەوەو بەباشی هەڵی ئەگێرێتەوە
يفكر فيه، و يقلبه جيداً
*~ sth over* بە لەسەرخۆیی بیری لێ ئەکاتەوەچاوی پیا ئەخشێنێتەوە
يتروى، ينعم النظر فيه

**third** /θɜːd/ *adj, n* سێهەم، سێیەك، سێیەم
الثالث، ثلث ٣/١
*the T ~ World* جیهانی سێهەم، وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان
العالم الثالث، الدول النامية

**thirdly** *adv* سێیەم، سێهەمین
ثالثاً

**ˌthirdˈrate** پلە سێهەم، خراپ
درجة ثالثة أي من صنف رديئ

**thirst** /θɜːst/ *n* [U] ١. تینویەتی، تێهن
١. عطش، ظمأ
*die of ~* لە تینوێتیدا ئەمرێ ٢. ئارەزوی زۆر، تینوێتی (وەك بۆزانست)
يموت من الضمأ / عطشا ٢. (مجاز) رغبة جارفة، تعطش (للعلم مثلاً)
□ *vi* تینویدەبێ، بەپەرۆشدەبێ، تینوی (تۆڵە سەندنەوەیە)
يعطش، يظمأ، يتوق، يتعطش (للثأر)

**thirstily** *adv* بە تینوێتی، تێهنی
بعطش، بظمأ، بتعطش

**thirsty** /ˈθɜːstɪ/ *adj* تێهنی، تینوو، بەپەرۆش
عطشان، ظمآن، تواق، متعطش

کارێك که دەبێته هۆی تینوێتی کەسەکە، کارێکی ~ work تینوکەر

عمل يسبب العطش لمن يعمل به

**thirteen** /ˌθɜːˈtiːn/ *adj* سیانزە، سیازدە ۱۳

ثلاث عشرة، ثلاثة عشر ۱۳

**thirteenth** *adj* سێزدەم، سیانزە هەمین، ۱۳/۱

الثالث عشر، جزء من ثلاثة عشر جزءاً، ۱۳/۱

**thirtieth** /ˈθɜːtɪəθ/ *adj, n* سیهەم، سیەم، سی یەمین

الثلاثون

**thirty** /ˈθɜːtɪ/ *adj, n* [C] سی

ثلاثون، ۳۰

**this** /ðɪs/ (*pl* these /ðiːz/) *adj, pron* (بەراورد لەگەڵ (*that, those*

(بالمقارنة مع *that ،those*)

*Look at ~ picture here, and then at that picture over there*

*T ~ is by far the better picture* ئەم وێنەیە زۆر لەوی تر باشترە

هذه الصورة افضل من الأخرى بكثير

**thistle** /ˈθɪsl/ *n* [C] درەختێکی درکاویە، گڤژونك، گڤژونەك، هەلەزەك، درێ یە

شوك الجمال، نبات شائك

**thither** /ˈðɪðə(r)/ *adv* بۆئەوێ، بەوئاراستەیە، بۆ وێرەی دوور

(ا. ق) إلى هناك، في ذلك الاتجاه

**thong** /θɒŋ/ *n* قایشی چەرمی تەسك، زول، قایشا تاژانگی، قایش، قامچی

شريط جلدي ضيق، سير السوط او اللجام

**thorax** /ˈθɔːræks/ *n* [C] سنگ، بەشی ناوەراستینەی لەشی مێروو

الصدر، الجزءالاوسط من جسم الحشرة

**thorn** /θɔːn/ *n* [C,U] ۱. دردرك، درك ۲. درەختی درکاوی، دڕی گوهێژ (درەختی گوێژ *haw-thorn*)

۱. شوكة ۲. شجيرة شوكية (شجرة الزعرور *hawthorn*)

**thorny** *adj* (-ier, -iest) ۱. درکاوی، ئاڵۆز ۲. درکن، درکاوی، ئاڵۆز، سترپدار

۱. شوكي، شائك ۲. (مجاز) شائك، عويص

**thorough** /ˈθʌrə/ *adj* گشت، تەواو، هەموکی، گشتگیر، دوورودرێژ، ورد

كامل، تام، شامل، مفصل، دقيق

*give the room a ~ cleaning* ژوورەکە بەتەواوی پاك ئەکاتەوە

ينظف الغرفة تنظيفاً تاماً

*a ~ worker* کرێکاری وورد، دڵسۆز لەکارەکەی

عامل دقيق، مخلص في عمله

*receive ~ instructions in English* رێنمایی دوورودرێژ وەردەگرێ بەئینگلیزی

يتلقى تعليمات مفصلة بالأنجليزية

**thoroughgoing** *adj* تەواو، گشت

تام، كامل

**thoroughly** *adv* بەشێوەی تەواو، ووردبینی

تماماً، كلية

**thoroughness** بەهەمەکی، هەموو، تەواو، وردبینی

شمول، كلية، تمام، دقة

**thoroughbred** /ˈθʌrəbred/ *n* [C] رەسەن (ئەسپی رەسەن)؛ شارەزا، نایاب

(الحصان) أصيل

**thoroughfare** /ˈθʌrəfeə(r)/ *n* [C] شەقام، رێگای گشتی

شارع، طريق عام

*No ~* هاتوچۆ یان چونەژوورەوە قەدەغەیە

ممنوع المرور او الدخول

**thou** /ðaʊ/ *pron* (شێوگی وێژەیی) تۆ

(صيغة ادبية) انت، انت

**though** /ðəʊ/ *conj* (= *although*) ۱. سەرەڕای ئەوە، لەگەڵ ئەوەشدا:

۱. مع ذلك، رغماً عن ذلك:

*Though poor, he was always neatly dressed*

هەرچەندە هەژارە هەمیشە جلی رێکوپێکی لەبەردابوو

۲. لەگەڵ ئەوی ۳. هەتا، ئەگەر، ئەوە، هەروەکوکە ٤. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵئەدەم وە لەگەڵ

بالرغم من فقره فقد كان دوما حسن الهندام ۲. مع ان ۳. كما لو ان، وكأن ٤. و مع ذلك سأحاول مع إنني

*I'll try, ~ I don't think I shall succeed* ئەوەی لەو بڕوایەدا نیم دەربچم ٥. لەگەڵ ئەوەدا، هەرچەندە

لا أعتقد بأنني سانجح ٥. و مع هذا، و مهما يكن

**thought** /θɔ:t/ *n* [C,U] ١. بیر، رامان، هزر
١. تفكير، فكر
*lost in ~* رامان، هزر، بیر، لەبیرکردنەوەدا نوقوم بووە
مستغرق في التفكير
*modern ~* بیری نوێ
الفكر الحديث أو المعاصر
*take ~ for* بیری لێ ئەکاتەوە، خۆمانی بۆ ئامادە ئەکەین (بۆ پاشەڕۆژ) ٢. بیرورا، مەبەست
تفكر بـ، نهيء أنفسنا لـ (المستقبل مثلاً) ٢. فكرة، قصد
*He had no ~ of causing you anxiety* بیری لەوە نەکردۆتەوە کە بێزارت بکات
إنه لم تخطر له فكرة مضايقتك

**thoughtfull** *adj* راماندار، سەرقاڵی بیرکردنەوەیە، نیشانەی بیرکردنەوەیە، هیواخواز، هزردار
مستغرق في التفكير، دال على التفكير، متأمل
*~ looks* تێڕوانین بۆ بیرکردنەوە ٢. ئاگاداری لەهەستی خەڵك ئەکا، بایەخ ئەدا بە ئارەزو پێداویستی خەڵك
نظرات دالة على التفكير ٢. مراع لشعور الاخرين، مهتم برغبات الاخرين و حاجاتهم

**thoughtfully** *adv* بەبیرکردنەوە، رامانەکی، ب راماندارى، بەشێوەیەك بەرژەوەندى خەڵکی لەگەڵدایە
بتأمل، على نحو مراع لمشاعر الاخرين

**thoughtfulness** بیرکردنەوە، تێڕوانین، رەچاوکردنی هەستی کەسانی تر، راماندارى
تفكير، تأمل، مراعاة لمشاعر الاخرين

**thoughtless** *adj* ١. گوێنادا بە هەستی کەسانی تر ٢. هەڵەوەر، کەمتەرخەم، بێئاگا، بێهزر، بێرامان، قەشمەر
١. غير مراع لمشاعر الاخرين ٢. طائش، مهمل، غافل

**thoughtlessly** بەهەڵەوەرى، بێ رەچاوکردنی هەستی کەسانی تر، بابێرامانی، هولەکی
بدون مراعاة لمشاعر الاخرين، بطيش

**thoughtlessness** بەبێئاگا لەهەستی خەڵکی، بێرامانی، بێئاگا، کەم تەرخەم
عدم مراعاة مشاعر الاخرين، طيش، غفلة

**thousand** /θauznd/ *adj, n* هەزار
ألف

**thousandth** *adj, n* هەزارەمین، هەزارەم، هەزاری
الألف، جزء من ألف

**thrash** /θræʃ/ *vt, vi* ١. لێیەدا بەقەمچی، داى ئەپلۆسێ، پیادە کێشى ٢. دەیبەزێنێ، لێیدە باتەوە
١. يجلد، يشبع ضرباً ٢. يهزم، يغلب
*~ out* ٣. (کێشە) لێیە کۆڵێتەوە بەووردی، تاوتوێی ئەکا ٤. کۆڵە کاتەوە، لەدوورێتەوە
٣. (المشكلة) يدرسها بتعمق، يقلب فيها ٤. يدرس (القمح مثلاً)

**thrashing** *n* لێدان، لێدانی توند، شکست، هولیکردن
جلد، ضرب مبرح، هزيمة
*give sb / get a good ~* ئەیشکێنێ، ئەیبەزێ، ئەکەوێ تێکشکاندنی توند، سەرنەکەوتن
يهزمه / يتهزم هزيمة ساحقة

**thread** /θred/ *n* [C,U] ١. بەن، پەنك، ریس، دەزو، دەزی، پەت ٢. ریازێك کە بەشەکان رێکبخات (بیرورا، لێکۆڵینەوە) راڕەو ٣. ددانی لولێنچ
١. خيط ٢. السلك الذي ينتظم أجزاء (فكرة، مناقشة)، مجرى ٣. سن اللولب
□ *vt* ١. دەزووەکە ئەکا بەدەرزی پەکەوە ٢. لەنێو قەرەباڵغی یەکە رێگای خۆی دەبڕێ
١. يدخل الخيط في ثقب الابرة، يلضم ٢. يشق طريقه خلال الزحام

**threadbare** *adj* ١. کۆن، رزیو، بێبایەخ، بێ سەروبەر ٢. (بیرورا، بەڵگە) کۆن، بێ کەلکە، هیچ و پوچ
١. بال، مُهَلْهَل ٢. (مجاز لافكار، الحجج) باليه، مبتذلة

**threat** /θret/ *n* [C] ١. هەڕەشەو گوڕەشە، زرت، گەڤین، چاوسورکردنەوە ٢. ئاگادار بە مەترسی یە
١. تهديد، وعيد ٢. نذير بالخطر

**threaten** /θretn/ *vt, vi* ١. هەڕەشە ئەکا، بەڵێنی تۆڵەسەندنی لێدەدات، گەف دکت
١. يهدد، يتوعد
*~ sb with sth* هەڕەشە لە کەسێك دەکات بە شتێك
يهدد شخصاً بشيء
*~ to shoot sb* هەڕەشەی تەقەکردنی لێدەکات
٢. نیشانەی مەترسی و کێشە دەدات
يهدد بأطلاق النار عليه ٢. ينذر بالخطر او المتاعب:
*clouds that ~ rain* هەورەکە بارانی پێوەیە ٣. (خراپە) لەروودانداپە
غيوم تنذر بالمطر ٣. (الشر او السوء) يهدد بالوقوع

**threateningly** *adv* بەهەڕەشەوە، ب گەڤی

مهدداً، متوعداً

**three** /θri:/ *adj, n* [C] سێ

ثلاثة، ثلاث، ٣

**ˌthreeˈply** *adj* (بڕوانە *ply*)

(انظر *ply*)

**thresh** /θreʃ/ *vt, vi* ئەدوورێتەوە (گەنم)

يدرس (الحنطة)

**threshold** /ˈθreʃhəʊld/ *n* [C] لێوار، سەرەتا، دەستپێك، قەراغ، شیفتك، شیپانە، دەرازینە، دەرچك، دەرمال

عتبة، بداية، مستهل

*on the ~ of your career as a teacher* لە سەرەتای کارکردنتدا وەك مامۆستا

في مستهل عملك كمدرس

**threw** /θru:/ (بڕوانە *throw*)

(انظر *throw*)

**thrice** /θraɪs/ *adv* سێجار

ثلاثاً، ثلاث مرات

**thrift** /θrɪft/ *n* [U] ئابووری

اقتصاد

**thrifty** *adj* (-ier, -iest) دەستپێوەگر، مقات

مقتصد، مدبر

**thrill** /θrɪl/ *n* [C] (ئەزموون) هەست وروژاندن، هاندان، هەژین، لەرزین

(تجربة) تثير المشاعر، تملأ بالنشوة

□ *vt, vi* ١. هانی ئەدا، ئەیهەژێنێ، هاندەدت، دەهەژێ، دلەرزێ

١. ينتشي، يشعر بالنشوة

*~ with pleasure* ئەیبزوێنێ، خۆشیئەداتێ، شادی ئەکا

٢. دڵشادئەبێ، هەستی ئەوروژێنێ

يهزه الفرح ٢. يملأ بالنشوة، يثير المشاعر

*a play that ~ed the audience* شانۆگەرییەك هەستی بینەرانی بزواند

مسرحية هزت مشاعر المشاهدين

**thriller** *n* [C] چیرۆك، شانۆگەرییان فلمی وروژێنەر

رواية، مسرحية او فلم مثير

**thrive** /θraɪv/ *vi* (*pt* ~d, throve, *pp* ~d, thriven) سەردەکەوێ، دەبوژێتەوە، گەشەئەکا

ينجح، يزدهر، ينمو

*Children ~ on good food* منداڵ گەشە ئەکات بەخواردنی باش

الأطفال ينتعشون بالطعام الجيد

**throat** /θrəʊt/ *n* ١. قورگ، قورتم، هەفك، گەروو، گەردن، گەلی، دەربازگە تاتەنك

١. حنجرة، حلق، زور

**throaty** *adj* (-ier, -iest) ٢. قورگ (دەنگ) گڕ، کرکراگەیی، لە قورگەوە دەرچوو

٢. بلعوم، (الصوت) اجش، حلقي، منطلق من الحلق

**throb** /θrɒb/ *vi* (-bb-) (لێدان، دڵ)، دڵی لێئەدات، دڵەکوتێ ئەکا، هەڵدەقولێ

(النبض، القلب)، ينبض، يخفق

*~bing with excitement* دڵەکوتێیەتی لە پەشۆکاندا

يخفق قلبه من شدة الانفعال

*a wound ~bing with pain* برینە کە پلی ئازارلێ دەدا، ژان ئەکا

جرح ينبض بالألم

□ *n* [C] دڵەکوتێ، لەرلەرە، راتەکان

خفقان،إرتجاف، إهتزاز

**throe** /θrəʊ/ *n* ئازاری سەخت، توندو تیژ

(في صيغة الجمع عادة) آلام حادة

*in the ~s of* دوچاری تەنگانەدەبێ، ئازاری گیانکێشان ئەچێژێ

يعاني من مشقة (كذا)، يكابد آلام (الأحتضار)

**throne** /θrəʊn/ *n* [C] ١. تەخت، تەختی پاشایی، پاشای دەوڵەت

١. عرش، (مجاز) سلطان الملك

*The T~* ٢. تەختی پاشایەتی، دەسەڵات

٢. العرش، الملك

**throng** /θrɒŋ/ *n* [C] گلێر ئەبێ، کۆئەبێتەوە، کۆبونەوەی جەماوەر

حشد، يحتشد، يتجمهر، يحشد

**throttle** /θrɒtl/ *vt* ١. دەخنکێنێ، هەناسە دەبڕێ

٢. بەدەمەوانە توندی ئەکا

١. يخنق، يكتم الانفاس ٢. يتحكم في صمام الخانق

□ *n* دەمەوانە دەرچوونی بەنزین رێك دەخات بۆ بزوێنەرەکە

صمام يتحكم في تدفق البترين الى المحرك الخانق

**through** /θru:/ *prep* ١. لەماوەی، بەناو، بەدرێژایی

١. خلال، من خلال

*The river Thames flows ~ London* رووباری تایمز بەناو لەندەندا ئەروا

(ان) نهر التايمز يخترق مدينة لندن

*The road goes right ~ the forest* ڕێگاکە یەك ڕاست بەناودارستانە کە دەڕوات

ان الطريق يخترق الغابة تماماً

*We must go ~ the accounts* ٢. پێویستە سەیری حسابەکان بکەینەوە ٣. (کات) لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی

٢. (مجاز) يجب ان نفحص الحسابات ٣. (الزمن) من البداية الى النهاية

*He will not live ~ the night* ناژی تاکو کۆتایی ئەم شەو/ پێش ئەوەی ڕۆژبێتەوە ئەمرێ ٤. بەهۆی، لە ئەنجامی

لن يعيش الى نهاية هذه الليلة / سيموت قبل ان يأتي عليه الصباح ٤. بسبب، نتيجة ل

*happended the accident ~ no fault of yours* ڕوداوەکە بەهۆی هەڵەی تۆوە ڕووی نەداوە

لم يقع الحادث بسبب خطأ منك

□ *adv* ١. لەلایەکەوە بۆلایەکی تر، لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی

١. من طرف لآخر، من البداية إلى النهاية، من جانب لآخر

*be ~ with* کۆتایی پێدێنێ (لە کردنی ئیشێك)

ينتهي من (عمل شيء ما)

*I've read the letter ~ twice and cannot understand it* دوجار نامەکەم خوێندەوە لەسەرەتاوە تاکۆتایی لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانم لێبێگەم ٢. تاکو کۆتایی، تاتەواو ئەبی

لقد قرأت الرسالة من أولها إلى آخرها مرتين و مع ذلك فانني لا أستطيع أن أفهمها ٢. حتى النهاية، الى ان يتم:

*see a job ~* لەکار کردن بەردەوام ئەبێ تاکۆتایی

٣. ڕاستەوخۆ، یەکسەر

يواصل العمل حتى النهاية ٣. مباشر، مباشرة

*Does this train go ~ to London?* ئایا ئەم شەمەندەفەرە ڕاستەوخۆ دەڕوات بۆ لەندەن؟

هل يذهب هذا القطار مباشرة الى لندن؟

*a ~ train to London* شەمەندەفەری ڕاستە و خۆ بۆ لەندەن ٤. بەتەلەفون پەیوەندی پێوەئەکا

(ايضاً نعته) قطار مباشر الى لندن ٤. يصل هاتفياً او تلفونياً:

*Can you put me ~ to the manager?* ئایائەتوانی پەیوەندم بکەی بەبەڕێوەبەرەوە؟

ايمكنك / اتسمح ان تصلني بالمدير؟

**throughout** /θru:'aʊt/ *adv* لەهەموو شوێنێ لە (وەك ماڵ)، بەدرێژایی درێژایی (ژیانی)

في كل مكان من (البيت مثلاً)، طوال، طيلة (حياته مثلاً)

**throve** /θrəʊv/ (بڕوانە *thrive*)

(انظر *thrive*)

**throw** /θrəʊ/ *vt, vi* (*pt* threw /θru:/ *pp* thrown)

١. ئەیهاوێژێ، هەڵیئەدا، فڕێی ئەدا، فەدوەشێنێت ٢.لەبەردەکا یان دایدەکەنی، (جلوبەرگەکەی) بەپەلە و بێ گوێدان ٣. بەتوندی دە جوڵێنێ

١. يرمي، يقذف، يلقي ٢. يرتدي او يخلع (ملابسه) بسرعة و اهمال ٣. يحرك بعنف

*~ one's chest out / one's arms about* سنگ دەرئەپەڕێنێ بۆپێشەوە / لێرە و لەوێ باڵ ڕائەوەشێنێ

٤.(ئەسپ) سوارەکەی ئەخاتە خوارەوە، ئەیدا بەزەوی دا

يدفع صدره الى الأمام / يحرك ذراعيه هنا و هناك

٤. (الحصان) يلقي راكبه أرضاً، (المصارع) يطرح خصمه أرضاً

*~ away* ٥. بەهۆی گێلی و نەفامی شتێك بزر ئەکا یان ئەیدۆڕێنێ

٥. يفقد او يخسر شيئاً بحماقته او اهماله

*~ away one's advantages* نازانێ بودجەکەی بەڕێکوپێکی ڕاگرێ

يخفق في إستغلال ميزاته

*~ sth in* ئەیخاتەسەر، بەخۆڕایی ئەیداتێ، سەرباردکت

يضيف او يقدم مجاناً

*~ oneselfinto* لەئیشە کەیدا هەڵپەئەکا، بە چوست و چالاکی

يندفع في (العمل) بحماسة و نشاط

*~ one's money about* پارەکەی بەفیڕۆئەدا، دەستبڵاوی دەکا

يبعثر نقوده، يبذر

*~ off* لێی ڕزگاردەبێ

يتخلص / يتحرر من

*~ open* دەرگاکە ئەخاتە سەرپشت بۆهەمووان

يفتح الباب على مصراعيه للجميع

ئاهەنگ سازنەكا ~ *a party*

يقيم حفلاً

~ *out* پێشنيارێك ئەخاتە روو، بەبێ مەبەست ئاماژەى بۆ ئەكا، بەرپەرچى پێشنيارێك ئەداتەوە

يتقدم (باقتراح مثلاً)، يلمح بدون قصد، يرفض (اقتراحاً)

~ *over* دەستى لێهەڵدەگرێ، دەست بەردارئەبێ (هاورێ، پلان)

يتخلى عن، ينبذ (صديقاً، خطة)

~ *up* دەرشێتەوە (خۆراك)، دەست لە كارێك دەكێشێتەوە (پۆستێك)

يتقيأ (الطعام)، يستقيل من (منصب)

□ *n* [C] هاوێشتن، فڕێدان، هەڵدان

رمي، قذف، رمية، قذفة، مرمى

*within a stone's* ~ هێندەى بەردهاويشتنێ لەم نزيكانە، ئاستى بەردە قانى

على مرمى حجر أي على مقربة من

**thrush** /θrʌʃ/ *n* [C] جۆرى لەباڵندەى دەنگ خۆشە

الدج، السمنة (طائر مفرد)

**thrust** /θrʌst/ *vt, vi* (*pt, pp* ~) بەتوندى پاڵپێوەدەنێ، هەڵدەكوتێتە سەر، دەچەقێنێ، رێگاى خۆى ئەكاتەوە، دچكينت، لێدەدات

يدفع بعنف، يقحم، يغرز، يطعن

□ *n* [C,U] لێدانى توند، هێرشى سەربازى، شاتاوڵ، پێدا كردن، پاڵپێوەنانى كتوپڕ، بەزەبر، هێزى پاڵپێوەنەرى (بزوێنەر)

طعن، طعنة، هجوم عسكري، اندفاع مفاجيء، قوة دفع (محرك نفاث)

**thud** /θʌd/ *vi* (-dd-) لێدەدات يان دەيخات دەنگێكى كپ دەردەكا، دەنگى پيادان، تەپە (وەك بەزەويدا)

يضرب او يسقط محدثاً صوتاً مكتوماً، صوت الارتطام (بالارض مثلاً)

**thug** /θʌg/ *n* [C] خوێنڕێژ، بكوژ، قۆڵبڕ

سفاح، سفاك، بلطجي

**thumb** /θʌm/ *n* [C] پەنجە گەورەى دەست

(أصبع) الأبهام

*under sb's* ~ سەرى بۆ دائەنەوێنێ بەتەواوى ملكەچى ئەبێ

يخضع له خضوعاً تاماً

*rule of* ~ رۆتين ياسايەك وەستابێ لەسەر شارەزايى ئەزموونى زانستى

(روتين او نظام) قائم على الخبرة والتجربة العملية

□ *vt* پەرە هەڵدەداتەوە (وەك پەڕاو)، تەڕ يان پيسى ئەكا بەم شێوەيە

يقلب صفحات (كتاب مثلاً)، يبلي او يوسخ بالتقليب بهذه الطريقة

*a well ~ ed book* پەرتوك، جێگاى هەڵدانەوەى پەرەكانى بە ئاشكرا پێوەدياره بە هۆى زۆر خوێندنەوەيەوە

كتاب تظهر عليه اثار تقليب الصفحات بوضوح (لكثرة تداول القراء له)

**thump** /θʌmp/ *vt, vi* (دڵ) دەكوتێ، (بەمشتى دەست) بەتوندى لێى ئەدا، دەكوتێ

يطرق (بقبضة اليد) (القلب) يخفق بعنف، يدق

□ *n* [C] (دەنگ) پياكێشان، لێدان، بەبەكداكەوتن، تەپەتەپكردن

(صوت) طرق، دق، ارتطام

**thunder** /ˈθʌndə(r)/ *n* [U] ١. هەورە بروسكە، هەورە گرمە، گورژين، گورمين ٢. دەنگ، دەنگى ئاو، خرمين، هارە

١. رعد، قصف الرعد ٢. دوي، هدير

*the ~ of the guns* تۆپ باران، دەنگى تۆپ

قصف المدافع

□ *vt, vi It ~ ed* ١. بريسكە لێئەدات ٢. دەنگ دەر ئەكا، ئەگرمێنێ، دگورت

١. ارعدت الدنيا / السماء ٢. يدوي، يهدر

*sb ~ ing at the door* كەسێك بەتوندى لەدەرگا ئەدا

٣. بانگ ئەكات، هاوارى ئەكا

شخص يقرع الباب بعنف ٣. يصيح متواعداً

**thunderbolt** *n* هەورەتريشقە رووداوێكى وێرانكەر بەهەورەتريشقە

صاعقة (مجاز) حادث مدمر كالصاعقة

**thunderous** *adj* گورمێنى، بەگرمە، بروسكە لێدەر

مدو، راعد

~ *applause* گرمە، چەپڵە لێدانى توند

تصفيق مدو

**thunderstorm** *n* [C] گەردەلولێكى بروسكاوى

عاصفة رعدية

**thunderstruck** *adj* بروسکە لێدراو، شێواو
مصعوق، مذهول

**thundery** *adj* (کەش) بروسکاوی، نیشانەی بروسکەی پێوەیە
(الطقس) منذر بالرعود

**Thursday** /ˈθɜːzdɪ/ *n* پێنجشەممە، پێنجشەمب
الخميس، يوم الخميس

**thus** /ðʌs/ *adv* هەروەها، ئاوا، بەوشێوەیە، وەسا، ئەخو، هوسا، هەروە، هولی
هكذا، على هذا النحو
*~ far* تا ئەو رادەیە، تاقێژی، ئاوا، لەبەر ئەمە
الى هذا الحد

**thwart** /θwɔːt/ *vt* پسوچێنە کاتەوە، ئاهێڵێت، بەرگری دکت، گیرۆدەی ئەکا، پوچی ئەکاتەوە، بێهیوای ئەکا، بەرگری ئەکا
يحبط، يخيب (شخصاً او مساعيه)

**thy** /ðaɪ/ *adj* هی تۆ، تو، هەوە
(ا. ق) خاصتك

**thyme** *n* [U] جاترە، (رووەکێکی چایی) تیژە
سعتر، زعتر (نبات حاد الطعم)

**tiara** /tɪˈɑːrə/ *n* سەرپێچ رازاوە بەخشڵ بۆ ژنان، کڵاوی سێگۆشەیی پاپا
اكليل مرصع بالجواهر لراس المراة، التاج البابوي المثلث

**[1]tick** /tɪk/ *n* ١. چکەچك، چرکەچرك (بەتایبەتی دەنگی کاتژمێر) ٢. خاڵ یان نیشانە (✓) چك‌چك
١. دقة خفيفة (بخاصة صوت الساعة) ٢. علامة (✓) تكه
*on ~* ٣. بەقەرز
٣. (عامية) على الحساب، بالدين
□ *vi, vt* ١. (کاتژمێر) لێدەدا چك‌چك ٢. نیشانەی (✓) راست دائەنێ
١. (الساعة) تك، تدق ٢. يضع علامة (✓)
*~ (off) the items in a list* ئاماژە ئەکا بەنیشانەی (✓) لەسەر لیستەکان
يؤشر بعلامة (✓) على البنود في القائمة
*~ sb off* ٣. هەرەشەی لێئەکا
٣. يوبخه، يعنفه (عامية)

**[2]tick** /tɪk/ *n* گەنە (مێرویەکە کە ئەلکێ بە پێستەوەو خوێنی ئەمژێ)
قرادة (حشرة تلتصق بالجلد و تمتص الدم)

**ticket** /ˈtɪkɪt/ *n* [C] ١. ئامێری تەلەغرافی چاپ ٢. کاتژمێری دەست، دڵ
١. الة تلغراف طابعه ٢. (ل. د) ساعة يد، القلب
*a parking ~* پسولەی سەرپێچی (سزادان) بەجێهێشتنی ئوتومبیل لەشوێنێکی رێ پێنەدراو
مخالفة (غرامة) ترك السيارة في غير المكان المسموح به
*~ collector* پسوڵەبڕ، پسوڵە
محصل التذاكر

**ticker-tape** *n* شریتی تەلەغراف
شريط التغراف

**ticker** /ˈtɪkə(r)/ *n* [C] بلیت، پسولە
تذكرة، بطاقة

**tickle** /ˈtɪkl/ *vt, vi* ١. ختوکەی دەدا، یاری پێدەکا
١. يدغدغ، يداعب
*~ sb in the ribs* ختوکەی نێوان پەراسوو ئەدات بۆ ئەوەی پێبکەنێ
يدغدغ شخصاً بين اضلاعه (ليضحكه)
*Th rough blanket ~ s (me)* بەتانیە زیرەکە پسیامادەچەقێ، پسەتوە زیرەکە ئەمخورێنێ ٢. هەست بەئارەزوی خوراندن ئەکا
ان البطانية الخشنه تخز (ني) ٢. يشعر برغبة في الحك:
*My nose ~ s* هەست بە خوراندن دەکەم لە لوتمدا
٣. ختوکەی ئەدا، یاری لەگەڵ ئەکا
أشعر بحكة في انفي ٣. يدغدغ، يداعب
□ *n* [C] ختوکەدان
دغدغة

**ticklish** ١. (کەسێك) هەقە: زوو کاریگەری ختوکە پێت ٢. (کێشە) ورد، تەنگەتاو، ترە، سرك
١. (الشخص) سريع التأثر بالدغدغة ٢. (المشكلة) دقيقة او حرجة

**tidal** /ˈtaɪdl/ *adj* پەیوەندی بەهەڵکشان وداکشانەوە هەیە
متعلق بالمد و الجزر
*a ~ wave* داکشانە شەپۆل، (لەدوای بومەلەرزە دێ هەندێ جار)
الموجه المدية، موجة عارمة (تعقب الزلزال احياناً)

**tide** /taɪd/ *n* [C,U] داکشان و هەڵکشان (داچوون و هەڵچوون)

الدد و الجزر

ئەوپەڕی داکشان / هەڵکشان *at high / low ~*

عند المد الأقصى / الجزر الادنى

(پاشماوە تێکشکاوەکان) شەپۆلی~ *washed up by the*

داکشان رایماڵی

(الحطام) جرفته امواج المد

بەشی پێداویستی دەکات، یارمەتی ئەدا بۆ □ *vt ~ over*

ڕزگاربونی لە بارێکی قورس

يسد الحاجة، يساعد على التخلص من موقف عصيب

*Will £ 30 ~ you over until you get your wages?*

ئایا سی جنەیە بەشی پێداویستی تۆ ئەکات تا کرێ وەرئەگری؟

هل تكفي ثلاثون جنيها لسد حاجتك الى ان تستلم اجرك؟

**tidings** /ˈtaɪdɪŋz/ *npl* هەواڵ، نوچە

اخبار، انباء

**tidy** /ˈtaɪdɪ/ *adj* ڕێك و پێك، پاقژ، لێكدایی

مرتب، منظم

*a ~ room / habits* ژووری ڕێك و پێك، خورەوشتی ڕێك و پێك

غرفة مرتبة / عادات منظمة

*a ~ person* کەسێکی ڕێکوپێك

شخص مرتب

*a ~ sum* برێك پارەی باش

مبلغ محترم من المال

□ *vt, vi* (بەزۆری *up* ~) ڕێکیئەخا

(غالباً ~ *up*) يرتب، ينظم

**tidily** *adv* بەشێوەی ڕێکوپێك، بەشۆخی، لێکدانەکی

باتقان، بترتيب، بنظام، بأناقة

**tidiness** *n* ڕێکخستن، لێکدان، سیستم، یاسا، شۆخی

إتقان، ترتيب، نظام، اناقة

**tie** /taɪ/ *vt, vi* (*pres part* tying, *pt, pp* tied)

١. بۆینباخ ئەبەستێ، ئەیبەستێ، بەندئەکات، دەبەستێ

١. يربط، يشد، يقيد

*~ sb's feet together* قاچی دەبەستێ

يقيد قدميه

*~ up a parcel* دەستەی ئەکات، دەپێچێتەوە ٢. ئەیکاتە بەستە، گرێ ئەدات ٣. (مەرجەکانی ڕێککەوتننامە)، پابەنددەبێ سەربەستییەکەی سنوربەنددەکا ٤. (بەزۆری ~

*with*)، یەکسان دەبین لەیارمەتیدا ڕێك دکەوێت لەگەڵ یەك

يحزم رزمة ٢. يعقد ٣. (مجاز، شروط اتفاقية) تقيده، تحد من حريته ٤. (غالباً ~ *with*) يعادل او يتعادل في مباراة

*~ in with* ڕێکئەکەوێ لەگەڵ

يتفق مع

*Does this ~ in with what we were told?* ئایا ئەمە ئەگونجێ لەگەڵ ئەوەی بەئێمە ووتراوە؟

هل هذا يتفق مع ما قيل لنا؟

*be ~ d up (with)* سەرقاڵدەبێ بە

يكون مشغولاً ب

□ *n* [C] ١. پەیوەندی

١. (مجاز) روابط، أو اصر

*~ s of friendship* پەیوەندی هاوڕێیەتی

روابط الصداقة

*family ~ s* پەیوەندی خێزانی، پەیوەندی خزمایەتی

٢. بۆینباخ، بەستنەوە

الروابط العائلية، أو اصر القربى ٢. رباط، قيد:

*Small children are often a ~* زۆرجار مناڵە پچوکەکان سەربەستیان لێبەندکراوە ٣. یەکسان بون (لە گۆڵدا)

كثيراً ما يكون الأطفال الصغار قيداً على الحرية ٣. تعادل (في الأهداف)

*The match ended in a tie* یاریەکە کۆتاییهات بەیەکسان بون ٤. بۆینباخ، بەند، گرێ، ملپێچ

انتهت المباراة بالتعادل ٤. ربطة عنق، كرافته

**tier** /tɪə(r)/ *n* [C] چین، ریز، بەندك

طبقة، صف مدرج

**tiff** /tɪf/ *n* [C] لێکەتن، دەمەقاڵێی سوك

مشاجرة خفيفة

**tiger** /ˈtaɪgə(r)/ *n* پڵنگ، بەور

نمر، النمر المخطط

**tigress** /ˈtaɪgrɪs/ *n* پڵنگی مێ

نمرة، انثى النمر

**tight** /taɪt/ *adj* (-er, -est) ١. توند، پتەو، تەنگ، پیانەڕۆ، سفت، ڕژد

١. مشدود، محكم

*a ~ cork* دەمەوانەی توندوتۆڵ ٢. (گرێ) توندبەستراو

